زنجیرەی نەوەی زێڕین



# ئاوێنەی نەوەیەکی نموونەیی

کەریم کێسکین

IRFAN

# ئاوێنەی نەوەیەکی نموونەیی

کەریم کەسکین

ئاوێنەی نەوەیەکی نموونەیی

نووسینی: کەریم کەسکین
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مارت - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢١٦)ی
ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

## ٢- جیهاد، بانگەواز، تەبلیغ

## ٥- ڕاوێژ

## ٦- برایەتی



## ٧- عیشق و شەوق، خۆنوێکردنەوە، دامەزراوی و بڕیارنەگۆڕی

# ١- هەستی بەرپرسیارێتی و خزمەتکردنی ئاین

"یەکجار هەنگاو هەڵگرتن لە پێناو خوا و بە ئامانجی جیهادکردن(کۆشش بۆ خزمەتکردنی ئاینی خوا) لە بەیانییەك، یان ئێوارەیەك، یان هەرکاتێکی دیکەدا، لە دونیاو هەرچی تێیدایە خێردارترە."[١]

## هەستی بەرپرسیارێتی واتای چیە؟

زانایان دەربارەی هەستی بەرپرسیارێتی فەرموویانە کە بە خۆداچوونەوەی مرۆڤە سەبارەت بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی و لێپرسینەوەیەتی لە خۆی کە ئایا ڕەوتی ئیمان و کارو گوفتار و ڕەفتاری بەشێوەیەکی دروست بەڕێوەدەچێت یاخود نا؟ لە ڕاستیدا یەکێك لە گرنگترین جیاکەرەوەکانی مرۆڤ لە گیاندارانی دی ئەم هەستی بەرپرسیارێتییەیە، چونکە مرۆڤ خاوەنی ژیری و ئیرادەیە و بونەوەرێکی باوەڕدار و بەرپرسیارێتی هەڵگرە.

ئیماندار مرۆڤی بەرپرسیارێتییە، ئەو بەرپرسیارە بەرامبەر بە خوا و پێغەمبەر و هەموو موسوڵمانان. ئەم هەستی بەرپرسیارێتیەش هەندێ جار بەشێوەی تێکۆشان

---

١ بخاري، جیهاد،٥

لە پێناوی خوادا و هەندێ جاریش بەشێوەی نیشاندانی ڕەوشتێکی جوان بەرجەستە دەبێت.

هەموو باوەڕدارێکی موسوڵمان دەبێت بەرامبەر ئەو بەڵێنەی کە بە خوای خۆی داوە ڕاستگۆبێت و ژیانی بەگوێرەی هێڵەکانی ئەم بەرپرسیاریەتییە ڕێکبخات. باشە ئێمە چ بەڵێنێکمان دابوو بەخوا؟ گەر بە وردی بیر لە بەڵێنی (ألست بربکم) بکەینەوە، کە بەڵێنمان دا بە پەروەردگار بە گەورە و بەدیهێنەر و پەرستراوی خۆمان قەبووڵی بکەین، وە گەر بیر لەو راستییە بکەینەوە کە ئێمە بۆ بەندایەتی و پەرستش هاتوینەتە سەر زەوی، زۆر باشتر لەم بابەتە تێدەگەین. پەروەردگارمان دەفەرموێت: "بێگومان ئەوانە لە پێش ئەم ڕووداوە پەیمانیان بە خوا دابوو کە لەدوژمن هەڵنایەن، وە پەیمانێ کە درا بە خوا بێگومان خاوەنەکەی لێی لێپرسراودەبێت."[1]

ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دەفەرموون کە یەکێك لە مەبەستەکانی دەربڕینی (هەڵهاتن لە دوژمن) لەم ئایەتە پیرۆزەدا، وازهێنانە لە تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورەدا. ئەوەتا پێغەمبەری ئازیزیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕاکردن لە مەیدانی جەنگ لە کاتی روبەڕووبونەوە لەگەڵ دوژمندا بەیەکێك لە حەوت گوناهە گەورەکە لە قەڵەم دەدات. بە تایبەتی لەم سەردەمەی ئێستادا کارکردن لەپێناو بەرزکردنەوەی ناوی خوا یەکێکە لە گەورەترین بەرپرسیارێتییەکانی موسوڵمانان، ئەم کارکردنە درەوشانەوەیەکی گرنگی ئەو پەیمان و بەڵێنەیە کە لە ئایەتەکەی سەرەوەدا ئاماژەی پێدراوە. نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە پەروەردگار لە تەواوی ئەو موسوڵمانانە دەپرسێتەوە کە توانای ئەنجامدانی ئەم کارەیان هەبووە بەڵام پێی هەڵنەستاون. پەروەردگار ئەمەمان بەم شێوەیە بۆ ڕوون دەکاتەوە: "خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بە قەدەر توانایی خۆی نەبێت، هەر کارێکی

[1] الأحزاب، ١٥

چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەكی كردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی.»[١]

جا ئەو كەسەی هەستی بەرپرسیارێتی لە خۆیدا چاندبێت هەرگیز ئەم ئایەتەی لەیاد ناچێت و بەپێی پێویستی و داواكاریەكانی ئایەتەكە هەڵسوكەوت دەكات. ئەم ئایەتە هەروەك چۆن زەنگێك و بیرخستنەوەیەكی زۆر جددیە بۆ كەسانی خاوەن بەرپرسیارێتی كە دەیانەوێت خزمەتی ئاین بكەن، هەرواش پێوەرێكی گرنگمان بۆ دەخاتەڕوو ئەویش ڕاستی خستنەبەر لێپرسینەوەمانە لەسەر ئەو كارانەی كە توانامان بەسەریاندا دەشكێت. شتێكی ئاشكرایە گەورەترین نیعمەت كە خوای گەورە بە بەندە ئیماندارەكانی بەخشیبێت نیعمەتی ئیمانە، هەروەها ئاشكرایە كە شوكری هەموو نیعمەتێك دەبێت لە جۆری خۆی بێت. جا شوكری نیعمەتی ئیمانیش بەوە دەبێت كە ئەم نیعمەتە بگەیەنرێتە هەموو ئەو سینانەی كە تینووی ئەم نیعمەتە گەورەیەن و ئاتاجیان پێیەتی. گەورەترین بەرپرسیارێتی ئیمانداریش بریتیە لە خاوەندارێتی ئەم هزر و هەستە و ژیان لە پێناویدا.

سەردەمانێك كاری بەكردەكردنی ئەم فەرمانبەرییە گەورەیە لە لایەن هاوەڵە بەڕێزەكانەوە بەجێدەهێنرا، لەم ڕۆژگارەشدا وەكو چاكەیەكی ئیلاهی خراوەتە ئەستۆی ئیماندارانی ئەمڕۆكەوە، بێگومان ڕۆڵبینینی ئەركی هاوەڵان كارێكی قورس و گرانە بەڵام بە هێندەی گرانییەكەشی فەرمانبەرییەكی بەرز و بڵند و پاداشتدارە.

ئیمانداری خاوەن هەستی بەرپرسیارێتی كەسێكە بە ئاگایە لەو فەرمانبەرییەی كە پێی سپێردراوە، بەتەواوەتی شانی داوەتە بەر باری بەندایەتی، بۆ بە جێگەیاندنی ئەم ئەركە پیرۆزە كەسێكە ئامادەی هەموو فیداكارییەكە، هەمیشە بەهەستی

---

١ بقرة، ٢٨٦

بەندایەتیەوە دەژی و لەو پێناوەدا خەریکە دەبێتە دوو پارچە. ئەوەتا سەرداری پێغەمبەرانیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان."[1] سەروەرمان لە ژێر ئەم ئەرکی بەندایەتیەدا هەموو سەختی و ئازارێکی قەبووڵکردووە، ئەی ئێمە؟ ئایا ئێمە لە چ حاڵەتێکداین؟ تا چ ڕادەیەك پەی بەو بەرپرسیارێتیە دەبەین کە لەسەر شانمانە؟

نابێت لەیادمان بچێت ئێمە لە ژێر بەرپرسیارێتییەکداین کە خۆی دەبینێتەوە لە دروستکردنی گیانێکی نوێی بە ئیمان چنراو و بە خۆشەویستی مرۆڤ و ئازادیی گۆش کراو، بێگومان بەجێهاتنی بەرپرسیارێتیەکی لەمشێوەیەش تەنها و تەنها بە بوونی پاڵەوانانێك دەبێتە ڕاستی، کە سنگ دەکەنە قەڵغان لە بەرامبەر ئەو مەترسییانەی ڕوو لە وڵات دەکەن و خۆیان بە تاکێك لە کۆمەڵگە دەزانن و مێژوو و ئاین و خورەوشت و تەواوی پیرۆزییەکانی نەتەوەکەیان لە خۆ دەگرن و لەخۆدا ڕەنگی پێدەدەنەوە، پاڵەوانانێك کە تەژین لە ئەوینی زانست و بۆنی نەسیمی بنیاتنان و ئاوەدانی و تینی ئایینداری مەردانی ڕێ شێوە و نەتەوەپەروەرن و بەوپەڕی هەستی بەرپرسیاریەتییەوە هەردەم ئامادەی فەرمانن و لەسەر کارن.

"ڕێبازمان ڕێبازی حەق و ڕاستییە، دروشممان دەست پێوەگرتن و بەرزکردنەوەی حەقە"، ئامانجیشمان بەشوێن ڕەزامەندی خواوە بوونە لە هەر چاوتروکاندنێکی ژیانماندا، لەڕاستیشدا بوونمان بەمشێوەیە سەدەقەی مرۆڤ بوونمان و حیکمەتی بوونی ئیرادەیە کە پێمان دراوە. ئێمە خۆمان بە ئاتاجی ئەوە دەبینین کە عەوداڵی دۆزینەوەی ئامانجی ژیانمان بین، عەوداڵی عیشق بین بۆ ڕۆحمان، عەوداڵی هەستکردن بە گیانی بەرپرسیارێتی بین لە ویژدانماندا، خۆمان بە بەرپرس دەبینین لەوەی ڕێگاکانی زانست و هونەر و ئەخلاق و حیکمەت نیشانی ئەو گیانانە بدەین کە چاویان بە

١ بخاري، كسوف، ٢

ڕووی سەرچاوەی سیستەمێکی لە عیشق و ئیمانەوە هەڵقوڵاو و هێز گرتوو کردووەتەوە، بەڵێ ئێمە بەمجۆرە لە خۆمان دەڕوانین و وەك کۆیلەیەکی ئازادی نەویستووی ئەم ڕێبازە خۆمان دادەنێین."[1]

بۆیە پێویستە بێ خەمی و حەوانەوەمان بخەینە کەنار و لەو بیرە شەیتان پەرستانەیەی کە دەوترێت"بە من چی، چیم بەسەریەوە داوە"خۆمان دابڕنین و داخوازی بەرپرسیارێتییەکەمان بهێنینە جێ.

## هەستی بەرپرسیارێتی لای پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی

پێغەمبەری خوا (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) هێندە هەستی بەقورسی بەرپرسیارێتیەکەی سەرشانی دەکرد کە ئەو کاتەی سورەتی (هود) دابەزی، مووە سپیەکانی ڕیشی موبارەکی لە ماوەیەکی کەمدا ڕوویان لە زیادبوون کرد. کە لێیان پرسی: ئەوە چییە پێغەمبەری خوا ڕیشی موبارەکتان لەم چەند ڕۆژەی دواییدا زۆر سپی بووە؟

فەرمووی: سورەتی"هود"پیری کردم. کە پرسیاریان کرد: کام ئایەت؟ لەوەڵامدا فەرمووی: "فاستقم کما امرت" واتە: نە زیاد و نە کەم، چۆن فەرمانت پێکراوە بەو شێوەیە فەرمانبەرداریەکەت بەجێبهێنە.[2]

مەزنترین مرۆڤی بەرپرسیارێتی کە پێغەمبەری خوایە (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) لە تەواوی ئاستەکانی تەبلیغەکەیدا بەردەوام سەرنجی دوێنراوەکانی بۆلای هەستی بەرپرسیارییەتی ڕاکێشاوە. چونکە ئەو کەسەی هەڵگری هەستی بەرپرسیارێتییە هەردەم ئاگایانە و هەستیارانە هەڵسوکەوت دەکات.

---

١ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، لە کاتی بنیاتنانی کۆتەڵەی ڕۆحماندا
٢ هود، ١١٢

جا ئەو بەرپرسیارێتیانەی کە سەروەرمان ئاماژەی پێدەدات هەندێ جار ڕووی لە هەموو موسوڵمانانە، هەندێ جاریش ڕووی لە کۆمەڵێکی دیاریکراوە، هەندێجاریش پەیوەستە بە تاکە کەسێکەوە. ئێستاش دەمانەوێت هەندێ نموونە بهێنینەوە لەسەر ئەم بابەتە؛ پێغەمبەری خوا(صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆ هەمووتاکێکی کۆمەڵەکەی بەرپرسیارێتیەکی داناوە کە لە هەر ئاستێکدابن. وە لەم بوارەدا هیچ کەسێکی بەبەخشراو دانەناوە. ئەوەتا دەفەرموێت: "هەمووتان شوانن و هەمووتان بەرپرسیارن لەوانەی لەژێردەستاندان سەرۆکی وڵاتێك شوانەو بەرپرسیارە لەوانەی کە لە ژێردەستیدایە، هەموو تاکێك شوانی خێزانەکەیەتی و بەرپرسیارە لێیان، ژن شوانی ماڵی مێردەکەیی و منداڵەکانیەتی و بەرپرسیارە لێیان. خزمەتکارێك شوانی ماڵی گەورەکەیەتی و بەرپرسیارە لە هەر شتێك کە لە ژێر دەستیدایە، هەریەکە لە ئێوە شوانن و بەرپرسیارن لەوانەی ژێر دەستتانن."[١]

لە بواری بانگەواز و تەبلیغیشدا هەموو تاکێکی موسوڵمان بەرپرسیارە، پێغەمەبەری خوا ئەمەمان لەفەرموودەیەکدا بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت" کێ خراپەیەکی بینی با بە دەستی چاکی بکات. ئەگەر نەیتوانی با بە زمانی چاکی بکات. ئەگەر بەمەش نەیتوانی با لە دڵەوە پێی ناخۆش بێت، کە ئەمەش لاوازترین جۆری ئیمانە.[٢]

پێغەمبەری خوا(صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گرنگییەکی زۆری داوە بە زانست و فێربوون، بەڵام لەم بوارەشدا پێش هەنگاوی کردەیی بۆ بەرەو پێشبردنی ئەم دوو لایەنە جەختی لەسەر ئەم دیوی بەرپرسیارییەتییە کردووەتەوە، ئاگادارکردنەوەکانی لەم بوارەدا لەسەر زەمینی کرداریش بەردەوامیان هەبووە. بۆیە دەتوانین بڵێین دیوی بەرپرسیارییەتی هەڵگرتن لە بابەتەکاندا شتێك نییە لە جێیەك دەست پێکات و

١ بخاري، الجمعة، ١١؛ المسلم، الإمارة، ٢٠
٢ المسلم، الإيمان، ٧٨

لە جێیەکدا بە کۆتا بگات. لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە لە بارێکی جێگیردا نەماوەتەوەو هەمیشە لە گۆڕان و نوێبوونەو بەرەپێشچووندا بووە، تاکەکانی کۆمەڵگەش بەردەوام زیادیان دەکرد و و هەرگیز بەجێگیری نەدەمانەوە، بۆیە دەبوو زانیاریە پێویستەکان پەیتا پەیتا دووبارە بکرێنەوە.

پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی بە چەمکی بەرپرسیارێتی کردووە. وەك زانراوە هەر بزووتنەوەیەك کاتێك ئامانجدار و سوودبەخش دەبێت کە بە هەستی بەرپرسیاریەتی جڵەو بکرێت، بە پێچەوانەوە ئەو بزاوتانەی بەم هەستە تاو نادرێن لە سەرئەنجامدا تەنها پشێوی و گێرەشێوێنی بەرهەم دێنن. پێغەمبەری سەروەریشمان کەسەکانی چواردەوری بەم هەستە گۆشکردبوو وە کردبوونیە کانگای سوود بۆ کۆمەڵگە. بۆیە گەر ورد بڕوانین لە سەراپای ژیان و جموجوڵەکانی هاوەڵان مۆرکی ئەو هەستی بەرپرسیاریەتیە دەبینین کە پێغەمبەری ئازیز هەویری کەسێتی ئەو قارەمانانەی پێوەشێلاوە.

پێغەمبەرمان لە سەروبەندی رەوانکردنی وانەی حەق و حەقیقەت بە هاوەڵانی، وەك قۆناغێکی پرۆسەی فێرکارییەکەی هەڵدەستا بە سپاردنی بەرپرسیاریەتی پێیان،یەکێك لەو هاوەڵە بەرێزانەش کە هەر زوو بەرپرسیارێتی پێدرا موسعەبی کوڕی عومەیر بوو (ڕەزای خوای لەسەر بێت)، ئەو کوڕێکی گەنجی سیما ناوازەی شیکپۆش و نازدار و تێگەیشتووی نێو یەکێك لە خانەوادە دەوڵەمەندەکانی مەککە بوو، پاش ئەوەی موسوڵمان بوو لە پێناوی ئاینەکەیدا دەستی لە هەموو شتێکی ماڵی باوکی هەڵگرت.

لە دوای پەیمانی عەقبەی یەکەم، پێغەمبەری سەروەرمان حەزرەتی موسعەبی لەگەڵ موسوڵمانەکانی مەدینەدا نارد بۆ ئەوەی بنەماکانی ئیمان و قورئان فێری

ئەو کۆمەڵەیە بکات کە لە مەدینەوە هاتبوون، لە مەدینە لە ماڵی ئەسعەدی کوری زورارەدا دەمایەوە.

حەزرەتی موسعەب مرۆڤی خاوەن بەرپرسیارێتی بوو، هەمووتواناکانی خستبووە گەڕ بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە مەدینە، بە ڕاوێژی ئەسعەدی کوری زورارە لەگەڵ گەورە پیاوانی مەدینەدا چاوپێکەوتنی دەکرد و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن. هەرچەندە ژمارەیەکی باش لە خەڵکی مەدینە موسوڵمان بووبوون. بەڵام بۆ ئەوەی دەروازەیەکی فراوان بەڕووی ئیسلامدا بکرێتەوە پێویستی دەکرد کۆمەڵێکی زۆر لە گەورە پیاوانی مەدینە موسوڵمان ببن.

سەعدی کوری موعاز سەرۆك هۆزی ئەوس کە هێشتا موسوڵمان نەبووبوو، لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بێزار بوو. بۆیە لە پێناو ڕێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەم ئاینە سەرکردەی یەکێك لە هۆزەکانی نارد بۆ لای حەزرەتی موسعەب کە ناوی ئوسەیدی کوری خوزەیر بوو. وە بە ئوسەیدی وت: ”ئەگەر ئەسعەدی کوری زورارە پورزام نەبوایە خۆم دەمزانی چیم پێدەکرد، بۆیە تۆ برۆ و ڕوبەڕوویان ببەرەوە.“

ئوسەید بە توڕەییەوە بەرەو ئەو شوێنە هات کە موسعەب و ئەسعەدی لێبوو. کاتێك ئەسعەد هاتنی ئوسەیدی بینی بە موسعەبی وت کە ئەوە سەرۆك هۆزەکەیانە. ئوسەید بەتوڕەییەوە وتی: ”ئێوە بۆچی هاتونەتە لای ئێمە دەستتان کردوە بە خەڵەتاندنی کۆمەڵە خەڵکێکی هەژارو دواکەوتوو، ئەگەر ناتانەوێت ژیانتان بکەوێتە مەترسیەوە هەر ئێستا ئێرە بەجێبهێڵن.“

حەزرەتی موسعەب بەوپەڕی نەرم و نیانی و بەشێوازێکی جوان وتی: ”وەرە دانیشە گوێ لە وتەکانمان بگرە، لە مەبەستمان بگە، ئەگەر بە دڵت نەبوو ئەو کاتە ڕێگەمان لێبگرە.“

ئوسەید گۆچانەکەی دا بە زەویدا و وتی: ”باشە قەبووڵمە.“ ئەوە بوو لەلایان

دانیشت، موسعەب هەندێ باسی ئیسلامی بۆ کرد و چەند ئایەتێکی لە قورئانی کەریم بۆ خوێندەوە.

ئوسەید خۆی پێڕانەگیراو وتی: "ئاه، ئەمە چەند وتەیەکی جوانە! چەندە وتەیەکی باشە! دەبێ چی بکەیت بۆ ئەوەی بێیتە ناو ئەم ئاینەوە؟"

موسعەب و ئەسعەد وتیان: "دەبێت خۆت بشۆیت و جلەکانت پاك بکەیتەوە و شایەتمان بهێنیت و نوێژ بکەیت!" ئوسەیدیش ئەوانەی وترا هەمووی ئەنجامدا و موسوڵمان بوو. دواتر وتی با من بچم کەسێکتان بۆ بهێنم ئەگەر ئەویش ئیمان بهێنێت ئیدی کەس لەم شارەدا نامێنێت باوەڕ نەهێنێت. پاشان گەڕایەوە بۆ لای سەعدی کوری موعاز و هۆزەکەی و پێی فەرموون: "سەعد چیتکرد؟"

ئوسەید: ئەوەی پێویست بوو بەو پیاوانەی بڵێم وتم، سوێند بەخوا من هیچ کێشە و ناڕێکییەکم لەو پیاوانەدا نەبینی.

سەعد: سوێند بەخوا تۆ زانیارییەکت بۆ نەهێنام کە دڵنیام بکاتەوە"ئەمەی وت و پاشان خۆی هەستاو چووە لای موسعەب و ئەسعەد، بە توڕەیی و هەڕەشە لێکردنەوە وتی: "ئەسعەد ئەگەر لە نێوان من و تۆدا پەیوەندی خزمایەتی نەبوایە هیچ ئارامم نەدەگرت لە بەرامبەر ئەم کارە پیس و ناشرینانەوە کە خستوتەتە نێو هۆزەکەمەوە.

موسعەبیش بە هەمان زوبانی شیرین دووبارە بە ئەمیشی وت: "وەرە دانیشە گوێ لە وتەکانمان بگرە! لە مەبەستمان بگە، ئەگەر بە دڵت بوو پەسەندی دەکەیت و ئەگەر نا ئێمە واز دەهێنین لە بانگکردنتان بۆ هاتنە نێو ئەم شتەی کە بە ناشرینی دەزانن." لەسەر ئەمە سەعد دانیشت و گوێی گرت لە قسەکانی و دواتر موسعەب باسی ئیسلامی بۆ کرد و چەند ئایەتێکی قورئانی کەریمی بۆ خوێندەوە. کە قورئان خوێنرایەوە دەموچاوی سەعد یەکسەر گۆڕا. لە دەم و چاویدا

نیشانەکانی ئیمان دیارییاندا. پاشان پرسی: ''ئێوە بۆ چوونە نێو ئەم ئاینە چیتان بەجێهێناوە؟'' حەزرەتی موسعەبیش باسی بنەما و پایەکانی ئاینی ئیسلامی بۆ کرد و ئەویش شایەتمانی هێنا و موسوڵمان بوو. هەوڵی دڵسۆزانە و زمانی نەرم و شێوازی جوانی حەزرەتی موسعەب (ڕەزای خوای لەسەر بێت) بووە هۆکاری ئەوەی هیچ ماڵێك لە مەدینەدا نەمایەوە کە ئیسلامی پێنەگەیشتبێت. بێگومان لەم بەسەرهاتەدا چەندەها وانە هەیە بۆ موسعەبەکانی ئەمڕۆ کە سوودی لێوەربگرن.

## ڕۆحی بەرپرسیارێتی دەبێت هەمیشە بەزیندوویی بمێنێتەوە

زۆرجار دەبیستین کە دەوترێت ''بە من چی؟ من چیمداوە لەم ئەرکە قورسە؟'' بەمەش یەکسەر گفتوگۆکەی نێوان سوڵتان سولەیمانی قانوونی و یەحیا ئەفەندیمان بە بیردێتەوە.

یەحیا ئەفەندی کە یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئیسلام لەگەڵ سوڵتان سولەیمانی قانونی یەکەمدا برای شیرین، ئەم یەحیا ئەفەندییە پیاوێکی نزاگیرای ئەهلی کەرامات دەبێت.

ڕۆژێك قانوونی زۆر حەز دەکات بزانێت کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی چۆن دەبێت، بۆیە نامەیەك دەنێرێت بۆ یەحیا ئەفەندی. لە نامەکەیدا دەنووسێت:

کاکە تۆ کەسێکیت کە هەندێ جار نهێنیە ئیلاهییەکانت لەلا ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر کەرەم بفەرمووی ئاگادارمان بکەیتەوە لەوەی کە ئێمەی ڕۆڵەی عوسمانی کۆتاییمان چۆن دەبێت؟ کاتێك یەحیا ئەفەندی پرسیارەکە دەخوێنێتەوە، لە کاغەزێکدا بۆی دەنوسێت: (براکەم بە من چی) و پاشان دەینێرێتەوە بۆ پاشا.

کاتێك قانونی وەڵامەکە دەخوێنێتەوە پێی سەیردەبێت و یەکسەر بەرێدەکەوێت بەرەو خانەقاکەی "یەحیا ئەفەندی" و لە نێو دڵشکاوی و باری تاڵی بێوەڵامیدا

دەپرسێت: "کاکە ئەمە چ کارێکە؟ وەڵامی پرسیارەکەمانت نەداوەتەوە، مەگەر هەڵەیەکمان کردووە؟!!"

یەحیا ئەفەندی: ئێمە وەڵاممان داوەتەوە، بەڵام لە تێنەگەیشتنی ئێوە سەرمان دەسوڕمێت!!

سوڵتان: "چۆن وەڵامتان داوەتەوە؟"

یەحیا ئەفەندی: "براکەم! ئەگەر لە وڵاتێکدا ناحەقی و ستەم بڵاوبوویەوە و ئەوانەش کە دەیبینن و دەیبیستن بڵێن: بە من چی! و نەبوونە ڕێگر لە بەردەمیدا، ئەگەر شوان وەك گورگ کەوتە وێزەی مەڕەکانی و ئەوەش کە بەم ڕاستیەی زانی لێی بێدەنگبوو وە ڕاستیەکەی نەوت، گەر فریاد و هاواری هەژارەکان و نامۆکان و خاوەن پێداویستیەکان بگاتە ئاسمان و لە زەویشدا بێجگە لە بەردەکان کەس نەیبیستێ، ئەو کاتە چاوەڕێی لە ناوچوونی ئەم گەلە بکە."

هەرکاتێك گەنجینەکان بەتاڵ بوونەوە و سەربازەکان گوێڕایەڵیان نەکرد، ئەو کاتە کاتی لە ناوچوونە. هەستی بەرپرسیارێتی لای ئەوانەی کە پەی بە حەقیقەتی مرۆڤ بوون دەبەن زۆر بەرزە بۆیە ناتوانن بڵێن بە"من چی، چیم داوە لەم ئەرکە. "ئەوان کە برینێکی خوێن لێ ڕۆیشتوو دەبینن ئاگر لە جگەریان بەردەبێت و خەو لە چاویان دەتۆرێت، چونکە شەرم لە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی دەکەن و ناتوانن ئەم ئەمانەتە پیرۆزە بێ کەس جێبهێڵن.

## ئەوەی کە تۆ دەستت لێکێشاوەتەوە، ئێمەش دەستمان لێکێشاوەتەوە

شاعیری مەزن (موحەممەد ئاکیف ئێرسۆی) هەرچەند دەچێتە مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد، لەوێ پیاوێك دەبینێت کە چاوانی وەکو کانی ئەشك دەڕژن، ئاکیف زۆر عەودالی بەسەرهاتی ئەم پیاوە پیرە دەبێت و پاشانیش زۆر کاریگەر دەبێت بە چیرۆکەکەی هەر بۆیە ئەو گفتوگۆیەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە:

نوێژی بەیانیانم لە مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد دەکرد. بەیانیان چەندە زوو بڕۆشتمایە هەمیشە پێش من پیاوێکی سەرو ڕیش سپیم لە میحرابەکەدا دەبینی بەشێوەیەك دەگریا کە من بۆ تەنها خولەکێکیش نەمدەدی بسرەوێت، زۆر مەراقمبوو هۆی گریانەکەی بزانم. لە کۆتاییدا ڕۆژێکیان لێی نزیکبوومەوە و لێمپرسی: بەڕێز، باشە تۆ بۆ ئەوەندە دەگریت ئایا دروستە مرۆڤێك ئەوەندە لە ڕەحمەتی پەروەردگار بێ هیوا بێت؟ بە چاوی پڕ ئەسرینەوە سەیری کردم و وتی: "مەمهێنە قسە! وەختە دڵم بوەستێت،" پاش ئەوەی کە وازم نەهێنا و زۆرملێکرد بۆ ئەوەی بۆم باس بکات، دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی:

بەڕێزم، من لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا سەرکردەی سوپایەکی هەزارسەربازی بووم، بەڵام لە دوای مردنی دایك و باوکم ویستم دەست لە کاربکێشمەوە چونکە ماڵ و موڵکێکی زۆرمان هەبوو، بە مەبەستی ئەوەی کە ئاگام لێیان بێت و بەملاو بەولادا بە هەدەرنەڕۆن.

ئەوەبوو نوسراوی دەست لەکارکێشانەوەم نووسی و بەرزم کردەوە، تێیدا نووسیبووم "دایك و باوکم کۆچی دواییان کردووە و بە هۆی ئەوەی لە فلانە شوێن موڵکمان هەیە و لە فیسارە شوێندا زەوی کشتوکاڵیمان هەیە. . .هتد وە لەبەر ئەوەی پێویست دەکات کە

کەسێك هەبێت ئەو کاروبارانە بەڕێوە ببات، ئەگەر قەبووڵ بفەرموون دەمەوێت دەست لە کابکێشمەوە."

پاش ماوەیەك ڕاستەوخۆ لە سوڵتانەوە نامەیەکم پێگەیشت، زۆر بە خرۆشانەوە نامەکەم کردەوە لە نامەکەدا باس لەوەکرابوو کەدەست لە کارکێشانەوەکەمیان پەسەند نەکردووە. بۆیە منیش نوسراوی دەست لەکارکێشانەوەکەم تازە کردەوە و جارێکی دیکە بەرزمکردەوە، بەڵام دیسان هەمان وەڵامم بۆ هاتەوە.

ئەمجارەیان بیرم لەوە کردەوە کە بچمە لای سوڵتان و ڕاستەوخۆ لەگەڵ خۆیدا بابەتەکە بکەمەوە و بە دەمیی دەست لەکارکێشانەوەکەمی عەرزبکەم. لەڕاستیدا سوڵتان عبدالحمید پادشایەکی توند و بە زەبر بوو، بەهۆی فەرمانبەریەکەمەوە ماوەیەك لەگەڵ یەکێك لە یاوەرەکانیدا مابوومەوە، ئەو کە باسی هەڵسوکەوتەکانی عەبدولحەمید خانی بۆ دەکرین، دەیووت: "هەرکاتێك بە هەر شوێنێکدا تێبپەڕێت، ئەوانەی لای ڕاست و چەپی لە ترسدا هەناسەشیان پێ نادرێت. "قوربان عەبدولحەمید خان بەرەحمەت بێت بە ڕاستی یەکێك بوو لە ئەولیاکانی خوا. بەڵێ بە نیازی عەرزی حاڵم چوومە لای ئەو پادشا بە زەبرەو عەرزم کرد: "سوڵتانم من داوای پەسەند کردنی "دەست لەکارکێشانەوەکەمتان" لێدەکەم، حاڵم ئاوها و ئاوهایە. بەمشێوەیە بارودۆخەکەمم بۆ ڕوون کردەوە، ئەویش لە پاش بیرکردنەوەیەکی قووڵ تەماشای کردم، لە دەم و چاویدا ئەوەم دەخوێندەوە کە نایەوێت واز بهێنم. بۆیە زیاتر سووربوونم نیشاندا لەسەر وازهێنانەکەم."

کاتێك عەبدولحەمید خان منی بەو شێوەیە بینی، ڕووی لە من وەرگێڕا و بە کاردانەوەیەکی تووڕە ئامێزەوە، وەك بڵێی بە پشتی دەستی لە خۆیم دووربخاتەوە وتی: " دەی برۆ ئەوە دەستلەکارکێشانەوەکەتمان قەبووڵکرد."

بەڵێ، بەم پەسەندکردنە زۆر خۆشحاڵ بووم، بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدەم

یەکسەر بەرەو شارەکەی خۆم کەوتمە ڕێ و دەستم کرد بەکارەکانم. پاش ماوەیەك لە خەونمدا بینیم لە جیهانی مانادا هەموو سوپاکان کۆکراونەتەوە و دەپشکنرێن بە نیازی خۆ ئامادەکردنن بۆ جەنگی جیهانی، لە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە هەموو سوپاکان هێنرابوون و لە لایەن خودی پێغەمبەری خواوە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پشکنینیان بۆ ئەنجام دەدرا.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەبەردەم کۆشکی "یلدز"دا ڕاوەستابوو، هەموو سوپاکان یەکە یەکە دەهاتنە حزووری و بە جدیەتێکی زۆرەوە پشکنینیان بۆ دەکرا. لەو کاتەدا کەسانی زۆر گەورەی دەوڵەتیش لەوێ بوون، سوڵتانیش بەوپەڕی ڕێزەوە لەپشت پێغەمبەری خواوە وەستابوو. هەموو یەکەکانی سوپا بانگ کران تا سەرە هاتە سەر ئەو سوپایەی کە پێش دەست لە کارکێشانەوەم لێی بەرپرس بووم. بەڵام لەبەرئەوەی سوپاکە سەرکردەیەکی نەبوو، سەربازەکانی زۆر شپرزە و شڵەژاوبوون. کاتێك پێغەمبەری خوا ئەو سوپا شپرزەیەی بینی ڕووی کردە سوڵتان عەبدولحەمید خان و فەرمووی: "ئەی عەبدولحەمید، سەرکردەی ئەم سوپایە لە کوێیە؟"

لەو کاتەدا سوڵتان عەبدولحەمید بە شەرمەزاریەوە سەری داخست و وتی: "یا رسول الله سەرکردەی ئەم سوپایە دەستی لە کارکێشاوەتەوە. لەبەرئەوەی زۆر سووربوو لەسەر داواکاریەکەی ناچاربووین دەست لەکارکێشانەوەکەی قەبووڵ بکەین." لەسەر ئەمە پێغەمبەری خواش فەرمووی: "ئەوەی کە تۆ دەستت لێکێشاوەتەوە، ئێمەش دەستمان لێکێشاوەتەوە. ئێستا تۆ پێم بڵێ بزانم ئەگەر من نەگریم ئەی کێ بگری؟!!"

بەڵێ لەپشت هەر هەنگاوێکەوە کە لە پێناوی ئیسلامدا بنرێت پێغەمبەری خوا هەیە. ئەگەر ئیماندارێك دەیەوێت پێغەمبەری خوا لە پشتی خۆیەوە ببینێت، ئەوا پێویستە ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە بەوپەڕی لێبرانەوە و بەتەواوەتی بەجێ بهێنێت.

## ئەگەر ئیماندارێك بیەوێت خزمەتی ئاین و نیشتمانەکەی بکات، دەبێت چی بکات؟

ئەو ئیماندارەی کە خاوەنی هەستی بەرپرسیارێتییە و دڵی هەمیشە بە خزمەتکردنی ئاین و میللەت و نیشتمانەکەیەوە لێدەدات، دەبێت خاوەنی چ حاڵەتێکی رۆحی بێت؟ ئێستاش با هەوڵ بدەین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە.

سەرەتا پێویست دەکات کە شارەزا بین بە ئاینەکەمان و بۆ ئەمەش دەبێت لە سەرچاوە دروستەکانەوە بنەما سەرەکییەکانی ئاینەکەمان فێرببین، بێگومان تەنها زانیاری وەرگرتن بەس نیە بەڵکو دەبێت ئەو زانیاریانە بخرێنە بواری جێبەجێکردنەوە و لەژیانماندا ڕەنگ بدەنەوە، ژیان لە چوارچێوەی ئەو بنەمایانەدا دابڕێژرێت کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەری دەڕۆن، واتە گرنگتر لە فێربوونی ئاین ژیانکردنە بە ئاین.

بابەتێکی دی کە زۆر گرنگە بریتییە لە ئارامگری و خۆڕاگری. هەروەك چۆن لە هەموو بوارەکانی دیکەدا سەروەرمان دەکەینە پێشەنگ بۆ خۆمان بێگومان لە بابەتی گەیاندنی حەق و حەقیقەتیشدا هەر ئەو دەکەینە پێشەنگ. کاتێك تاوێك لە ژیانی نوورانی پێغەمبەری خوا ورد دەبینەوە دەبینین کە زۆر خۆڕاگربووە لە پێناو گەیاندنی حەقیقەتی پەیامەکەیدا.

وەکو دەزانین گەورەترین بەڵاو موسیبەتەکان توشی خۆشەویستترین بەندەکانی خوا کە پێغەمبەرانن بووەتەوە. سەرەڕای ئەمەش، گەورەترین خۆڕاگری و ئارامگریش دیسان ئەوان پیشانیان داوە. بێگومان لە کاتی خزمەتکردن بە میللەت و نیشتیمانیش، چەندەها ڕێگر و کۆسپ دێتە ڕێمان. ئێمەش پێویستە گوێ قوڵاغی ئەم وشانە بین و خاوەن حیلم بین لە هەموو هەنگاوێکی ئەو ناڕەحەتیانەماندا و ئارامگری پێغەمبەری ئازیزمان بە نموونە وەربگرین و بەخۆڕاگرییەوە ئەو

نارەحەتییانە بەڕێبکەین.

ڕێگەکانی بەرپێی پێغەمبەری ئازیزمانیان دڕکڕێژ دەکرد ولە کاتی نوێژدا ڕیخۆڵەی ئاژەڵیان دەکرد بەسەریدا و هەموو جۆرە سووکایەتییەکیان بەرامبەر ئەنجام دەدا، سەرەڕای هەموو ئەمانەش بە عەزم و خۆڕاگرییەکی سەرسوڕهێنەرەوە تەنها لە پێناوی ئەوەی نوری ئیمان بگاتە ئەو سینانەی کە تینوون بۆی،کۆڵان بە کۆڵان و چادر بە چادری مەککە دەگەڕا.

یەکێکی دیکە لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی بانگەوازی ئیسلامی و لایەنێکی دیکە لە گۆشەی تەبلیغ کردنی ئیسلام لەژیانی ئازیزماندا نەرم ونیانی و ڕێزدانانە بۆ پێگەی بەرامبەر و لێبووردەییە. قورئانی کەریم لە باسی نەرم ونیانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "ئەو کاتە تۆ بە هۆی ڕەحمەتێك لەلایەن پەروەردگارەوە بە نەرمونیانی مامەڵەت لەگەڵ کردن. خۆ ئەگەر تۆ دڵڕەق و توڕە و بێبەزەیی بوویتایە لە گەڵیاندا، ئەوا ئەوان لێت دووردەکەوتنەوە، کەواتە چاوپۆشییان لێبکە و لێیان ببوورە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، پرس و ڕایان پێ بکە (لەو کاروبارانەدا کە پەیوەندییان بە گشتییەوە هەیە)، کە بڕیارتدا کارەکە بکەیت پشت بە خوای گەورە ببەستە چونکە خوای گەورە ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن."[1]

"لای پێغەمبەری خوا حیلم وەك کلیلێکی نورانی بووە بۆ کردنەوەی دڵە ژەنگ گرتووە داخراوەکان، ئەو بە هۆی ئەم کلیلەوە دڵی زۆر کەسی کردۆتەوە. سینەت بە شێوەی دەریا بۆ گشت کەسێك واڵا بکە، بە ئیمانەوە نزیك ببەرەوە، هەستی خۆشەویستیت بەرامبەر کەسانی دیکە ببزوێنە، با هیچ دڵێکی غەمبار نەمێنێت کە دەستی یارمەتیت بۆ درێژ نەکردبێت!. چەپڵە بۆ باشییەکانی باشەکان لێبدە.

---

١ سورەتی آل عمران، ئایەتی ١٥٩

بەرامبەر سینە پڕ لە باوەڕەکان نەرمی بنوێنە، بەرامبەر سینە بێباوەڕەکان هێندە نەرمی بنوێنە تا قین و نەفرینیان بڕەوێتەوە و بتوێتەوە. با هەناسەکانت مەسیحانە بێت، وەڵامی خراپەکان بە چاکە بدەوە. گوێ مەدە مامەڵەی کەسە بێڕێزەکان. هەموو کەسێك بە هەڵسوکەوتەکانی خۆی کارەکتەری خۆی دەنوێنێت. هەمیشە ڕێگای لێبوردەیی هەڵبژێرە. بەرامبەر ئەوانەی کە نازانن پەسەندکردنی بیروڕای بەرامبەر چیە تۆ هەمیشە مەرد و جوامێر بە. خۆشویستنی خۆشەویستی و دژایەتیکردنی دوژمنایەتی بریتین لە نایابترین سیفەتی ئەو دڵانەی کە خۆیان بە پەروەردگار فرۆشتووە. ڕق لێبوونەوەش لە هەموو کەسێك یا ئەوەتا دڵی وابەستەییە بەشەیتانەوە، یان ئەوەتا ئەنجامی شێتییەکە. تۆ مرۆڤت خوشبوێت و شەیدای مرۆڤایەتی بە. بە هەست و بیرکردنەوەکانمانەوە پێویستە خاوەنی نەرمونیانی بین.»[١]

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی بانگەوازی پەیامبەریی پێغەمبەری خوا پلە پلە هەنگاو هەڵگرتنەکەیەتی، واتە هەنگاو بە هەنگاو کاری تەبلیغەکەی بەجێهێناوە. ئەگەر کەسێك توانای هەڵگرتنی تەنها (٢٠) کیلۆی ببێت، ئێمە (٥٠) کیلۆ بدەین بە سەریدا، ئەوە نایتوانێت و لە ژێریدا دەکەوێت، پێغەمبەری خواش بەپێی ئاست و پلەیان مامەڵەی لەگەڵ دوێنراوەکانی مەککەدا کردووە، حەقیقەتەکانی بە یەکجار نەداوە بەسەریاندا، بەڵکو هێواش هێواش ئاشنای دەکردن و خۆشەویستی ڕاستەقینەی ئاینی لەلا دروستدەکردن.

بەم شێوەیە زەمینەی ڕەخساندووە بۆیان تاکو دڵیان بەرامبەر ئیسلام گەرم ببێتەوە، پێویست دەکات تیشك بخەینە سەر ئەو تایبەتمەندییەش کە ئیماندارێك پێویستە لە چوارچێوەی هۆکارەکاندا ئەو ئەرکەی کە دەکەوێتە سەرشانی بە جوانترین شێوە بە جێیبهێنێت و پاشان ئەنجامەکەی بۆ خوای گەورە بەجێبهێڵێت.

١ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، پێوانە یاخود ڕووناکییەکانی سەر ڕێ

لەکاتی بەدەستهێنانی سەرکەوتندا نابێت ڕوویان بکاتە خۆی و توشی لە خۆگۆڕان و خۆبەزلزانین ببێت. بەپێچەوانەوە دەبێت هەمیشە بەو هەست و بیرەوە مامەڵە بکات کە هەر خوای گەورەیە ئیحسان و چاکە دەبەخشێت و بەبێ یارمەتیدانی ئەو هیچ شتێك ڕوونادات و سەرکەوتن بە دەست نایەت.

لە کۆتاییدا دەڵێین دەبێت ژیانمان لە سەر بناغەی زوهد و تەقوا (پارێزکاری) دابڕێژین و لە پەنا پێنج نوێژە فەرزەکە نوێژە سوننەتەکان لە بیرنەکەین و هەوڵ بدەین نوێژە سوننەتەکانی وەك شەونوێژ و نوێژی ئەوابین ئەنجام بدەین و تەسبیحاتەکان و نزای جەوشەنیش بخوێنین.

## ئەو شیشانە بگرن بە دەستانەوە ئێمە شایستەی ئەو لێدانەین

لە قوتابخانەکاندا دەبێت بەلایەنی کەمەوە هێندەی وانەکانی دی، گرنگی بە لایەنی پەروەردەیی و فەرهەنگی نەتەوەیی بدرێت، بۆ ئەوەی نەوەیەکی ڕۆح ساغ و تەندروست و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز پێبگات کە نیشتیمان بکاتە بەهەشت.

فێرکردن شتێکە و پەروەردە شتێکی دی، زۆر کەس دەتوانن ببنە مامۆستا بەڵام کەمن ئەوانەی دەبنە پەروەرشیار، بوونە مامۆستای پەروەرشیار بەندە بە هەستکردنێکی تەواو بە بەرپرسیارێتی سەرشان و خەمخۆری و چیلە کێشان بۆ کار، دروستکردنی کاریگەریش لە دڵی دوێندراودا هەر وابەستەی لە خۆدا بەرجەستەکردنێکی لەم شێوەیە. ئەمەش نموونەیەکی زیندووی ئەم باسە:

مامۆستا حەیدەر یاریدەدەری بەڕێوەبەری بەشە ناوخۆییەکە بە مامۆستا نەوزاد دەڵێت:سێ قوتابی ئەم بەشە ناوخۆییە ڕایانکردووە، پێشتریش ئامۆژگاری کرابوون، بەڵام قسە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئەمانە نەماوە، ئەمە سێیەم جاریانە.

م. نەوزاد پرسی: بۆچی ڕادەکەن؟

م. حەیدەر: نازانم. حەزیان لە ژیانی بێ سەروبەرەییە.

م. نەوزاد: پێشتر چۆن دەتاندۆزینەوە؟

م. حەیدەر: جارێکیان لە گەراج گرتمانن و هێنامانەوە، دووەم جار لە پارکێك دۆزیمانەوە، لەسەر کورسیەکان خەویان لێکەوتبوو، بەهۆی قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە درەنگانی شەودا سەربازە ئێشکگرەکان دەستگیریان کردبوون و دواتر ئاگاداریان کردینەوە و ئێمەش هێنامانەوە، بەدرێژی بۆمان باس کردن کە ئەم کارەیان هەڵەیە و زۆر قورس بەسەریاندا دەشکێتەوە، بەڵام قسە بێ سوودە لەگەڵیان.

ئەمجارەیان ئەم سیانە بیریان لەوە کردبووەوە کە بە شەمەندەفەر ڕابکەن، چووبوون پلیت بکڕن. کاکی پلیت فرۆش کابرایەکی بە ئەزموون دەبێت، بۆیە یەکسەر لە حاڵەتەکەیان تێدەگات و دەزانێت کە ئەمانە قوتابین و ڕایانکردووە.

بۆیە پێیان دەڵێت: "کوڕەکانم دەزانن ئێرە شوێنێکی قەرەباڵغەو دزی زۆری لێیە، من لە شوێنی باوکتانم ئەگەر حەزدەکەن دەتوانن پارەو شتەکانتان لای من دابنێن تا شەمەندەفەرەکە دەکەوێتە ڕێ، من بۆتان دەپارێزم، ئەوانیش داواکەی پەسەند دەکەن و شتەکانیان لەلای دادەنێن."

کاکی پلیت فرۆش یەکسەر هەواڵ دەداتە پۆلیسی گەراجەکە بۆ ئەوەی دەستبەجێ لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکات و بزانێت کێن و لە چ قوتابخانە و بەشە ناوخۆییەکن، پۆلیسەکەش باوك ئاسا لێیان نزیك دەبێتەوەو لە پاش گفتوگۆکردن لەگەڵیان تێدەگات لە حاڵەتەکە و یەکسەر پەیوەندی دەکات بە بەشە ناوخۆییەکەیانەوە.

مامۆستا حەیدەر دەستبەجێ سواری ئۆتۆمبێل دەبێت و پێش ئەوەی شەمەندەفەرەکە دەربچێت دەگاتە لای قوتابییەکان و دەیانهێنێتەوە بۆ بەشە ناوخۆییەکە. لەڕێگا

بیری لەوە دەکردەوە کە ئەمجارە لێدانێکی زۆر باشیان لێبدات، چونکە پێشتر هەموو جۆرە ئامۆژگارییەکیان لەگەڵ تاقیکرابوویەوە، بەڵام هەر کە گەیشتنەوە بەشی ناوخۆیی لەگەڵ جەنابی بەڕێوبەر چاویان بە یەکتر دەکەوێت، مامۆستا حەیدەر لە بیرۆکەی لێدانەکە پاشگەز دەبێتەوە و حاڵەتەکە بۆ بەڕێوەبەر باسدەکات:

جەنابی بەڕێوەبەر دەڵێت: ”سێ شیشی ئاسنم بۆ پەیدا بکە با قاچیان بشکێنم و جارێکی تر خەیاڵی ڕاکردن نەکەنەوە، من وانەم هەیە با ئەوانیش بێنە پۆلەوە، بەڵام تۆ بڕۆ وەکو پێم وتی سێ شیشی ئاسنم بۆ بێنە.“

مامۆستا حەیدەر کاتێك دەچوو ئاسنەکان بهێنێت لەبەر خۆیەوە دەیوت: باشە مامۆستا گیان مەگەر شیشێك بەس نییە؟ خۆ ئەمە تەختە نییە بشکێت، پاشان وتی بێگومان مامۆستا بیری لە شتێك کردووەتەوە و ئەمە بێ حیکمەت نییە.

مامۆستا حەیدەر پاش ماوەیەك بە سێ شیشی ئاسنەوە هاتەوە، بەڕێوەبەریش لە وانە وتنەوە تەواو بووبوو. سێ قوتابییەکەی ئێمەش لە ترسدا دەلەرزین و وەکو نەخۆشی بەردەم ژووری نەشتەرگەری ڕەنگیان زەرد زەرد هەڵگەڕابوو، بەڕێوەبەر سەیری کردن و وتی: دەی وەرن پێشم کەون، بچنە ژوورەکەی تەنیشتمەوە.

بەڕێوەبەر: مامۆستا حەیدەر کراسەکەت دابنێ و وا منیش دایدەنێم، کوڕەکانم ئەو شیشە ئاسنینانە بەدەستانەوە بگرن و تا دەتوانن لێمان بدەن، ئێمە شایستەی ئەم لێدانەین، ئەگەر ئێمە ببووینایە بە نموونەیەکی باش بۆ ئێوە و هەستی مرۆڤایەتی ڕاستەقینەمان بدایە بە گوێی ڕۆحی ئێوەدا ئێوەش ئارەزووی سەرەڕۆیی و بێ سەروبەرییتان نەدەکرد.

ئەو خوێندکارانەی کە پێش چوونە ژوورەوە زەرد هەڵگەڕابوون و هێز لە ئەژنۆیاندا نەمابوو. کاتێك لەگەڵ شتێکی ئاوەها چاوەڕواننەکراودا ڕوویەڕووبوونەوە، بە پەرێشانییەوە خۆیاندا بەزەویدا، بەو پەڕی گریانەوە دەپاڕانەوە و دەیان وت:

مامۆستا گیان، ئەگەر دەتانەوێت قاچمان بشکێنن، ئەگەر دەتانەوێ بمانخەنە دۆزەخەوە، بەڵام هەرچیەك دەکەن لێمان ببورن.

بەڵێ، جەنابی بەڕێوەبەر زۆر بەڕاستی بوو. پاش ئەوەی کە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەروونی خۆی کردبوو. ئینجا بڕیارێکی لەم جۆرەی دابوو. جەنابی بەڕێوبەر کە پەشیمانیی ڕاستەقینەی قوتابییەکانی بەدیکرد، لە بڕیارەکەی پاشگەز بوویەوە. پاش ئەمەش چیدی ڕووداوی ڕاکردن ڕووی نەدایەوە.

## سیفەتەکانی مرۆڤی خزمەت

١. مرۆڤی خزمەت لە پێناوی ئەو بەهایانەی دڵی پێوە پەیوەست کردووە ئامادەیە زۆر چاونەترسانە بەسەر دڕك و داڵ و سەختی و ناڕەحەتیدا بگوزەرێت و بڕوات.

٢. مرۆڤی خزمەت بەرامبەر پەروەردگاری مەزن هێندە پێگەیشتوو و بە ئەدەب و ڕەوشت بەرزە هەرکاتێك ئامانجەکەی دەپێکێت و سەردەکەوێت، خۆی ناکاتە خاوەنی سەرکەوتنەکان بەڵکو هەمووی دەداتە پاڵ خاوەنە ڕاستەقینەکەیان، هەر دەنگ و سەدایەك بە ناوی خزمەتەوە بەرز ببێتەوە بە زیکر و تەسبیحی دەزانێت، بە چاوی ڕێزەوە لە هەمووان دەڕوانێت. هێندە بڕوای بە توانا و قودرەتی خوای گەورە هەیە کە لە کاتی چەپڵە لێدان بۆ سەرکەوتنی تاکەکانیشدا سەرکەوتنەکان هەر دەداتە پاڵ پەروەردگاری و خۆی دەپارێزێت لەوەی تاکەکان بکاتە بت لە هزری خۆیدا.

٣. مرۆڤی خزمەت هەرکاتێك لەهەر شوێنێك پێویست بێت کارێك ئەنجام بدرێت، ئەو یەکەم کەس دەبێت کە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت بەرامبەری. لەبەرامبەر هەموو ئەوانەی کە خەمی هەڵگرتنی مەشخەڵی حەقیان هەیە تا بەرزترین ئاست بەڕێز و بەویژدانە.

٤. مرۆڤی ئەم ڕێیە گەر تووشی شکستیش بێت و دامەزراوە و پلانەکانیشی تێکبشکێنرێت و یەکبوون و یەکێتی پەرت بکرێت و هێزی نەوی بکرێت، هێشتا بەو پەڕی بڕواو ئومێدەوە مامەڵە دەکات و پاشانیش کە دووبارە ڕوو بە ئاسۆ بەرەو سەرکەوتن لە شەقەی باڵ دەداتەوە هەر چاوپۆشی و لێبوردەیی دەکاتە پێشڕەوی خۆی.

٥. مرۆڤی خزمەت خاوەن بەسیرەت (بینایی دڵە) و کەسێکی واقیع بینە و هەر لە سەرەتاوە ئەوەی پەسەند کردووە کە ئەم ڕێگایە یەك پارچە هەوراز و نشێوییە. هەروەها هێندە باوەڕێکی پتەو و هیممەتێکی بەرزی هەیە کە ئەگەر چاڵەکانی دۆزەخیش لە بەردەمیدا ببنە لەمپەڕ ئامادەی تێپەڕاندنیانە.

٦. وەك ڕێبوارێکی ئەوینداری ئەو ڕێبازەی سەری لە پێناودا داناوە، دەبێت هێندە وەفادار بێت کە تەنانەت لە گیان و گیانانی بگوزەرێت بێ ئەوەی جارێکی دیکەش بیانهێنێتەوە بە خەیاڵیدا. بەڵێ ئەو مرۆڤێکی ڕۆح و کەسێکی ڕاستگۆ و لەخۆبوردەی لەم شێوەیەیە."[1]

١ موحەممەد فەتحوللا گولەن (پێومر یان تیشکەکانی سەر ڕێ)

## خزمەت بە بێ خەمخۆری و چیلەکێشان نابێت

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ئیماندارانەی کە خزمەتکردنی ئاینیان کردووە بە ئامانجی ژیانیان بریتیە لە خەمخواردن و نارەحەتی کێشان، ئەوەش ئاشکرایە کە ئامانج لە ناردنی پێغەمبەران بۆ دونیا بریتیە لە بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەت و هاندانی خەڵکی بۆ ڕێگەی ڕاست. ئەوان هەموو ساتەکانی تەمەنیان بۆ ئەم کارە تەرخان کردووە. ئەو کاتەی کە لە گەڵ خەڵکیدا دەبوون بۆ ئیمان هێنان بانگهێشتیان دەکردن و بۆ ئەوەی مافی ئەرکەکەی سەرشانیان بدەن، لە کاتی تەنهاییشدا پلان و ستراتیژییەتی کاریان دادەڕشت، لە پێناوی سەرکەوتنیشیاندا داوای یارمەتییان لە خوای گەورە دەکرد، بۆ ئەو کەسانەش کە لە خوای گەورە دووربوون ڕوویان دەکردە پەروەردگاری مەزن و بە نرکە وناڵەوە داوای هیدایەت و لێخۆشبوونیان بۆ دەکردن، هەموو ئەمانە و خەم و چیلە کێشان دیارترین سیمان کە لە ژیانی هەموو پێغەمبەراندا بەدیار دەکەون.

بێگومان زۆر سروشتییە کە ژیانی ئازیزیشمان هەر بەم شێوەیە بێت، ئەو زۆر پەرۆش و پەیوەستی ئوممەتەکەی بوو بۆ موسوڵمان بوونیان، هەزار و یەك جۆر خەم و چیلە و نارەحەتی دەکێشا، لەمبارەیەوە خوای گەورە لە قورئانی کەریمدا دەفەرموێت: "ئەی خەڵکینە پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانە کراوە کە هەریەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە توشبوونتان بەبەڵاو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە بۆتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان. "(التوبة —١٢٨)

بەڵێ پێغەمبەری ئازیز هەروەك لەدونیادا هەوڵی داوە لەئاخیرەتیشدا هەوڵ بۆ سەرفرازیی مرۆڤەکان دەدات، لەپێناو ئەوەی پەروەردگار لێمان خۆش بێت نزامان بۆ دەکات، مافی شەفاعەتی بەکاردەهێنێت و دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە کەسانی

شیاو بەر لێخۆشبوونی خوا بکەون.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەوەی کە هەر تاکێکی موسوڵمان وەکو سەروەرمان پەیوەندیدار و پەرۆشی موسوڵمانان بێت و لە پێناو فێربوون و تێگەیشتنیان لە ئیسلام و سەرفرازبوونیان لە هەردوو دونیا خەمخۆر بێت و کار بکات، بەلایەنی کەمەوە بە دەروونی کەیل و سینەی بوریانەوە نزایان بۆ بکات ڕەوشتێکی پێغەمبەرانەیە، هەر بۆیە لەکۆنەوە سینە خۆبەبەرپرسیارزانە پڕ لە دەرد و داخەکان نزای (خوایە گیان رەحم بە ئوممەتی موحەممەد بکە) یان کردووەتە ویردی سەر زمانیان.

وەکو هەوڵماندا ئاماژەی پێ بکەین ئەم نزایە ڕەنگی ئاسۆ فراوانی پێغەمبەران و هاوبەشیکردنی بیری بەرزی ئەوانی گرتووە، جاری وا هەیە ئەو مرۆڤانەی کە لەم ئاسۆ بەرزەدان وتویانە: "پەروەردگارم، لاشەم هێندە گەورە بکە تاکو لەدۆزەخدا جگە لە من جێگەی کەسی دی نەبێتەوە، "هەندێك جاریش وتویانە: "من لەپێناو ڕزگارکردنی ئیمانی مرۆڤەکان دونیا و دوارۆژیشم بەخت دەکەم، ئەگەر ئیمانی ئوممەتەکەم لەسەلامەتیدا ببینم، ئامادەم لەناو گڕ و کڵپەی ئاگردا بسووتێم. "ئەوان بەو شێوەیەیان وتووە و فیداکارانە لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە درێژەیان بە ژیان داوە.

ئێستاش هەوڵبدەین بابەتەکەمان بەچیرۆکێك لەبەرچاوتاندا بەرجەستە بکەین:

لە یەکێك لە سەردەمەکاندا زاتێك پرسیارێکی لەم جۆرەی بەبیردا دێت"تۆ بڵێی مرۆڤی کامڵ بوونی هەبێت؟"

لەجیهانی پەنهانەوە پێی دەڵێن" بەڵێ، کەسێك هەیە، ئەو کەسە لەفلان شوێنە خەریکی کاری ئاسنگەریە و ناوی ئەحمەد ئەفەندییە."

ئەم زاتە دەگەڕێ بەدوای ئەم ئەحمەد ناوەدا و دەیدۆزێتەوە، بێ ئەوەی بهێڵێت

پێی بزانێت دەست دەکات بە چاودێریکردنی و هەوڵدەدات ئەو شتانە لەمدا ببینێت کە جیاواز و دەراسان بەڵام شتێکی وا بەدی ناکات.

ڕۆژێکیان دەچێتە دوکانەکەیەوە و هەموو شتێکی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەحمەد ئەفەندی ئاسنگەریش پێی دەڵێت: "بەڵێ، هەروەك تۆ دەبینی من لەژیانمدا ژیانێکی ئایندارانەی وەها قوڵم نیە، نە شەوان بەبەردەوامی بەئاگام نەڕۆژانیش هەمیشە بەڕۆژووم."

بەڵام وەکو پێویستییەکی کارەکەم هەندێك جار پێویست دەکات کە ئاسن بخەمە سەر ئاگر، ئاسنەکە بەباشی سوور دەبێتەوە، لەوکاتەی کەدەمەوێت بیدەم لەقاڵب، ئوممەتی موحەممەد بەخەیاڵمدا دێت و بیر لە حاڵی دووربیان لە خوای گەورەو لە بێ ئاگایی وگەوزانیان لە گۆمی گوناهدا دەکەمەوە، هەر کەئەمەم بیردەکەوێتەوەدەڵێم: "پەروەردگارا موسوڵمانان ببەخشە لە گوناهەکانیان لێیان خۆش ببە و بەزەییت پێیاندا بێتەوە و ڕزگاریان بکە لەم پەرێشانییەی کە تێی کەوتوون."

لەگەڵ ئەم نزاو تێڕامانەدا هێندە ئاوێزان دەبم هەندێك جار ئەو لایەی پارچە ئاسنەکە دەگرم کە لەناو ئاگرەکەدا بووە بەڵام نە هەستی پێ دەکەم نە دەستم دەسووتێت، لەدوای ئەم باسە زاتەکەی تر دەڵێت: "باشە کەواتە ئێستا تێگەیشتم کەتۆ بۆچی لای پەروەردگار هێندە بەنرخیت."

یەکێك لەو تایبەتمەندییە گرنگانەی کە پێویستە مرۆڤی خزمەت پشت گوێی نەخات ئەوەیە کە لە پێناوی ئەوانەی کە حەق و حەقیقەتیان بۆ باس دەکات خەمخۆر بێت و بە دەردی دووری لە حەقیقەتەوە بتلێتەوە. ئەبو عەلی دەقاق کەیەکێکە لەدۆستانی خوا، لەدوای کۆچی دوایی، لە خەوندا دەبینرێت و چاوی بەفرمێسکەوەیە و ئارەزووی دیسان گەڕانەوە دەکات بۆ دونیا و هۆکاری ئەمەی لێدەپرسن، دەڵێت: "دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ دونیا و باش خۆم بگۆڕم و گۆچانەکەم بگرم بەدەستەوە و بەکۆڵانەکاندا بە هەڵەداوان بڕۆم و زۆر بەتوندی لەدەرگای

هەموو ماڵێك بدەم هەتا دەشكێت و پاشان بەهەریەكەیان بڵێم"ئەگەر دەزانن لە كێ بە جێماون، ئەگەر دەزانن لەكێ بەجێماون!"

ئەوە لەدڵی هەموو نێردراوەكان و ئەولیاكانی خوای گەورەدا هەبوو كە لەدەرگای هەموو دڵێك بدەن و بڵێن باوەڕ بەخوای گەورە بهێنن، با ڕزگارتان بێت! لەبەر ئەوەی ئادەمیزاد نازانێت بە چ بەزمێكەوە سەرقاڵ بووە و چییان لە كیس خۆیان داوە و بێ ئاگان لە دواڕۆژی خۆیان، سەرمایەی تەمەن یەك جار بە مرۆڤ دەدرێت، بە فیڕۆدانی ئەو سەرمایەیە و بەكارنەهێنانی بۆ بەدەستخستنی بە ختەوەری هەمیشەیی، كارێكی هێندە نەشیاوە كە نە پاساو و نە لێكدانەوە هەڵناگرێت.

# چۆن سیفەتی مرۆڤی خزمەت دەست دەخرێت؟

یەکێك لەقوتابیە تایبەتەکانی بەدیعوززەمان (زوبێیر گوندوز ئالْپ)، لەنامەیەکدا بۆ هاورێیەکی دەنووسێت کە ئەویش قوتابی پەیامەکانی نوورە بەناوی (نازم گۆکچەك) لە شاری غازی عەنتاب بەمشێوەیە تێیدا باسی سیفەتەکانی مرۆڤی خزمەت دەکات:

برا ئازیز و بەڕێزەکەم!

- مادەم وا ڕادەگەیەنیت کە بە هەموو دەردێکی ئیسلام ڕازیت بەم موژدەیەت عیشق و شەوقمان پێدەبەخشیت، کەواتە باش گوێ بگرە.
- ئەرکەکەت ئەوەیە کە لە نێو دڕکەکاندا گوڵ بڕوێنیت، قاچەکانت ڕووتن ئازارت پیدەگات، دەستەکانت ڕووتن دەگەزرێن... بەمە خۆشحاڵ دەبیت.
- پاشان منداڵە مووسا ئاساکان کە لە باوەشی فیرعەونەکان پێگەشتوون دەهێنیتە ڕیزتەوە، لەبەرئەوەی وەرتگرتوون لێتدەدەن، لەبەرئەوەی قسەتکردووە دەتخەنە زیندانەکانەوە... بەمە خۆشحاڵ دەبیت.
- گەر فرێت بدەنە زیندانە تاریکەکانەوە ڕووناکی دەبەخشی، گەر ویژدانە ژەنگ خواردووەکانت بینی ئومێد دەبەخشیت، گەر تووشی دڵە بێ ئیمانەکان بوویت نوور دەبەخشیت، لەبەرئەوەی تۆ بەخشیوتە تاوان، لەبەرئەوەی تۆ هێناوتە سزا، لەبەرئەوەی تۆ قسەتکردووە تاوانبار دەکرێیت.
- لە دایك و ئازیزان و گیانت دەبیت، بە گیان و دڵ قورئان لە ئامێز دەگریت، گەر دڵۆپێك بیت دەبیتە دەریا و گەر هەناسەیەك بیت دەبیتە گەردەلوول...
- گەر ڕووبەڕووی درۆ و بوختان وگەردەلوولی قوڕ بوویتەوە هەستەکانت

تەرك دەكەیت، گەر لەبەردەمتدا بەربەستێكی ئاسنین دروست بكەن بە ددانەكانت كونی دەكەیت، گەر پێویست بە هەڵكۆڵینی شاخەكان بكات بە دەرزی هەڵیدەكۆڵیت.

- لە دەوروبەرتدا بە علیم و عیرفان و مەردایەتی و ڕەوشتی جوان چەندین قەڵا بنیات دەنێیت، قەڵاكان كەسانی گیانفیدایان دەوێت هەرچۆنێك بێت تۆش لە نێویاندا دەبیتە گیان فیدا.

پاشان مامۆستا زوبەیر بەمجۆرە لەنامەكەی بەردەوام دەبێت:

" كاتێ كە ئەم نامەیەم دەخوێنیتەوە، لەوانەیە تۆش هەروەكو یونس چۆن لە كاتی خوێندنەوەی مەسنەویدا دەڵێت"گەلێك درێژە"تۆش بڵێیت: چ پێویستییەك هەبوو بەم درێژەپێدانە؟ خۆ هێندە بەس بوو كە بتوتایە "دەبێ ببیتە قوتابیی قورئان. هەق لای تۆیە! چونكە ئەو كەسەی كە"ئیسلام"بە ڕێگای خۆی هەڵدەبژێرێت، دەزانێت ئەم ڕێگایە لە موو باریكتر و لە نووكی شمشێریش تیژترە و ڕێی هەموو كەسێك نییە، بەڵكو تەنها هی مرۆڤی مەرد و ئازایە..."

# هیچ ئەرکێك لە خزمەتکردنی ئاین گەورەتر نییە

لەم سەرزەویەدا هیچ ئەرکێکی دیکە نیە هێندەی خزمەتکردنی ئاین مەزن بێت. خۆ ئەگەر هەبووایە ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرانی کە هەڵبژاردەی خۆیین بەو ئەرکە ڕادەسپارد. بانگەواز لەو ڕووەی کە ڕێی مرۆڤایەتی ڕوون دەکاتەوە و پەروەردگار بە بەندەکانی دەناسێنێت و مرۆڤ پاڵافتە دەکات و بە ماهییەت و حەقیقەتی خۆی شادیان دەکاتەوە وەك نموونەی خۆری هەڵهاتوو وایە. هەموو ئەوانەی لەسەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە تاوەکو ئەم سەردەمە خاوەندارێتی ئەم داوایەیان گرتووەتە ئەستۆ، لەم ئەرکەدا هاوبەشی پێغەمبەرانیان کردووە و لەسەر هەمان سفرە لەگەڵیان کۆبوونەتەوە.

لەبەرئەوە ئیماندار دەبێت بە هەستی بەرپرسیارێتی و فەرمانبەریەوە خزمەت بکات، ئێستاش سەبارەت بەو هەستی بەرپرسیارێتی و فەرمانبەرێتییەی کە دەبێت لە ئیماندارانی ئەم ڕێگەیەدا هەبن ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەگێڕینەوە:

خوسرەو ئەفەندی کە یەکێکە لە زاناکانی سەردەمی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی ڕۆژێکیان لە پۆلدا وانە دەڵێتەوە، قوتابییەکان هەست بە خەمبارییەکی زۆر دەکەن بە ڕووی مامۆستاکەیانەوە و لێی دەپرسن :

مامۆستا ئەمڕۆ زۆر خەمبار دیاریت!

مامۆستا لە وەڵامدا دەڵێت: داوای لێبوردن دەکەم، نەمدەویست ئێوە هەستی پێبکەن، کچەکەم کەمێك پێش ئەوەی لەماڵ بێمە دەرەوە کۆچی دوایی کرد، کاتێك بیرم لەئیشی کفنکردنەکەی دەکردەوە لەوکاتەدا یەکسەر ئەوە بەخەیاڵمدا هات چی وەڵامی پەروەردگار بدەمەوە ئەگەر کەموکوڕی لە وانەی قوتابییەکانمدا بکەم، ئیتر هەستام و بەرەو وانەکەم هاتم، بەڵام تەرمی کچەکەم لەماڵەوە هەروا مایەوە، جار جار کەبیرم دەکەوێتەوە خەیاڵم دەڕوات.

ئەمانە ئەو مامۆستایانەن ئەرکی بەکردەکردن و نوێنەرایەتی کاروانی نەمریان لەئەستۆ گرتبوو، ئەگەر هەویری ژیان بەدەستی ئەم مامۆستایانە بشێلرێت، ئەوا مرۆڤایەتی دیسان بەو بەختەوەریەی کە پێویستی پێیەتی شاد دەبێتەوە.

ئێستاش با نموونەیەکی ئەم سەردەمەمان باس بکەین:

"بەڕێوەبەری یەکێك لەو کۆلێژە نمونەییانەی کە لەسەرتاپای جیهاندا کراونەتەوە، دەبینێت لەیەکێك لەپەنجەرەکانی قاتی سەرەوەی کۆلێژەکەیەوە منداڵێك دەکەوێتە خوارەوە، بەهەڵەداوان لە پلیەکانەکان دێتە خوارەوە، کاتێك منداڵەکە دەبینێت کە لە زەویدا کەوتووە بە سینەیەکی ئاوێزان لە خەم و خۆشییەوە نەسیمی هەستی بەرپرسیارێتی ژێی دڵی دەلەرێنێتەوە و ئەم هەستانە بە دڵیدا تێدەپەڕێت و دەڵێت سوپاس بۆ خوا کورەکەی خۆمە."

بەڵێ، جیاوازی نیە لەنێوان خەسرەو ئەفەندی و ئەو بەڕێوبەرە گەنجەدا، ئەو کەسانەی کە لەهەمان ئاسۆی مەردایەتیدان لە هەمان هێڵدا یەکدەگرنەوە ئەمەش یەکەم ئاماژەی دۆزینەوەی ئەو خۆرەیە کە لەدەستمان داوە.

## ئایا ئەو ئەرکەی لەسەر شانمانە بەجێی دەگەیەنین؟

پێغەمبەری خوا هەمیشە بە هەستی بەرپرسیارێتییەوە ژیاوە، خاوەنی ئیرادەیەکی پۆڵایین بووە، لەمەککەدا هیچ سەختییەك نەمابوو نەیکێشێت. بەڵام ئەو هەرگیز لەرزەشی پێ نەکەوت،خێزانەکەی و مامی لەدوای یەك کۆچی دواییان کرد.کەهەردوکیان گەورەترین پاڵپشت و هاوکاری بوون،بەڵام هەرگیز هێندەی گەردیلەیەکیش تووشی بێهیوایی نەبووە.

پێغەمبەری خوا ئەرکی تەبلیغی پێ سپێردرابوو ، خوای گەورەی بە یەکە یەکەی مرۆڤەکان دەناساند، ئەمەش کارێکی زۆر گران بوو، بەڵام پێغەمبەری خودا بەبێ دوودڵی شانی دابووە بەر ئەم فەرمانبەرییە و لەدڵی مرۆڤەکاندا تەختی فەرمانڕەوایی دادەمەزراند.

ئەو هەر لە منداڵییەوە بەشێوەیەك بەرنامەڕێژکرابوو کە لە زاری موبارەکییەوە گوێیان لە وتنی (أمتی أمتی) بووە ،خەمخواردنە لە ڕادەبەدەرەکەی ڕۆژی مەحشەریشی هەر درێژکراوەی ئەم هەستی بەرپرسیارێتییەیەتی .بێگومان چوونە ژێر بەرپرسیارێتیەکی لەم جۆرەش بێجگە لە ئەو کەس ناتوانێت بەرگەی بگرێت. ئەو وەك بڵێی بەرپرسیارێتی هەموو مرۆڤایەتی خستبووە ئەستۆی خۆی.

لە سەرەتاوە چۆن دەستی پێکردبوو ڕێڕەوی تەواوی ژیانی لە هەمان چوارچێوەو بە هەمان پێوەر و بنەما بەردەوام بووە، ئەو کاتەی کە لە مەککەدا تەنها یەك منداڵ و یەك ئافرەت و یەك کۆیلە و یەك مرۆڤی ئازاد لە دەوری بوون،مامەڵەو هەڵسوکەوتی چۆن بوو ئەوکاتەی لە حەجیماڵئاوایشدا کە زیاد لە سەد هەزار هاوەڵ لە خزمەتیدابوون هەمان شێوازی هەڵسوکەوت و مامەڵەی هەبوو.

سەرداری پێغەمبەران، لەکاتی وتاری ماڵئاوایدا کە هەموو خەڵکی شەپۆل شەپۆل لە شێوەی چەندەها بازنەی نورانیدا کۆبوبونەوەو گوێبیستی فەرموودەکانی دەبوون، دەنگی موبارەکی دەگەیشتە دوورترینی ئامادەبووان، داواشی کرد کە ئەو وتارەی ئەو ڕۆژەی بگەیەنرێت بەوانەی کە ئامادەنەبوون،پێغەمبەری خوا کۆچیی دەکرد و کۆتا وتاری بۆ هاوەڵان دەدا:

ئەی خەڵکینە من بە فەرمانبەرییەکەوە هاتمە لای ئێوە و کۆمەڵێك شتم بۆ

باس کردن سبەی لە دوارۆژدا پرسیارتان لێدەکرێت سەبارەت بەوەی کە من ئەرکی سەرشانم بە جێهێناوە یان نا، جا ئێوە چۆن شایەتیم بۆ دەدەن؟ ئەو پێغەمبەر بوو فەرمانبەرییەکەی بەجێگەیاندبوو.

ئەو هێندە مرۆڤێکی مەزن بوو تەنانەت تێکچوونی پرچی مویارەکی، بە ڕووداوێکی گەورە لە لای پەروەردگار هەژمار دەکرا. ئەو کەسێکی زۆر بێ وێنەبوو ،لە گوناهی ڕابردوو داهاتووشی بەخشرابوو، ئەرکی سەرشانی بە زیادەوە بە جێهێنابوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەندێشەی هەبوو کە داخۆ ئەرکەکەی بە جێگەیاندووە ؟ داخۆ خەڵك شایەتی ئەمەی بۆ دەدەن؟، لە ناکاو کێوی عەرەفات یان مەیدانی موزدەلیفە هاتنە لەرزین، دەنگێك لەناخ و دڵەکانەوە دەرچوو:

ئەی پێغەمبەری خوا تۆ ئەرکی سەرشانت بەجێهێنا. پەیامی پێغەمبەرایەتییەکەی خۆتت گەیاند، پاش ئەوەی کەهاوەڵان ئەمەیان وت، پەنجەی مویارەکی بەرەو سەرەوە بەرزکردەوەو فەرمووی" شاهید بە ئەی خوداوەندم! شاهید بە ئەی خوداوەندم!"

ئاخۆ دەبێت پێغەمبەری خوا بە ووتنی ئەمانە دەیویست چی بگەیەنێت! هەرکەسەو بەپێی ئەو پلەیەی کەخوای گەورە پێی بەخشیوە، بەپێی ئەوەی تاچەنێك بۆتە جێی درەوشانەوەی لوتفەکانی خوای گەورە. هەرکەسەو بەپێی توانا و لێهاتنی بەرپرسیارە بەرامبەر چەند فەرمانبەرییەك، پێغەمبەری سەردارمان مافی تەواوەتی دابوو بە فەرمانبەرییەکەی سەرشانی، ئەی ئێمە؟ ئایا لەم چەرخەدا ئەو ئەرکەی کەکەوتووەتە ئەستۆی ئێمە بەجێمان هێناوە؟ هەموو کەسێك دەبێت ئەم پرسیارە ئاڕاستەی خودی خۆی بکات. نابێت هیچ کەسێك لەبەرامبەر ئەو ئاگرەی کەلەبەردەمیدایە تەنها وەك تەماشاکەر بمێنێتەوە و هیچ نەبێت دەبێت سەتڵێك ئاو هەڵبگرێت و هەوڵبدات ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە.

## خۆشاردنەوە لەپشت بیانووی جۆراوجۆرەوە

لەکاتی بەجێهێنانی ئەم خزمەتە مەزنەدا نابێت لەپشت بیانووی جۆراوجۆرەوە خۆمان بشارینەوە. ئەم چیرۆکەی خوارەوە نموونەیەکی جوانە بۆ تێگەیشتن لەم ڕاستییە:

دەڵێن سەردەمانێك لەنێوان باڵندە و ئاژەڵانی سەر زەویدا جەنگێك سەریهەڵدابوو ، هیچ لایەکیش نەیدەتوانی بەتەواوی سەربکەوێت بەسەر لایەکەی دیدا. شەمشەمەکوێرەش کە هەندێك تایبەتمەندێتی باڵندە وهەندێك تایبەتمەندێتی ئاژەڵانی تێدابوو بە درێژایی جەنگەکە بە بێلایەنی مابوویەوە.

کاتێك کەباڵندەکان دەیانوت" وەرە لەگەڵ ئێمەدا بە "دەیوت" من ئاژەڵم"، کەئاژەڵەکانیش دەیانوت "وەرە لەگەڵ ئێمەدابە " دەیوت "من باڵندەم."

بەتێپەڕبوونی کات جەنگەکە بەکۆتا هات و لەنێوان باڵندە و ئاژەڵەکاندا ڕێککەوتننامەی ئاشتی واژۆکرا. شەمشەمەکوێرە، ویستی بچێتە بەرەی باڵندەکانەوە و هاوبەشی خۆشیەکەیان بێت، بەڵام باڵندەکان ڕێیان نەکردەوەو دەریان کرد، کاتێك کەچووە لای ئاژەڵانیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵداکرد. شەمشەمەکوێرەی بەدبەخت ناچار بوو چیدی ژیانی لە کونجە تاریك و کەلەبەرە وێرانە و دوور لە ڕووناکیەکاندا بەسەربەرێت و تەنها بەشەو خۆی نیشان بدات، چوونکە چیدی ڕووی نەدەهات تێکەڵ بە هیچ لایەك ببێت.

بێینەوە سەر باسەکەمان ئیماندار نابێت بەهانەی جۆراوجۆر بۆخۆی بهێنێتەوەو خۆی لەپشت پۆزشگەلی جۆراوجۆرەوە حەشاربدات، بەڵکو دەبێت مۆمێك لەتاریکیدا دابگیرسێنێت و لەپێناوی سەرکەوتنی چاکە بەسەر خراپەدا هەرچی لەدەست دێت ئەنجامی بدات بێگومان بەو شێوەیە نا خراپە بە خراپە وەڵام بداتەوە. بە ڵکو بەوەی هەرچی هەڵسوکەوتی هەیە جوان بێت و ئامۆژگاری خەڵکیش بکات بۆلای جوانییەکان. ئەو کەسەی کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە لە پێناو خزمەت کردنی حەق و حەقیقەتدا مانای وایە پێشەکی بە هەموو بەڵاو موسیبەت و تەنگ و چەڵەمەیەك کە لەم پێناوەدا توشی دەبێت بەوپەڕی سینەفراوانیەوە ڕازی بووە. مرۆڤێکی لەم شێوەیە سەرباری هەموو نارەحەتیەکان دەبێت لە هەوڵی ئەوەدا بێت ئەو ئەرکەی لە ڕێبازی خزمەتدا پێی سپێرراوە بە تەواوی بەجێی بهێنێت. بێ کۆڵدان و پسان لە ژێر ئەو هەموو سەختی و نارەحەتییەی لەسەر ڕێدان و بێ خۆ حەشاردان لە پشت هیچ پۆزش و بیانوویەکەوە دەبێت هەوڵ و کۆششی مەزنی لە پێناو گەیشتن بە ئامانجی خزمەتەکەیدا بێت.

ئەم دونیایە شوێنی بەندایەتی و خزمەتکردنە. تەمەن ئەو ماوە کورتەیە کە تۆوەکانی کێڵگەی دوارۆژی تێدا دەچێنرێت. خزمەتکردنی ڕێبازی خوداش کە دەتوانین بڵێین پوختەی واتاکەی بریتیە لە گەیاندنی ناوی خودا و پێغەمبەرەکەی بە هەموو گرۆی ئادەمی، هەرگیز بێ ئاستەنگ و سەختی نەبووە و نابێت، ئەوەی دەکەوێتە سەرشانی ئێمە ئەوەیە سەرباری هەموو سەختییەکان بێ سرەوت و بێ کۆڵدان بەردەوام بین لە ڕێکردن و هەوڵبدەین بۆ گەیشتن بە ئامانجی سەرەکیمان.

## مامۆستا بەدیعوززەمان هەموو ساتێکی تەمەنە نوورانیە پڕ سەختییەکەی لە پێناوی خزمەتگوزاریی ئیمان و قورئاندا بەسەربردووە

یەکێك لە گرنگترین ئەو زاتانەی کە مەشخەڵهەڵگری سەر ڕێی خزمەتەکردنی قورئانە مامۆستا سەعیدی نورسی یە .

بەدیعوززەمان پێی وایە کە گرنگترین بنەما و ئامانج لە ژیانی تاکی موسوڵماندا بریتی یە لە هزری خزمەتکردنی ئیمان، مامۆستا هەموو تەمەنی لە پێناوی ئەم هزرەیدا ژیاوە و هەرگیزیش لەم چوارچێوەیە لای نەداوە.

لەدادگای ئەسکی شەهردا دادوەر لە یەکە یەکەی ئەوانەی هێنراونەتە دادگا دەپرسێت خەریکی چ کارێکیت؟ کاتێك کە نۆرە دێتە سەر مامۆستا بەدیعوززەمان، هەڵدەسێتە سەرپێ و پەنجەی شایەتمانی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: خەریکی خزمەتکردنی ئیمانم و ئەمە کارمە. مامۆستا بەدیعوزەمان لە پێناو خزمەتی ئیمان و قورئاندا عیزەتی نەفس وشەرەف و رۆح و ژیانی بەختکردووە، سەرباری هەموو ئەو ئەشکەنجە و ئازارو نارەحەتیانەی هاتوونەتە ڕێی، کەچی تاکە هەنگاوێکیش لە ئەرك و خزمەتەکەی نەگەڕاوەتە دواوە و بووەتە سەرمەشقێکی بێوێنەش بۆ ئێمە.

بەڵێ ئەو لە پێناوی خزمەتکردنی ئایندا خۆشی دونیای بەخت کردووە و وازی لە سەروەت و سامانی کەسیی خۆی هێناوە و ژیانێکی لێوانلێو بە زوهد و تەقواو قەناعەتی بەسەربردووە.

مامۆستا نورسی کە زانایەکی ئیسلامی نیشتمانپەروەر بووە دڵی پڕبووە لە خۆشەویستی نیشتمان و خاوەنی مێژوویەکی شکۆدارو نووربەخشانە کە هەر ساتێکی ئەو ژیانە پڕ لە چیلەیەی لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا

بەسەربردووە. ئەو لە بەرامبەر لافاوی چەوساندنەوەی مرۆڤایەتیدا دڵی دەسووتا، لە پێناو بەختەوەری ئوممەتی محمد (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسۡلِيمِ) و گرۆی مرۆڤایەتیدا لە ژێر ناونیشانی "ڕزگارکردنی ئیماندا" هەموو تەمەنی سەرقاڵی کۆشش بوو.

لە سەردەمێکدا کە زۆرێك لە خەڵکی لە هەوڵی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی تاکە کەسیی و دابینکردنی پاشەرۆژێکی دونیایی باشدا بوون بۆ خۆیان، مامۆستا نورسی وەکو کەسێك کە بوون و ژیان و تەمەنی خۆی بۆ ئەم ڕێگەیە تەرخانکردووە، ڕزگارکردنی ئیمانی ئوممەتی بە گەورەترین کار لە قەڵەم داوە.

بەرهەمەکانی کە لە ژێر ئەو مەرجە سەختانەدا داینراون سەرتاپا لە خزمەتی ئەم ئامانجە بەرزەدا بوون. لە ڕێگەی سەرجەمی پەیامەکانی نوورەوە ململانێیەکی زانستییانەی سەختی لەگەڵ بیری ماددەگەرایی و دوژمنانی ئاین و پیرۆزییەکاندا کردووە. یەکتاپەرستی، حەشر، پێغەمبەرێتی، دادپەروەری، قەدەر، ئیمانی تەحقیقی و چەندین چەمکی گرنگی دی کە هەوڵی ڕووخاندن و تێکدانیان دەدرێت لە ڕێگەی ئەو نووسینە بەرزو نورانیانەیەوە ڕاستیی هەموویانی چەسپاندووە.

مامۆستا کە بە دەردی جیهانی ئیسلامی و مرۆڤایەتییەوە دەتلایەوە مرۆڤێکی هەردەم چالاکی چیلەکێش بووە، قارەمانێکی خزمەت بووە کە هەموو ژیانی بۆ ئەو چەمکانە تەرخانکردووە کە باوەڕی پێیان هەبووە، هیچ کاتێك لە وتنی ڕاستییەکان نەسڵەمیوەتەوە، چەندین جار ژەهرخوارد کراوە و تا پەتی سێدارە ڕۆیشتووە، سەرباری بەتەمەنی و نەخۆشییە سەختەکانی لە ژووری سارد و شێدار و کەم هەوای زیندانەدا دەستبەسەر کراوە. بەڵام ئەو بۆ ساتێکیش سازشی لەسەر بیروباوەڕەکەی نەکردووە.

چیلە کە دروشمی ڕێبوارانی ڕێی خزمەتە بەشێکی جیانەبووەوەیە لە ژیانی ئەم

مرۆڤە نوورانییە، ئەوەتا لەم وتانەیدا پوختەیەك دەربارەی ژیانی بە چیلە و نارەحەتی ڕەنگگرتوویمان بۆ باس دەكات: "لە دوای تەمەنێكی هەشتا ساڵی لە دونیادا هیچ شتێك لە خۆشییەكانی دونیام نەچەشتووە، تەمەنم هەموو لە مەیدانەكانی جەنگ و زیندان و دادگاكاندا بەسەر بردووە، لە دادگا سەربازییەكاندا وەكو تاوانبارێكی دڕندە مامەڵەم لەگەڵدا كراوە، وەكو تاوانبارە خوێنمژەكان لە نیشتیمان و لانەی خۆم ڕەهەندە كراوم و ژیانی دەستبەسەری و تەنهاییم بەسەردا سەپێنراوە."

ئەم وتانە پوختەیەكە لە ژیانی پڕ لە چەرمەسەریی وسەختی مامۆستا. ئەم هەستانەی بەرامبەر نارەحەتییە بێ پەرواكان، وێنایەكی جوانی حاڵەتەكەمان بۆ دەكەن " كاتی وا هەبووە هێندە لە ژیان بێزار بووم كە ئەگەر ئیمانەكەم ڕێی لە خۆكوشتن نەگرتایە ئێستا سەعید لە ژێر گڵدا دەبوو."

مامۆستا سەعیدی نوورسی، بەرامبەر ئەو نارەحەتی و ئازارانەی كە هێنراوەتە ڕێی هەمیشە بە ئارامگرتن و تەوەككول وەڵامی داوەتەوە و بەردەوام عیززەتی نەفسی خۆی پاراستووە، هەر لە بنەڕەتدا مامۆستامان هەموو دونیاكەی لەو سەبەتە حەسیرەی ژێر قەرەوێڵەكەیدا جێكردبوویەوە كە تا ئێستاش وەك یادگار ماوە. بایەخی دونیا لە چاوی ئەودا هەر هێندەی ئەو سەبەتەیە بووە.

مامۆستا بەدیعوززەمان بەردەوام لە وانەكانیدا باسی گرنگی خزمەتكردنی ئیمان و قورئانی بە ئیخلاس و پاراستنی برایەتییەوە دەكرد و زوو زوو قوتابییەكانی لەمەڕ ترسناكیی ئەنانییەت و خودپەرستیی ئاگاداردەكردەوە. ڕۆژێكیان مامۆستا زوبێر گوندوزئالپ لە بەدیعوززەمان دەپرسێت، مامۆستا من زۆر لە ئەنانییەت دەترسم، لە وەڵامدا مامۆستا دەفەرمووێت بەڵێ"زۆر بترسە، هێندە بترسە تا لەرزت لێ دێت." ئەو بەم شێوەیە ئامۆژگاری قوتابییەكانی دەكرد: "برایانم ئەركی سەرشانی ئێمە تەنها كاركردنە بە ئیخلاسەوە بۆ ئیمان و قورئان. بەڵام بەدەستهێنانی سەركەوتن

لەم کارەدا و قەبووڵکردنی ئەم ڕاستییانە لە لایەن خەڵکییەوە و دوورخستنەوەی نەیارەکانی ئەم خزمەتە، ئەرکی پەروەردگارە. ئێمە خۆمان لەو شتانە هەڵناقورتێنین کە ئیشی خوای گەورەن. تەنانەت گەر شکستیش بهێنین هەر کار ناکاتە سەر ورە و هێزی مەعنەوی و خزمەتگوزارییەکانمان."

کاتێ کە بە جەلالەدین خوارەزم شای سەرکردەی مەزنیان وت: "بەسەر جەنگیزخاندا سەر دەکەویت" وتی: "ئەرکی سەر شانی ئێمە تەنها جیهاد کردنە، بەڵام سەرکەوتنمان یان شکست هێنانمان کاری خوای گەورەیە و من خۆمی تێهەڵناقورتێنم." منیش شوێنپێی ئەو قارەمانە گەورەیەی ئیسلام هەڵدەگرم و دەڵێم " ئەرکی سەرشانی من خزمەتکردنی ئیمانە و قەبووڵکردنی ئەم ڕاستییانە لەلایەن خەڵکییەوە بەدەست خوای گەورەیە، ئەرکی سەرشانی خۆم ڕادەپەڕێنم. خۆم لە کاری پەروەردگار هەڵناقورتێنم."

حەزرەتی بەدیعوززەمان ئامادەبوو لەپێناوی خزمەت کردنی ئیمان و قورئاندا بەو پەڕی ئیخلاس و برایەتیەوە سنگی بداتە بەر هەموو ئەو سەختیانەی کەدەهاتنە ڕێی. ئەم هەڵوێستەشی هێزێکی ناوازەی خۆراگریی بە ئەو بەخشیبوو. بەڵێ، لەڕاستیدا چی مابوو بە ئەو نەکرابێت. شەوانی درەنگ بانگ کردن بۆ بنکەی پۆلیس و دوای ئێواران بانگ کردن بۆ دادگا و بانگ کردنی میوانەکانی بۆ لێپرسینەوە، بۆ ئەو بووبوونە کارێکی ئاسایی، لادێییەکی داماو دەستی ماچ بکردایە چاودێرەکان وازیان لێنەدەهێنا و دوای دەکەوتن. هەمیشە سووکایەتی بەو کەسانە دەکرا کەهاتووچۆیان دەکرد. پێیان دەوترا "بۆ سەلامی لێدەکەن؟، بۆچی هاتووچۆی دەکەن؟." سەرەڕای ئەوەی بارودۆخەکە بەم شێوەیە بوو، ئەو پێشەوا گەورەیە پارێزگاری لە ئیخلاسەکەی دەکرد و لەپێناوی برایەتیدا لەبەرامبەر هەمووشتێك ئارامی دەگرت.

حەزرەتی بەدیعوززەمان یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ژیانی کە زۆر گرنگی پێدەدا ئەوەبوو کە چاوەڕوانی هیچ نەبووە لەبەرامبەر کارەکانیدا. بۆیە بەهیچ جۆرێك دووركەوتنەوە و ساردبوونەوە و دواکەوتنی لە کاروانی خزمەتکردنی ئیمان و ئاین بە گونجاو نەزانیوە.

## لەبەرچاوم نە ئەوینی بەهەشت هەیە نە ترسی دۆزەخ

حەزرەتی بەدیعوززەمان هەست و بیرکردنەوەکانی ناخی خۆی سەبارەت بەخزمەتکردنی ئاین بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە بۆ بەرێز ئەشرەف ئەدیب: " ئەوەی کە من خەمبار دەکات تەنها ئەو مەترسیانەیە کە ڕووبەڕووی ئیسلام بوونەتەوە، پێشتر مەترسییەکان لە دەرەوە بۆمان دەهات، بۆیە بەرگریکردنی ئاسان بوو بەڵام ئێستا مەترسەییەکان لە ناوخۆوە بۆمان دێن. گورگ هاتووەتە ناو ڕانەکەوە! ئێستا بەرگریکردن سەخت بووە. مەترسی ئەوەم هەیە کە شیرازەی کۆمەڵگە بەرگەی ئەوە نەگرێت. چونکە هەست بە دوژمن ناکات و گەورەترین دوژمنی کە سەرقاڵی مژینی خوێن و لەنەوبردنیەتی بە دۆستی دەبینێت."

ئەگەر تا ئەم ڕادەیەش بەسیرەت و بینایی کۆمەڵگا کەل و کوێر بێت واتە قەڵای ئیمان لە مەترسیدایە. خەمی منیش، تاکە خەمم هەر ئەمەیە، بۆیە تەنانەت کاتی ئەوەشم نیە بیر لەو نارەحەتی و زەحمەتانە بکەمەوە کە هاتوونەتە ڕێی خودی خۆم، خۆزگە هەزار هێندەی ئێستا تووشی زەحمەت و نارەحەتی ببومایە بەڵام قەڵای ئیمان و ئیسلام بە پارێزراویی بمایەتەوە.

چەمکەکانی ئیمان و ژیانی ناخ و ڕۆح بوونەتە ویردی سەر زوبانم، تەنها بە بنەماکانی یەکتاپەرستی و ئیمانەوە خۆم سەرقاڵکردووە کە سەرچاوەکەیان قورئانی پیرۆز و کۆڵەکەی کۆمەڵگای ئیسلامین، کە ئەم کۆڵەکەیە هاتە لەرزین واتای

وایە خۆری ئوممەتی ئیسلامی رووی لە ئاوابوون.

لێم ئەپرسن بۆچی دەوروبەر بێزار ئەکەیت، بەڵام من ئاگام لێ نیە، چونکە لە بەرامبەرمدا ئاگرێکی سامناك هەیە کە کڵپەی دەگاتە ئاسمان و رۆڵەکانمی لە نێودا دەسووتێن، بگرە ئیمانیشمی گرتووەتەوە و دەسوتێت. بەرەو کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە و بۆ رزگارکردنی ئیمان رادەکەم، لە رێگە یەکێك بە ویستی پاشقول لێگرتن قاچی هێناوەتە سەر رێم و منیش قاچم بەر قاچی کەوتووە، لە بەرامبەر ئەم ئاگرە مەزنەدا ئەمە چ گرنگیەکی هەیە؟ ئەم رووداوە چ ئەرزشێکی هەیە؟!

وادەزانن کە من پیاوێکی خۆپەرستم و تەنها بیر لە رزگارکردنی خۆم دەکەمەوە؟ بەڵام من لە پێناو رزگارکردنی ئیمانی ئوممەتەکەمدا دونیا و دوارۆژی خۆشم بەخت کردووە.

لەبەرچاوم نە ئەوینی بەهەشت هەیە نە ترسی دۆزەخ. لە پێناو رزگارکردنی ئیمانی ئوممەتەکەمدا نەك یەك سەعید بەڵکو هەزار سەعید بە فیدابێت! ئەگەر قورئانەکەمان لەسەر زەویدا بێ شوێنکەوتوو بێت ئەوکات بەهەشتیشم ناوێت چونکە ئەوێم بۆ دەبێتە زیندان، ئەگەر ئیمانی ئوممەتەکەم لە سەلامەتیدا ببینم رازیم لەناو بڵێسەی دۆزەخدا بسووتێم. چونکە کە جەستەم دەسووتێت دەروونم لەوپەری بەختەوەریدا دەبێت. لە دوای تەمەنێکی هەشتا ساڵی لە دونیادا هیچ شتێك لە خۆشییەکانی دونیام نەچەشتووە، تەمەنم هەموو لە مەیدانی جەنگ و زیندان و دادگاکاندا بەسەر بردووە، لە دادگا سەربازییەکاندا وەکو تاوانبارێکی درندە مامەڵەم لەگەڵدا کراوە، وەکو تاوانبارە خوێنمژەکان لە نیشتیمان و لانەی خۆم رەهەندە کراوم و ژیانی دەستبەسەری و تەنهاییم بەسەردا سەپێنراوە. لە پێناو ئیمان و بەختەوەری و سەلامەتی ئوممەتەکەم، ژیانی هەردوو دونیام بەخت

کردووه. گەردنیان ئازاد بێت ئەوانەی ئازارم دەدەن. تەنانەت دوعاشیان لێ ناکەم. چونکە سەرەڕای ئەو سەختییانە پەیامەکانی نوور هیچ نەبێت بووەتە هۆکاری ڕزگارکردنی ئیمانی سەدان هەزار کەس یان چەند ملیۆنێك کەس. تەنانەت بە تەواویش ژمارەیان نازانم، وا دەڵێن، داواکاری دادگای ئافیۆن وتی پێنج سەد هەزار.

بەدیعوززەمان ئەو پیاوە بوو کە توانی بڵێت "ئەگەر ئیمانی ئوممەتەکەم لە سەلامەتیدا ببینم رازیم لەناو بڵێسەی دۆزەخدا بسووتێم. چونکە کە جەستەم دەسووتێت دەروونم لەوپەڕی بەختەوەریدا دەبێت" بەڵێ ئەو لە لوتکەی فیداکاری و خۆبەخشیندا بووە. ئەوە چ گەورەیی و چ لێبوردەییەکە کە تەنانەت گەردنی ئەو کەسانەشی ئازاد کردووە کە ستەمیان لێدەکرد و دەیانویست تەنانەت مافی ژیانیشی لێبستێننەوە.

بەدەمەوە هاتنی خەڵکی بەرەو ئیسلام ئەوی خۆش حاڵ دەکرد و دەبووە هۆی ئەوەی کە خەم و خەفەت و ئەو ستەمە ناڕەوایانەی لە بەرامبەریدا ئەنجام درابوون لە بیربچێتەوە. ئەو لە ژێر ڕۆشنایی تیرۆژی لە ئاسۆی پێغەمبەرانەوە هاتوودا ڕێیدەکرد. جا کێ لەو کەسە بەهێزترە کە متمانەی بە پەروەردگار هەیە و پشتی پێ بەستووە؟ جا دادگاو پۆلیس و زیندان دەتوانن چی بەرامبەر کەسێکی لەم شێوە بکەن؟

"مادەم نووری حەقیقەت کاریگەریی خۆی لەسەر ئەو دڵانە دادەنێت کە تینووی ئیمانن، نەك یەك سەعید بەڵکو هەزار سەعید فیدا بێت!

لە هەموو ئەو ئازار و چەرمەسەریانەی لە ماوەی بیست و هەشت ساڵدا چەشتوومن، لەوانەی ئەو تاڵاو و ئەشکەنجانەیان هێناوەتە ڕێم خۆشبووم.

بەرامبەر ئەوانەی کە ستەمیان لێ کردووە و لەم شار بۆ ئەو شار وەدەریان ناوە و ئەوانەی جێیان لە زیندانەکاندا بۆ ئامادە کردووە و هەموو جۆرە ستەمێکیان لێ

کردووە دەفەرموێت: " گەردنی هەموویانم ئازاد کرد."

"بە قەدەری دادپەروەریش دەڵێم، من شایستەی ئەم زلە میهرەبانییانەی تۆ بووم، چونکە ئەگەر وەکو هەرکەسێکی دی ڕێیەکی بێ زیان و سوودم هەڵبژاردایە و تەنها بیرم لە خۆم بکردایەتەوە و دەستکەوتە ماددی و مەعنەوییەکانم بەخت نەکردایە، ئەو هێزە گەورە و مەعنەوییەی لە خزمەتی ئیماندا بەدەستمان هێناوە لەدەستم دەدا.

من هەرچی دەستکەوتی ماددی و مەعنەویم هەیە بەختم کردووە، بەرگەی هەموو بەڵایەکم گرتووە، لەسەر هەموو ئەشکەنجەیەك ئارامم گرتووە. لە سایەی ئەمەشدا ڕاستیەکانی ئیمان بە هەموو لایەکدا بڵاوبوویەوە، لە سایەی ئەمەدا لە خوێندنگەی عیرفانی نووردا سەدان هەزار بەڵکو ملیۆنان کەس پێگەشتوون. لەمەودوا ئەوان لە خزمەتی ئیماندا بەردەوام دەبن و لە ڕێبازی "فیداکاری کردن بە هەستە ماددی و مەعنەویەکان" کە من گرتبوومە بەر لانادەن و بە هەموو هێزیانەوە تەنهاو تەنها لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا کار دەکەن ."[١]

١ پاشبەندی ئەمیرداغ، سەعیدی نورسی، ٦١٩

## پاڵەوانە فیداکارەکانی نوور

مامۆستا بەدیعوززەمان کە ژیانی سەراپا لە ژێر سایەی قورئان و سوننەتدا بەسەربرد، لە پەنای ئەوەی خاوەنی دڵێکی پڕ عیشق و هەیەجان بوو، مرۆڤێکی بیرمەند و داناشبوو. لە دانراوەکانیدا دیوە قووڵەکانی ئیمان و ئەخلاق و ژیانی دەروونی لە ڕوانگەی جیهانبینی ئیسلامییەوە بە سازگاری و لەوپەڕی کاریگەریدا شیکردووەتەوە. بە فراوانی هەستە مرۆڤانەکانی و وەفا و پاکیزەیی و خاکێتی و لەخۆبردوویی و خۆ بەهیچ نەزانین و دڵە دەوڵەمەندەکەیەوە یەکێکە لە کەسە ناوازەکانی سەردەم.

دیمەنی دەرەوەی چەندە سادەبوو، بیر و بزاوتی چەندان هێندە قووڵ و بینایی و جیهانبینیشی دەراسا بوو. هەردەم سەرگەرمی کێشە هاوبەشەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بوو.

وەکو وتمان مامۆستا سەعید لەپەنا ئەوەی مرۆڤێکی دانا بوو هەرواش نمایندەی بیر و بزاوتێکی پتەوی دەکرد. بەبیری بەنرخی باوەشی بۆ مرۆڤایەتی کردەوە، بە ویستێکی پۆڵایینەوە بەرامبەر تاریکایی بێبڕوایی و زوڵم و گومڕایی وەستایەوە. ئەو کۆمەڵە کەسە بەختەوەرەی شاد بوون بە دیداری ئەم پیاوە مەزنە و لە نزیکەوە لەگەڵی ماونەتەوە، پەییان بە قووڵی ناخ و دەوڵەمەندی بیری بردووە. بینەری سادەیی و وەفای بۆ دۆستانی و پاکیزەیی و خاکێتی و خۆ بەهیچ نەزانین و دڵ دەوڵەمەندی بوون. بەڵێ ئەم بینەرە بەختەوەرانە، ئەو قوتابییانەی نوورن کە هاوەڵی گیانی مامۆستامان بوون.

گرنگترین ئەو تایبەتمەندییەی کە قوتابییە یەکەمینەکانی مامۆستا نیشانیانداوە، ئیخلاس و دڵسۆزی و چاوەڕوان نەبوونیانە بۆ هیچ پاداشتێك لەو خزمەتی ئیمان و قورئانەدا کە شانیان دابوویەبەر و ژیانیان بۆ تەرخانکردبوو.

ئەم کەڵە پیاوە مەردانە کە هەرگیز نەبووە لەژێر لێویشەوە ناوی خۆیان بێنن و بڵێن "من ئەم خزمەتەم ئەنجام داوە" بەهۆی پاکیزەبوونیان لە ڕیا و خۆپەرستی و هەڵپەی دەستکەوتی ماددی. وە بەهۆی سەرڕێژبوونیان لە ئیخلاس، هەوڵەکانیان تابڵێی کاریگەر و بەسوود دەردەچوون و خزمەتەکەیان بە ویستی خوا بەری شیرینی سەرکەوتنی دەگرت.

تەنها بە هێزی مەعنەوییان واتە بە هێزی ئیخلاسەکەیان هەموو سەختییەکانیان تێدەپەڕاند و بەسەر دوژمنەکانیاندا سەردەکەوتن.

پاڵەوانە یەکەمینەکانی نوور، بۆ پاراستنی شیرازەی کۆمەڵگا مامۆستا سەعیدیان کردبووە پێشەنگ و تۆوی مامەڵەکردنی ئەرێنییان لەناخیاندا ناشتبوو.

هەرگیز زیانیان بەکەس نەدەگەیاند و هیچ شتێکیان لە کەس داوا نەدەکرد و تاکە ئامانجی ژیانیان خزمەتکردنی ئیمان و قورئان بووە لەڕێی پەیامەکانی نوورەوە، بەڵێ ئەوان خۆیانیان سفرکردبوویەوە. لای ئەوان هەرکەسێك بیویستایە خزمەتی ئاینەکەی بکات دەبوو وەك پەرستشێکی بێ خەوش و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەنجامیبدایە. بۆیە بۆ پاراستنی ئیخلاسی کارەکە دەبوو هیچ جۆرە مەبەستێکی دونیایی یاخود ئارەزوویەکی مەقام و شان و شکۆ و ناوبانگ تێکەڵ بە نییەتی پاکی خزمەتکردن نەکرێت.

بەڵێ، یەکەمین تۆوەکانی ئەم خزمەتە ئیمانی و قورئانییەی ئێستا بەهەموو دونیادا بڵاوبووەتەوە و بازنەیەکی نوورانی پێکهێناوە لەلایەن ئەو چەند کەسە کەمە خاوەن ڕۆحە بێناونیشانە مەزنانەوە چێندراوە کە ژیانی زووتێپەڕی دونیایان بە سووك تەماشاکردووە. ئیخلاسەکەی ئەوان و چاوەڕوان نەبوونەکەیان بۆ سوودی کەسی و بەخشینەوەی ماڵ و سامانەکانیان بە وێنەی ئاوی خێراو بەری ئەم خزمەتە جوانانەی گرت کە ئێستا بوونەتە گوڵی یەخەی مرۆڤایەتی.

سەرچاوە و کانگای هێزی ئەم شەپۆلی هیجرەتەی ئەمڕۆ بەهەرچوارلای دونیادا دەستیپێکردووە، هیچ نییە جگە لەو گوڕ و تین و هێزە سەنتەرییەی قوتابییە سەرەتاییەکانی نوور. لە پشتی ئەم هێزەشەوە مامۆستا سەعید هەبوو کە تەنانەت دەنکە جۆیەکیشی لە کەس قەبووڵ نەدەکرد و قوتابییە ناوازەکانی وەك مامۆستا خولوسی یەحیاگیل، خوسرەو ئاڵتنباشاك، حافظ عەلی، تاهیری موتلو، زوبەیر گوندوزئالپ، جەیلان چاڵشکان، موستەفا سونگور، بایرام یوکسەل، حوسنو بایرام، عەبدوڵلا یەهین و چەندی دیکە هەبوون.

چواردەوری بەدیعوززەمان هەر لە قوتابی هەشت ساڵە تا هەشتا ساڵان بەهەموو چین و توێژێك دەورەدرابوو، بیری بەدیعوززەمان دەربارەی خزمەتی ئیمانیی و قورئانی خاوەنی قوڵاییەکی دەرئاسابوو، ئەوانەش وەك پەروانە دەورەیاندابوو خاوەنی حاڵێکی وەهابوون کە پەسنی لەتوانا بەدەرە. سەرباری هەموو سەختییەك دڵە بەئیمان تینووەکان بەرەولای دەهاتن و چۆکی خوێندکارییان دادەدا. ئەم کۆمەڵە کەسە نوورانییە دڵ ناسوودەیەی لە ڕێبازی خزمەتی پەیامەکانی نووردا بەرێکەوتبوون هەروەك تیشکێك لە چەرخی بەختەوەری ژیانی ڕووناك کردبێتنەوە، ژیانیان لەژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و شوێنپێی پێغەمبەر و هاوەڵەکانیدا بووە.

ئەم ڕۆڵە دڵسۆز و فیداکارانەی ئەنادۆڵ بە متمانەیەکی تەواوی هەڵقوڵا و دڵدان بە بیرێکی نەمر، لەدەوری ئەم پیاوە بەختیارە کۆبوونەوە، ئەم پیاوەی کە وەك قارەمانێکی خزمەت لە چەندین دەورانی جیاوازدا ژیانی بەسەربردووە و لەسەردەمێکدا کە زۆر کەسی لە بیر مێژوو بردووەتەوە توانیویەتی لەسەر پێ بووەستێت و ناوی خۆی بۆ هەمیشە لەسەر پەڕەی مێژوو بنەخشێنێت. ئەم دەستە قوتابییە بەختیارە کە هەرگیز سڵیان لە هیچ فیداکارییەکی ماددی و مەعنەوی نەکردووەتەوە، بە هێزێکی پۆڵایین و جەسوورییەکی لەبن نەهاتووی لە ئیمان هەڵقوڵاوەوە لەبەرامبەر هەموو ئەو مامەڵە کاڵ و سوێر و سەختانەوە وەستاونەتەوە

کە لەگەڵ مامۆستا ئەم زیندان بۆ ئەو زیندان پێکراو و تاپەتی سێدارە براوەکەیان بەسەریان هاتووە، وە هەرگیز بۆ تەنها ساتێکیش لە خزمەت کردن دوانەکەوتوون و وچانیان نەداوە.

## فەرمانبەرییەکە گرانە و بەرپرسیارییەتییەکەش گەورەیە

ڕاوچییەکان باڵندە بەستەزمانەکەیان بریندارکرد ئەویش بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەربازبوونی دەدا، باڵندەکە لە فڕین بەردەوام بوو، ڕاوچییەکانیش بێ بەزەییانە دوای دەکەوتن، لە کوێ خۆی بشاردایەتەوە دەیاندۆزیەوە، لەسەر چ لقێك بنیشتایەتەوە نیشانیان لێدەگرت.

دڵە چکۆلەی باڵندەکە خێرا خێرا لێیدەدا، هەر بیویستایە کەمێك پشووبدات یەکسەر لوولەی تفەنگی ئاراستە دەکرا، ڕاوچییەکان نەیاندەویست باڵندەکە لە دەستیان دەربازی ببێت، بۆیە بەهەموو شێوەیەك دوای باڵندەکە دەکەوتن. سۆز لە دڵیاندا نەمابوو، بێچارەیی و بێدەسەڵاتی و لاوازی باڵندەکەیان بە خەیاڵدا نەدەهات، نیازیان وابوو تا نەیکوژن وازی لێ نەهێنن، ئیترلەو دەمەدا زەوی ڕشانەوەی مردنی دەهات و فیشەکەکان بە هەموو لایەکدا دەتەقێنران و بۆنی باروت بەناوچەکەدا بڵاودەبوویەوە.

باڵندە لاوازەکە توانای فڕینی نەمابوو، بۆ دوایەمین جاری دەستی بە فڕین کردەوە و ئەمجارەیان لە دوورەوە کۆمەڵێکی بینی کە شێخەکەیان لە نێوەندیاندا دانیشتبوو، موریدەکانیشی بە چواردەوریدا حاڵیان لێهاتبوو و زیکریان دەکرد، هەرچۆنێك بێت بە زۆر خۆی گەیاندە دانیشتنەکەی ئەوان، بەهۆی کاریگەری ترسەکەی ناخیشییەوە بەیەك چرکە هەر وەکو چۆن تیر لە کەمان دەردەچێت بەوشێوەیە خۆی کرد بە ژێر عەباکەی شێخەکەدا، متمانەی بە شوێنەکەی هەبوو،

باوەڕی وابوو کە شوێنێکی ئارامی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە.

لەم کاتەدا شێخ بەهۆی جووڵەی شتێك لە خوار سنگییەوە سڵەمییەوە و یەکسەر دەستی برد بۆ شوێنی جوڵەکە، بۆیە باڵندەکەش کە گیانی هاتبووە سەر لێوی هەر بەم دەست لێدانە گیانی دەرچوو.

لەو دونیا کە دادگایی گەورە دەستیپێکرد، باڵندەکە سکاڵای لە دژی شێخەکە کرد، بەڵام لەبەرئەوەی شێخەکە بە ویست و زانینی خۆی کارەکەی ئەنجامنەدابوو بۆیە بە بەرپرسیار دانەنرا، تەنانەت ئەو کاتێ کە بینی باڵندەکە گیانی دەرچووە زۆر خەمبار بوو.

پێش ئەوەی بە یەکجاری گیانی دەربچێت داوا لە باڵندەکە کرا دوا وتەی بڵێت :

باڵندەکەش وتی، داوایەکم هەیە، من متمانەم بەو عەبا و مێزەرە هەبوو بۆیە خۆمم لە ژێردا شاردەوە، لەمەودوا بۆ ئەوەی ئەو متمانەیە بە خۆڕایی دەرنەچێت و کەسی تریش وەکو منی بەسەر نەیەت دەمەوێت چیتر کەس ئەو عەبایە لەبەر نەکات.

نەوەکانمان، بە شوێن پەناگەیەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی خۆیان لە تەڵەی ڕاوچییە بێ بەزەییەکان بپارێزن، مرۆڤایەتی گەورە لە ئێستادا کەوتووەتە نێو لیتاوی گوناهەوە، لە پەلەقاژێدایە و دەگری، ئەو گەنجانەی کە دەستی یارمەتییان بۆ درێژنەکراوە و بەهۆی کۆمای ماددە بێهۆشکەرەکانەوە دەمرن و ئەو منداڵانەی کە ناتوانن عیففەتیان بپارێزن مرۆڤایەتی لێیان بەرپرسیارە.

جا ئەمانە لە هەر وڵات و میللەت و ڕەنگێك بن، نەخۆشخانەکان و زیندانەکان و کۆڵانەکان و گۆڕستانەکان پڕن لە هاواری ئەم مرۆڤانە.

فەرمانبەرییەکە گرانە و بەرپرسیارییەتییەکەش گەورەیە، کەس مافی ئەوەی

نییە هیوای ئەوانە ببڕێت کە لەم ئاگرە هەڵهاتوون و متمانەیان پێکردووین و دەستیان بۆ درێژکردووین تاوەکو یارمەتییان بدەین، مادام ناتوانین عەبای ئیمان لەبەر خۆمان دابکەنین، دەی پێویستە ئەوپەڕی لێبڕان نیشان بدەین بۆ پێدانی مافی ئەو عەبایە.

## هەتا ئێستا لەکوێ بوون!
## خزمەتکارێکی قورئان دەیگێڕێتەوە

ساڵی ١٩٩٤ بوو، لە داوەتنامەیەکی هاوڕێیانم دواکەوتبووم، بۆیە بەمەبەستی داوای لێبوردن کردن و پۆزش هێنانەوە وتم، چووم بۆ سەرەخۆشی لە کەسێکی نزیکی هاوڕێیەکم، ڕووداوەکە مردنێکی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، ئەو پیاوە کە مردووە پێش ئەوەی گیانی دەربچێت لە کچ و کوڕ و خزمەکانییەوە چوار تەلەفۆنی بۆ دێت.

پیاوەکە لەم پەیوەندییە یەك لە دوای یەکانەدا سەری زۆر دەسووڕمێت، هەرچەندە لە پەیوەندییەکاندا پێیان دەڵێت باشم، بەڵام لەناخەوە هەست بە نامۆییەك لە پەیوەندییەکاندا دەکات، هەر پاش نیوکاتژمێرێك لەم تەلەفۆنانە و هەر لەو شوێنەی کە لێی دانیشتووە پیاوەکە گیانی دەردەچێت.

پاش ئەوەی ئەم ڕووداوە سەرنجڕاکێشەم گێڕایەوە، گەنجێك کە یەکەم جارمبوو لە دانیشتنەکاندا بیبینم وتی "گەر یارمەتیم بدەن منیش ڕووداوێکی هاوشێوەی ئەمەتان بۆ دەگێڕمەوە"، ئێمەش ڕەزامەندیمان نیشانداو و ئەویش دەستی بە گێڕانەوە کرد:

ئەم گەرموگوڕی و دۆستایەتییە جوانە و ئەم دانیشتن و دیدارانە زۆر کاریان

لەمن کردووە، ماوەیەکی کەمە یەکتریمان ناسیوە بەڵام من خەفەت لەوەدەخۆم کە" تاوەکو ئەمڕۆ بۆچی ئێوەم نەدۆزیوەتەوە."وەك دەبینن من قۆڵێکم نییە، ئێستا ڕووداوێکی هاتووچۆی هاوشێوەی ئەوەی پێش کەمێك باستان کرد دەگێڕمەوە: دە ڕۆژی مابوو بۆ هاوسەرگیری کردنمان لەگەڵ دەستگیرانەکەم ئیپێك، ئەوڕۆژە ئەوم برد بۆ باڕێك، پاش کەمێك هاوڕێیەکم (موراد) کە لە هەمان کاتدا هاوناویشم بوو لەگەڵ دوو کچی هاوڕێیدا هاتن بۆلامان.

دوای ئەوەی بەخێرهاتنم لێکردن، لەبەرئەوەی هیچ چاوەڕوانی ئەوانم نەدەکرد لێمپرسین، بۆچی هاتوون، وتیان بۆ"مردن هاتووین" و دەستیان کرد بە پێکەنین ئێمەش هەر بۆ ڕابواردن وتمان هەروەها ئێمەش. دواتر هاوڕێیەکی ترم کە ناوی هاکان بوو لەگەڵ دوو کچی هاوڕێی دیکەیدا هاتن، لەبەر ئەوەی لەو کاتژمێرەدا و بەوشێوەیە پێشتر لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەمدا کۆنەبووبوومەوە بەهەمان شێوە لە ئەوانیشم پرسی، بۆچی هاتوون؟ ئەوانیش هەرچەندە ئاگاداری وەڵامەکەی هاوڕێکانی پێشووم نەبوون وتیان "بۆ مردن هاتووین."

دوای خواردنەوەی شەرابەکانمان لە باڕەکە چووینە دەرەوە، ئۆتۆمبێلەکەی خۆم دایە هاکان و ئێمەش سواری ئۆتۆمبێلەکەی موراد بووین.

ئەو شەوە لە ئیپێکی دەستگیرانمدا نامۆییەك بەدیدەکرا، من دەمویست لە کوشنەکەی دواوە لای پەنجەرەکەوە دابنیشم ئەویش بێتە نێوان من و کچەکەی دیکەوە، چونکە موراد ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی و یەکێك لە هاوڕێ کچەکانی لە پێشەوە دانیشتبوو و ئەویتریشیان لە دواوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی زۆر داوام لە ئیپێك کرد لە ناوەڕاستدا دابنیشێت بەڵام قەبووڵی نەکرد، دەیویست من دابنیشم و منیش بە ناچاری دانیشتم.

دوای کەمێك لە بەڕێکەوتنمان، تووشی ڕووداوێکی هاتووچۆی زۆر سەخت

بووین، موراد و کچەکەی تەنیشتم و ئیپێك هەر لەوێدا مردن، منیش بێ هۆش کەوتبووم و قۆڵێکم پەڕیبوو و سکیشم هەڵەتەقیبوو.

ئەو کچەی کە لە پێشەوە دانیشتبوو بەهەرشێوەیەك بێت ڕزگاریبووبوو، وەك ئەوەی بڵێیت لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیوە و بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەك ڕۆیشتووە. پۆلیس کە هاتبون دیمەنەکانیان بینیبوو وایان زانیبوو هەموومان مردووین و هەموومانیان بردبوو بۆ مەیتخانە، دواتر بۆ جێگیرکردنی ناوەکان هاتنەوە بۆ مەیتخانە کە دەرگاکەیان کردەوە من دەجووڵامەوە و هاوارم دەکرد، لە ترسا پۆلیسی بەردەرگاکە میلی چەکەکەی هێنایەوە و بوورایەوە کەوتە سەرزەوی، ئەم پۆلیسە دوای چەند مانگێك لە چارەسەری دەروونی لەبەر خراپی باری تەندروستی خانەنشین کرا.

منیان خێرا برد بۆ چارەسەر، دوای چەندین چارەسەر لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات هاتمەوە سەرخۆم، هاوشێوەی ئێمەش هاکان و هاوڕێکانم تووشی ڕووداوی هاتووچۆ بووبوون و مردن، واتە لە کۆتاییدا تەنها دوو کەس مابوونەوە من و ئەو کچەی لە پێشەوە لەگەڵ ئێمەدا سەرکەوتبوو.

کاتێك موراد ئەمانەی دەگێڕایەوە وەکو ئەوە وابوو کە هەناسەمان لێبڕابێت، زۆر بە ئاگاییەوە گوێمان گرتبوو، موراد بابەتەکەی بە ڕێچکەیەکی جیاوازدا برد و وتی"دواتر ئەوەم بۆ دەرکەوت کە مورادی هاوڕێم ١٠-١٥ ڕۆژ پێش ئەوەی بمرێت گۆڕێکی ئامادە کردبوو تەنانەت مامۆستایەکیشی بانگکردبوو پێی ووتبوو"قورئان بخوێنە و دوعا بکە، مامۆستاکەش پێی ووتبوو" ئێرە گۆڕێکی چۆڵە من دوعا بۆ کێ بکەم؟، موردایش پێی ووتبوو تۆ دوعا بکە بەم نزیکانە کەسێك دەبێت کە بێتە ئێرە."

پاش ڕووداوی هاتووچۆکە لەو گۆڕەی کە ئامادەی کردبوو نێژرا، ئیپێکی دەستگیرانیشم بۆ دوایەمین جار پێش ئەوەی لەگەڵ مندا بچێتە دەرەوە هەموو

جلوبەرگەکانی کردبووە باوڵ و جانتاکانەوە و بە تێبینییەك لەسەری نووسیبوو: ''ئەگەر من نەهاتمەوە، ئەمانە بدەنە هەژاران و دەستەی پاراستنی منداڵان''، ئەو ڕۆژە تێگەیشتم کە دەستگیرانەکەم هەستی بە ڕووداوەکە کردبوو، لەبەر ئەوەی کە منیشی زۆر خۆشدەویست بۆیە بۆ پاراستنی من داوای کرد کە لە ناوەڕاستدا دابنیشم، هەرگیز نەمدیبوو بەو شێوەیە پێداگری لەسەر شتێك بکات .

کاتێك موراد ئەمانەی دەگێڕایەوە چاوەکانی ئەسرینی دەڕشت ئینجا سەری هەڵبڕی و پرسیارێکی کرد :ئەو باوەڕی بە خوا هەبوو، شەرابی نەدەخواردەوە، نارەزووی لە کاری چاکە بوو، سەر ڕاستبوو، فیدارکاربوو، بەڵام بەهۆی ئەو دۆخەی کە تێیدا گەورەبووبوو دەربارەی ئاین تاکە شتێکیشی نەدەزانی، تۆ بڵێی خوا لێی خۆشبێت؟

ئێمەش بەمەبەستی دڵدانەوەی ووتمان، بۆ کەسێکی لەم شێوەیە کە لەماوەی هاوشێوەی فەترەت و لە نەبوون و نامۆییدا گەورە بووبێت، سۆز و بەزەیی خوا فراوانە و هیچ کاتێکیش بەرامبەر خوا هیوا براو نابین .

موراد دواتر دەربارەی خۆی ئەمانەی ووت، "من باوەڕم بە خوا هەیە، ساڵێکە هیچ شەرابم نەخواردووەتەوە، بەڵام دوور لە ئاین ژیانم بردووەتە سەر، یەکێکیش نەبووە دەستم بگرێت، ئایا خوا لە منیش خۆش دەبێ؟، ئێمەش دووبارە بە باسکردنی فراوانی سۆز و بەزەیی خوا دڵماندایەوە، لەو کاتەدا چاوەکانی موراد دەگەشایەوە و پێی وتین"من نامەوێت لەئێوە جیاببمەوە، گەر ڕێگەم پێبدەن من دەمەوێت بەشداری هەموو دیدارەکانتان بم"، ئێمەش ووتمان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە چاوەڕێت دەکەین .

هەفتەیەك دواتر موراد ویستبووی مانشێتی ئەو ڕۆژنامانەی کە لەسەر ڕووداوەکەی ئەوان نووسیبوویان بکاتە دۆسییەك و بۆمان بهێنێت، بەڵام بەهۆی ئەوەی ڕووداوی هاتووچۆکەی تووشی پەرکەمی کردبوو، پەرکەم لێیدەدات.

ئیسماعیلی هاوڕێی بەپەلە دەیگەیەنێتە ماڵی خۆیان، دوای چاکبوونەوەشی موراد تەلەفۆنی بۆ هاوڕێیان کردبوو و تێیدا پۆزشی بۆ نەهاتنەکەی هێنابووەوە، پاش هەفتەیەکی تر بەهەمان شێوە کاتێك موراد لە گەرماودا دەبێت پەرکەم لێی دەدات و دەکەوێت و سەری زۆر بە توندی دەکێشێت بە زەویدا و یەکسەر دەگەیەنرێتە نەخۆشخانە، کە چووین بۆ سەردانی ئێمەی نەدەناسییەوە، دوای چەند ڕۆژێکیش کۆچی دواییکرد.

کچ و کوڕانی شەقامی بەغداد و هەموو هاوڕێیانی بۆ ئەم گەنجە خۆشەویستە دەگریان، کە گەیشتینە لای تەرمەکەی خۆمان پێ ناساندن، هەموو وەکو پەروانە چواردەوریان داین و پێیان وتین "موراد دوای ئەوەی ئێوەی ناسی، هات بۆلامان وتی هاوڕێیان کۆمەڵێك مرۆڤی زۆر پاکم ناسیوە، لەگەڵ ئەوان یەك ببینن با ڕێگەیەکی باش بدۆزنەوە، ئەم ڕێگەیەی کە ئێمە گرتوومانە ڕێگە نییە، من دەمەوێت فێری بنەماکانی ئیسلام بم و پێوەی بژیم، بە پێچەوانەوە هەموو شتێکی تر فانی و بەتاڵە، زۆر ئارەزووی ئەوەی دەکرد لەگەڵتانا دابنیشین و قسەمان بۆ بکەن، بەڵام تەمەنی بەشی ئەوەی نەکرد کە بەیەکترمان بناسێنێت .

تێگەیشتین موراد ئەو کاتەی خوای گەورە پێیبەخشیبوو زۆر بە باشی بەکاریدەهێنا، پاشان چووین بۆ سەرەخۆشی لە ماڵەوەیان لەوێ دایك و باوك و خوشکەکەی پێیان وتین "موراد هەمیشە باسی ئێوەی دەکرد، ئێوەی زۆر خۆش دەویست."

لە ڕۆژی ناشتنەکەی مورادا گەنجێکی خوێن گەرمی لێبوو کە سەری بە پەڕۆیەکی سپی بەستبوو و وتی مورادم زۆرخۆش دەویست کاتێك کە کۆچی دوای ئەوم بیست"ئۆتۆمبێلەکەم کێشا بە دیوارێکدا لەبەرئەوەیە سەرم برینداره، بەڵام

دەمەوێت شتێك بە ئێوە بڵێم، ئایا یەکترناسینمان لەگەڵ ئێوە هەردەبوو لە ڕێگەی مردنی مورادەوە بووایە؟ بۆچی ئێمەش نابەنە لای خۆتان"، گەنجەکە بەم شێوەیە سەرزەنشتکردنی خۆی دەردەبڕی.

دواتر زانیمان موراد گەنجێکی زۆر بە جەرگ بووە و دوای مردنی ئیپێکیش بەجەرگتر بووە، ئێستاش لە گۆڕساتنی کارەجا ئەحمەد لەو گۆڕەی پێش مردنی لە تەنیشت ئیپێکی دەستگیرانییەوە هەڵیکەندبوو نێژراوە.

## "ئەگەر ئێوە ببنە پشتیوانی بەرنامەکەی خوا، ئەویش یارمەتیدەرتان دەبێت"

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: "هەنگاوەکانتان بە دروستی بنێن، خاوەندارێتی دڵەکانتان بگرنە ئەستۆ، ئامانجی دروستبوونتان لە بیرمەکەن، بە وەفابن لەگەڵ پەیمانەکانتاندا" (آل عمران، ١٢٠) بەڵێ، پەیمان و ڕێککەوتنێك هەیە لە نێوان ئێمە و خوای گەورەدا، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت" گەر ئەو پەیمانەی بە منتان داوە بیهێننە جێی خۆی و جێبەجێی بکەن ئەوا منیش ئەو بەڵێنەی کە بە ئێوەم دابوو بەجێیدەهێنم، تەنها لە خوای گەورە بترسن"، ئەو پەیمانەی کە دراوە پەیمان و بەڵێنی ناسین و ناساندن و پەرستشی شایەن بەوە، ئەگەر ئەم پەیمانە ببرێتە سەر ئەوا خوای گەورەش لە بەندەکانی خۆش دەبێت و بە گەورەیی و میهرەبانیی خۆی مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و بەهەشتەکەی خۆشی پێ لوتف دەفەرمووێت.

ڕێگایەکی تری هاوشێوە هەیە کە دەتوانین لە ڕێیەوە دڵنیابین لە دروستی هەنگاوەکانمان، خوای گەورەش ئەم ڕاستییە مەزنەمان لە پایەمە گەورەکەیدا بەم شێوەیە بۆ دەردەبڕێت (ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتی

خوا بدەن خواش یارمەتی ئێوە دەدات و لە مەیدانی جەنگدا پێتان قایم دەکات و چەسپاو دەکات)(محمد،٤٧)، هیچ کەسێك خوا سەرناخات ئەو پێویستی بە یارمەتی و سەرخستنی کەس نییە، سەرخستنی ئەو واتە خزمەتکردن بە ئاینەکەی خوای گەورە و کارکردن لە پێناو بەرزکردنەوەی ناو پیرۆزی ئەودا، ئەوانەی لەم دونیا دەبنە خاوەنی ئاینەکەی رەحمان، خوای گەورەش لەو دونیا دەبێتە خاوەنیان، ئەوانەی کە پێیەکانیان لە شوێنێکی دروست داناوە، ئەوا خوای گەورەش چوونە نێوگۆڕیان بە ئیمانەوە پێدەبەخشێت. ئەم پاداشتە بۆ هەردوولا بەردەستە، هەم ئەوەی کە پەیامەکە دەگەیەنێت هەم ئەوەی پەیامەکەی پێ دەگەیەنرێت، چەندین خەڵاتی مەزن لە دوارۆژدا چاوەڕێیان دەکات.

نموونەیەکی زیندووش بۆ ئەم باسە کەسێکە کەناوی (سەفا)یە و لە ئاسیای ناوەڕاست کاری کردووە و لەهەمان کاتیشدا گەنجێکی خوێندکاری زانکۆیە لەوێ و بۆمان دەگێڕێتەوە:

- هاوڕێیەکمان هەبوو لە رێگەی پاڵپشتی دارایی دەوڵەتەوە مافی خوێندنی بەدەست هێنابوو، لەهەمان بەش و هەمان پۆل دەمانخوێند، دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی بوو، لێرە لە بەشێکی ناوخۆیی کە سەر بە زانکۆکە بوو دەمایەوە، کاتێك لە پشووی هاویندا گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی و نێو ماڵ و خێزانی، باوکی سەرنج دەدات کوڕەکەی وەك جاران نەماوە، بۆیە پێی دەڵێت'کوڕم، تۆ هیچ بەهایەکت بەلاوە گرنگ نەماوە، جارێکی دی من تۆ بۆ ئەوێ نانێرمەوە، هاوڕێکەمان سووربوو لەسەر گەڕانەوەی بۆ زانکۆ، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی باوکی ڕازی بکات، دوای چەند جارێك پێداگری لەلایەن هاوڕێکەمانەوە و کڕوزانەوە و پارانەوەی لەباوکی، باوکی ڕازی دەبێت بەڵام بەمەرجێك، مەرجەکەشی ئەوەیە کە"دەبێت لەگەڵ کەسانی دەست و داوێن پاکدا هەڵسوکەوت بکات". هاوڕێکەشمان مەرجەکەی باوکی قەبووڵدەکات و بەڵێنی پێدەدات.

لەسەرەتای ساڵی خوێندندا بەهۆی ئەوەی لە یەك گروپدا بووین، منی دۆزییەوە و هات بۆ لام و باسی حاڵی خۆی دەکرد وەك ئەوەی بپاڕێتەوە دەیوت"بۆ ئەوەی بەردەوام بم لە خوێندن دەبێت لەگەڵ ئێوە بمێنمەوە، ئەمە مەرجی باوکمە ئەگەر وا نەبێت باوکم ناهێڵێت لێرە بخوێنم"، منیش وتم: "لەوانەیە بەڵام پێویستە ڕاوێژ بە هاوەڵانم بکەم"، خێرا لەگەڵ هاوڕێیانمدا باسم کرد، بەڵام لەبەرئەوەی ناوی بەباشی بڵاونەبووبووەوە هیچ کامیان بە گەرمی لێیان نەدەڕوانی و دەیانوت"ناومان خراپ دەکات"، هەرچەندێك داوام کرد نەمتوانی باوەڕیان پێبهێنم.

ئەو هەموو ڕۆژێك لە زانکۆ دەیگرتم و دەیپرسی چیبوو؟، منیش دەمووت قسەمان لەسەرکردووە و قسەشی لەسەردەکەینەوە، بەمشێوەیە خۆم دەپەڕاندەوە دەمویست خۆی تێبگات، بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر داواکارییەکەی، هەر بەردەوام بووم لە هەوڵدان بۆ ڕازیکردنی هاوڕێکانم تا لە کۆتاییدا وتیان"ئەگەر تۆ نارەزووتە ئەوا لەگەڵ ئەودا بەیەکەوە بمێننەوە"، منیش ئەم داوایام قەبووڵکرد و خانویەکم بە کرێ گرت و لەگەڵ ئەو هاوڕێیەو چەند هاوڕێیەکی تردا پێکەوە چووینە ناوی.

زۆری نەخایاند هەڵسوکەوتی برادەرەکەمان گۆڕا، وردە وردە وازی لە خووە خراپ و ناشرینەکان هێنا، دوای ماوەیەکی دی بە تەواوی گۆڕا، دڵ و گیان و ڕوخساری ڕۆشنبوونەوە و هەرکەسێك بهاتایە بۆ سەردانمان خۆشەویستی ئەم هاوڕێیەمان لە دڵیدا ڕەگی دادەکوتا.

ڕۆژێکیان لە ناکاو باری تەندروستی تێکچوو و بردمان بۆ نەخۆشخانە، دکتۆر وتی"زۆر دواکەوتوون"زراوی تەقیوە و دیارە بۆ ماوەیەکی زۆر هەستی پێنەکردووە پێکهاتەکانی ناو زراوی بە ئەندامەکانی ناوەوەی لەشیدا بڵاوبووەتەوە و بەتەواوی زیانی پێگەیاندوون، گەر دەتانەوێت کەسوکاری بانگ بکەن با بۆ دوایین

جار بیبینن، خێرا پەیوەندیمانکرد بە خێزانەکەیەوە، ئەوەبوو باوکیشی لە دوایین ساتەکاندا گەیشت.

چەند مانگێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی شەوێکیان لە خەومدا ئەو هاوڕێیەمانم بینی، لەشوێنێك دانیشتبووین چامان دەخواردەوە و قسەمان دەکرد، من لە نێوان ئەو و برادەرێکی دیکەدا دانیشتبووم، لێم پرسی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا کردیت؟ وتی"منیان وەکو یەکێك لە ئێوە هەژمارکرد، لێرە مرۆڤانی وەکو ئێوە ناخەنە دۆزەخەوە، لەبەرئەوە منیشیان خستە بەهەشتەوە"، لەم کاتەدا بەدەم قوڵپی گریانەوە بە خەبەر هاتم و دەگریام، بۆ چەندین کاتژمێر نەمتوانی لەژێر کاریگەری ئەو خەوە دەربچم .

مامۆستا بەدیعوززەمان موژدەی ئەوەمان پێدەدات کە ئینشائەڵلا ئەوانەی لەم سەردەمەدا خزمەتی ئیمان و قورئان دەکەن ڕزگاریان دەبێت و بە"ئەهلی ئیمان و ڕزگاربووەکان"ئاماژەیان بۆ دەکات.

پەروەدگار لە توانایدایە ژمارەی کەمی خواویستان و ڕێی خوازیارانی ئەو زیاد بکات، بەخششی فراوانە و کەرەمی بێ پایانە و دەرگاری ڕەحمەتی ئەو لە بەردەم لە دەرگادەرانیدا هەمیشە کراوەیە، تەنها هێندە هەیە هەموومان کە لە کاروانی نەمری و ڕێبازی نورینی حەق و حەقیقەتداین جیانەبینەوە.

## ئایا بۆ خزمەت کردنی ئاین پێویست بە مۆڵەت وەرگرتن لە دایك و باوك دەكات؟

زیندووترین نموونە دەربارەی ئەم بابەتە سەردارمان حەزرەتی عەلییە (خوا لێی ڕازیبێت)، ڕۆژانی سەرەتای پێغەمبەرایەتی بوو، پیغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) لەسەر بێت لەگەڵ حەزرەتی خەدیجەدا نوێژی دەکرد، حەزرەتی عەلی کە لەوکاتەدا هێشتا تەمەنی ١٥ ساڵان بوو زۆر بەپەرۆشەوە لەو نوێژەی ئەوانی دەڕوانی، دوای تەواوبوونی نوێژەکەیان بەتامەزرۆییەوە پرسیاریکرد و وتی "ئەمەی کردتان چیبوو؟."

پێغەمبەرمان فەرمووی "ئەی عەلی ئەمە ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە و لەلای پەسەندە، بانگهێشتی تۆ دەکەم بۆ لای ئەو خوایەی کە تاك و تەنهایە و خۆم بە دووردەگرم لە پەرستن و وابەستەبوون بەو بتانەی کە نە سوود، نە زیانیان بۆ مرۆڤ هەیە."

حەزرەتی عەلی بۆ چەند ساتێك وەستا و پاشان وتی: "ئەمە ئەو شتەیە هەتاوەکو ئێستا بەرگوێم نەکەوتووە، تاوەکو مۆڵەت لە باوکم وەرنەگرم هیچ شتێك ناکەم."

ئەو ڕۆژە ئەم بابەتەی لای هیچ کەس نەورووژاند، ئەو شەوەی بە بیرکردنەوە بەسەربرد، لەگەڵ گزنگی بەیاندا نوورێك لە دڵیدا گەشایەوە و یەکسەر خۆی گەیاندە حزووری پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) و وتی "کاتێ کە خوا منی بەدیهێنا پرسی بە ئەبوتالیبی باوکم نەکرد، من بۆچی بۆ باوەڕهێنان بە خوا و پەرستشی ئەو بچم ڕاوێژ بەویکەم و مۆڵەتی وەرگرم؟"[1]، بەمشێوەیەش شەرەفی موسوڵمانبوونی وەك یەکەم منداڵی موسوڵمان پێبەخشرا.

١ ابن هشام، السيرة، ٢٦٤

بەڵێ حەزرەتی عەلی بانگهێشتکرابوو تا بەدیهێنەری خۆی بناسێت، ئیمانی پێبهێنێت و بەندایەتی بۆ بکات، ئیدی واتایەك نەبوو بۆ مۆڵەت خواستن لە باوکی. لەبەرئەوە بنەڕەتیترین شت بۆ مرۆڤ خزمەتکردنی ئاینەکەیەتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێت خۆی بخاتە دۆخێکی وەهاوە کە ئازاری دڵی دایك و باوکی بدات و بیانڕەنجێنێت.

ئەگەر دایك و باوکێك بڵێن"خزمەتی ئیمان و قورئان مەکە"واتە فەرمانیان بە بێ فەرمانی پەروەردگار کرد ئەوا تەنها لەو بابەتەدا گوێڕایەڵی ئەوان ناکرێت. خوای گەورەش دەفەرموێت: "ئەگەر دایك و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ بەڵگە و زانیاریەك هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت گوێڕایەڵییان مەکە، لە دونیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان لە هەموو بارو دۆخێکدا، شوێنی ڕێبازی ئەوانە بکەوە کە بۆلای من گەڕاونەتەوە، لەوەوداو گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، جا هەواڵتان دەدەمێ بەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد"(لقمان، ئایەتی ١٥) بەپێی ڕێنماییەکانی ئایەتە پیرۆزەکەش دەبێت مامەڵەیەکی باشیان لەگەڵدا بکرێت.

بەڵێ دەبێت هەمیشە دڵی دایك و باوك ڕابگیرێت و نابێت بڕەنجێنرێن، بەڵام لە بابەتی بێ فەرمانیکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەدا نابێت گوێڕایەڵییان بکرێت، ئەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی دایك و باوکیان دەکەن لەو بابەتانەدا کە پێویستە گوێڕایەڵی بکرێن، ئەوا بەردەوام بەرەکەت لە ژیان و زانست و مامەڵەکانیاندا بەدی دەکرێت، خۆ ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت ئەوا خوای گەورە لە داهاتوودا تاجی ڕێزلێنانیان دەنێتە سەر، ئەمەش ڕاستییەکە لە ڕێگەی چەندان ئەزموونەوە پشتڕاستکراوەتەوە و چەسپێنراوە.

ئەو باوەڕدارانەی لەڕێگەی ئەودا خزمەت دەکەن دەبێت لە هۆش و ئاگایی

ئەوەداین کە شانیان داوەتە بەر خزمەتێکی زۆر گەورە و گرنگ، داوا بکەین لە خوای گەورە شەوق و جۆش و خرۆشی ئەو هاوڕێیانەمان کە لەم ڕێگەدا خزمەت دەکەن زیاتر و زیاتر بکات و شەرەفمەندی خزمەتکردن بە ئێمەش ببەخشێت.

چونکە پاش ئەوەی بەدەم عیشق و شەوق و خرۆشان بۆ کاری خزمەتکردن دەگەینە ئاستێکی دیار، گەر ئیخلاس و لێبڕان لە نێو هەمان عیشق وخرۆشاندا نە پارێزرین و بەهەمان خێرایی و هەڵمەت کار نەکەین، بەلایەنی کەمەوە لەبەر نەپاراستنی ئەوەی لە دەستماندایە ڕەنگە ئەم ئەمانەتە لە ئێمە وەربگیرێتەوە و بدرێتە کەسانی دی.

جا بۆ ئەوەی لەم خزمەتە دانەبڕێین و لێی نەکرێینە دەرەوە دەبێت بەردەوام لەبەردەم دەرگای ئولوهییەتی خوای گەورەدا زار زار نزابکەین و بپاڕێینەوە، پەروەردگارا هەمووما ن بۆ خزمەتگوزاری ئاینەکەی خۆت بە کاربهێنیت و جۆش و خرۆشمان هەردەم بە زیندوویی بهێڵیتەوە.

# جیهاد، بانگەواز و تەبلیغ

(ئەوە حەزرەتی موحەممەد  بوو بە هەڵسەنگاندنە دەراساکەی مرۆڤایەتی تێگەیاند کە پاراستن و لەخۆگرتنی ئاین و نامووس و نیشتیمان و گەل و تێکۆشان لە پێناویاندا جیهادە و جیهادیش ئەرکێکی سەرەکی بەندایەتییە[1].

## جیهاد بە واتای چی دێت؟

جیهاد بە ماناکانی خۆدانە بەر هەموو جۆرە نارەحەتی و قورسییەك و کارکردن و تێکۆشان و هەوڵدان دێت، بە واتایەکی دی هەموو هەوڵێکە بۆ لابردنی هەموو ئاستەنگەکانی نێوان خوا و بەندەکانی، هەموو ئەو کارانەی لە ڕێگەی خوادا دەکرێت هەموو ئەو هەوڵانەی بۆ ناساندن و تێگەیاندنی ناوەکانی خوا و داکۆکیکردن لەم بەهایانە دەدرێت، پێی دەوترێت جیهاد.

بەکارهێنانی ئەو ئەمانەتانەی لەلای خوای گەورەوە بە ئیمانداران بەخشراوە وەکو جەستە، ماڵ، موڵك و توانا فیکرییەکان لە پێناوی خوای گەورە و ئیسلامدا بە جیهاد دادەنرێت. جیهاد بە واتا فەرهەنگییەکەی واتا "بەرگریکردن" نەک "هێرشکردن" بە واتای لابردنی ئاستەنگەکانی بەردەم بەختەوەریی مرۆڤیش بێت.

---

١ موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن

بەگوێرەی پێناسەیەکی دی، جیهاد بریتییە لە بەندایەتیکردن بۆ خوای گەورە کە ئامانجی ژیانمانە، فێربوونی ئەرکە ئاینییەکان و کارکردن بۆ جێبەجێکردنی ئەو پێوانانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بۆی داناوین لە ژیانماندا و گەیاندنی ئیسلام بە کەسانی دی واتە بانگهێشت کردنیان بۆ کاری چاکە و دوورخستنەوەیان لە خراپەکاری.

جیهاد واتە سەرەتا کارکردن لەسەر دەروونی بەدخواز و نەیارەکانی دەرەوەی، دواتر بەرگریکردن لە جیهانی ئیسلامی و موسوڵمانان لە بەرامبەر هەر جۆرە هەڕەشەیەك، بۆیە دەتوانین بڵێین جیهاد واتایەکی گشتگیری هەیە و بە دڵ و زوبان و دەست هەموو هۆکارەکانی دی ئەنجامدەدرێت.

بیرکردنەوەیەك جیهاد تەنها بە شەڕکردن و واتای شەڕکردن شیبکاتەوە، لەو بۆچوونە هەڵە و کەمورکورتانە هەژماردەکرێت کە نەیانتوانیوە ڕاستییەکان و گشتگیری مانا قورئانی و سوننەتییەکانی دەرکبکات.

ئامانجی جیهاد گەیاندنی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەیە بە گرۆی مرۆڤایەتی و بەرزڕاگرتنی پەیامەکانییەتی، ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە لە ستەم و پەلاماردان، و رەخساندنی زەمینەیەکە کە بە ئاسانترین شێوە پەیڤەکانی ئیسلامی تێدا بگەیەنرێت.

حوکمی جیهاد بەپێی بنەڕەتەکانی ئیسلام و ئەو مەرجانەی کە تێیدایە داخوازی گۆڕانکارییە، جیهاد لە هەندێ کاتدا فەرزی عەینە، لەهەندێ کاتی دیکەدا فەرزی کیفایەتە، واتە گروپێکی موسوڵمانان دەتوانن ئامانجی جیهاد بەدیبهێنن، واتە ئەگەر خاك و ماڵ و داوێن و نامووسی موسوڵمانان لەبەرامبەر دوژمناندا بپارێزن ئەوا ئەو کاتە جیهاد فەرزی کیفایە دەبێت و بەرپرسیارییەتییەکەی لە سەرشانی موسوڵمانانی دی هەڵدەگیرێت.

## له قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا چۆن باسی جیهاد دەکرێت؟

وشەی جیهاد بە دەستەواژەی جیاواز زیاتر لە چل جار لە قورئانی پیرۆزدا بەکارهاتووە ، لە بەشێکی ئەم ئایەتانەدا ڕاستەوخۆ بە مانای شەڕکردن هاتووە، لەبەشێکی دیکەیدا جۆرە هەوڵدان و تێکۆشانێکە کە مەبەست لێی بەسەربردنی ژیانێکە ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدا بەدەستبێت.[1]

سەروەریشمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) دەفەرمووێت"جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورەدا و ئیمان هێنان بە خوای گەورە لە فەزیلەتترینی کردەوەکانە"[2]، لە شوێنێکی تریشدا دەفەرمووێت: "موجاهیدی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لەگەڵ نەفسیدا لە جیهاددا بێت." ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازیبێت ) بۆمان دەگێڕێتەوە: یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بەسەر شاخێکەوە سەرچاوەیەکی ئاوی شیرینی دۆزیوەتەوە و ئەمەشی زۆر بەلاوە خۆشبووە لەبەرخۆیەوە ووتوویەتی[3]"بریا لە مرۆڤەکان دوورکەوتبامایە و لەو قەدپاڵی شاخەدا ژیانم ببردایەتە سەر، بەڵام بەبێ مۆڵەت خواستن لە پێغەمبەری خوا ناتوانم ئەم کارە بکەم، دواتر کە داخوازییەکەی بۆ پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) گێڕایەوە، پێغەمبەر لەوەڵامدا فەرمووی: "کارێکی لەم شێوەیە مەکە، چونکە گەر یەکێك لە ئێوە لە پێناوی خوای گەورەدا تێبکۆشێت و هەوڵبدات و جیهاد بکات باشترە لەوەی یەکێك لەماڵەوە ٧٠ ساڵ خەریکی نوێژکردن بێت، ئایا ناتانەوێت خوا بتانبەخشێت و بتانخاتە بەهەشتەوە ؟، ئەگەر وایە ئەوا بڕۆن لە پێناوی خوای گەورەدا جیهاد بکەن. "[4]سەروەرمان چەندین فەرموودەی دەربارەی جیهاد و فەزیلەتەکانی جیهاد هەیە کە لە بەشەکانی

---

١ (البقرة، ١٥٤ )، آل عمران ١٤٦-١٤٩، النساء ٧٦، التوبة ٣٦-٤١

٢ مسلم، الأمارة ١١٧ ؛ الترمذي، جهاد ٣٢

٣ الترمذی، فضائل الجهاد، ٢

٤ الترمذی فضائل الجهاد، ١٧

تردا لێیان دەدوێین.[1]

## چەند جۆر جیهاد هەیە؟

کاتێك کە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) لە جەنگی تەبووك گەڕایەوە بە هاوەڵەکانی فەرموو لە جیهادی بچووکەوە گەڕاینەوە بۆ جیهای گەورە، دواتر هاوەڵێك لێی پرسی جیهادی گەورە چییە؟، لەوەڵامدا فەرمووی"جیهادی گەورە موجادەلەیە لەگەڵ نەفسماندا"[2] بەم شێوەیەش بێت سەروەرمان جیهادی بۆ جیهادی گەورە و بچووك دابەشکردووە.

مەبەست لە جیهادی گەورە ئەوەیە کە کەسێك واز لە حەرامکراوەکان بهێنێت و بە ئەنجامدانی فەرزەکان دەروونی خۆی پەروەردە بکات و خاوێنی بکاتەوە، هەروەها دووربکەوێتەوە لەهەموو خراپەیەکی گەورە و بچووك وبە پەیڕەوکردنی سوننەتەکانی پێغەمبەر کردەوەکانی ڕێك بخات .

ئەو حەقیقەتانەی کە فێربووە یان بیستوویەتی گەر پێویست بکات بە ئەندامانی خێزانەکەی و چواردەوری خۆی بگەیەنێت و هەوڵی بۆ بدات، بێ خاوبوونەوە لە پێناوی خوای گەورەدا بەردەوام بێت .

بێگومان قورسترین جیهاد بریتییە لەبەرەنگاربوونەوە و بەگوێنەکردنی ئارەزووەکانی دەروون (نەفس) ئەوەی کە نەینتوانیوە لە جیهادی دژی نەفسیدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا ئەو هێز و غیرەتە لەخۆیدا نابینێت کە لەبەرامبەر دوژمن ڕابوەستێت، هەربۆیە لەفەرمودەکەدا ئاماژە بەوەکراوە"موجاهیدی ڕاستەقینە

---

١ مسلم الامارة ١٦٣، الترمذی فضائل الجهاد، ١٢؛ ابو داود، جهاد ١٨، نسائی، جهاد ١؛ مسلم، الامارة ١٧٢: ابن ماجة، الفتن ٢٠

٢ المناوی، فیض القدیر، دارالفکر، ٥١١/٤؛ عجلونی کشف الخفاء، قاهرة، ٥١١/١

ئەوەیە کە لەگەڵ نەفسیدا لە جیهاددایە."[1]

جیهادی بچووکیش ئەو بەرەنگارییەیە کە ئەو کەسەی لە جیهادی گەورە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت لەکاتی پێویستدا دەیکات بەرامبەر نەیارانی ئاین و پیرۆزییەکان و لەم پێناوەدا لەگەڵیان دەجەنگێت و سنوورێکیان بۆ دادەنێت.

ئەو جەنگەی لە پێناوی خوای گەورەدا دەکرێت ڕووی لە ئاراستەکانی ناوەوە و دەرەوەیە، ئەو جەنگەی کە بەئاراستەی ناوەوەی مرۆڤە، مەبەست لێی گەڕانەوەی مرۆڤە بۆ سەر بنەڕەتی خۆی و ئەو جەنگەی کە بە ئاراستەی دەرەوەی مرۆڤە، مەبەست لێی گەڕاندنەوەی کەسانی ترە بۆ سەر بنەڕەتی خۆیان، لەڕێگەی یەکەمیانەوە مرۆڤ ئاستەنگەکانی بەردەم خۆی و بنەڕەتی خۆی لادەبات و دواتر خۆی دەناسێت و لە ئەنجامیشدا خوا دەناسێت و خۆشیدەوێت و دەگات بە چێژە ڕۆحانییەکان.

دووەمیشیان بریتییە لە ڕەخساندنی دۆخێکی وەها کە تێیدا ئەوەی بیەوێت بە ئیمان بگات و خوای تێدا بناسێت لە ڕێگەی لابردنی ئاستەنگەکانی نێوان ئیمان و مرۆڤەکان. ئەم دووانە ئەگەر بەیەکەوە کاریان پێکرا ئەوا ئەو کاتە جیهاد مەبەستی خۆی دەپێکێت، و ئەگەر یەکێکیشیان بەبێ ئەویتریان جێبەجێبکرێت ئەوکاتە بونیادی جیهاد تێکدەچێت.

ئەوەی لە جیهادی گەورەدا مەبەستە بریتییە لە بەرزبوونەوەی مرۆڤ بەهۆی ژیانی دڵ و ڕۆحەوە، لەجیهادێکی لەم شێوەیەدا پێویستە مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ نەفسی خۆیدا لەململانێدا بێت، واتە کاتێك کە شت بخواتەوە یان بخوات یان گەشت بکات. لەهەموو وەرزێکی ژیانیدا دەبێت دژی ئەو ویستانەی ببێتەوە کە

١ الترمذی فضائل الجهاد، ٢

لەدەرەوەی ڕەزامەندی خوای گەورەدان.

جیهادی بچووکیش ئەوەیە مرۆڤ بە گیان و ماڵی لە خزمەتی ئاینی خوای گەورەدا بێت و پارێزگاری لە پیرۆزییەکان بکات، لەکاتی پێویستیشدا بەشداری هەموو بەرەنگارییەك بکات لەگەڵ دوژمن، کە ئەمەش بەشداریکردن لە جەنگیشدا دەگرێتەوە.

بەمشێوەیە لە جیهادی گەورەدا مرۆڤ لەژێر هەر جۆرە مەرج و شوێن و کاتێکدا بێت هەر بوونی هەیە و بەردەوامە، جیهادی بچووکیش لەکاتە دیاریکراوەکاندا و ماوە ماوە واتە بەپێی مەرجەکان کەی پێویستی کرد دەگیرێتە بەر.

## سەروەرمان لە جیهادی گەورە و بچووکیشدا لە لووتکەدا بووە

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) بەو شێوەیە دەبینن کە پێکهاتەی هەردوو جیهادەکەی تێدا بەرجەستە بووە و لە لووتکەدا بووە. تەنانەت بە دانپیانانی حەزرەتی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) کە (نموونەیەکی پاڵەوانی و قارەمانییە لە کاتی جەنگ) دا، کاتێك ترس و بیم هەموو هاوەڵانی داگرتبوو، لە دوای پێغەمبەرەوە خۆیان دەشاردەوە و ئارامییان بەدی دەکرد، پێغەمبەری خوا کە نموونەیەکی بەرزی ئازایەتی و پاڵەوانی بوو بەهەمان شێوە لە پەرستشەکانیشیدا نموونەیەکی باڵای بەندایەتی بووە.

نوێژکردنی ئەو هەمیشە قوڵپ قوڵپ کوڵانی مەنجەڵێکی بە یاددا دەهێنا. کاتێك دەگریا و ئەسرینی هەڵدەڕشت هەستی هەمووانی دەبزواند، جاری وا هەبوو چەندین ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، جاری واش هەبوو تا بەرەبەیان نوێژی دەکرد و پێیەکانی دەئاوسان، تەنانەت عائیشەی دایکمان (ڕەزای خوای لێبێت) سەری

لێیدەسوڕما و دەیفەرموو: "تۆ کە سەرجەم گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت بەخشراون بۆ هێندە خۆت ماندوو دەکەیت؟!" ئەویش (عَلَيهِ أَفضَلُ الصَّلاةِ وَأَتَمُّ التَّسلِيم) لە وەڵامدا دەیفەرموو: "ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاسگوزار بم؟"[1]

ئەو لە جیهادی ماددی و مەعنەویدا مرۆڤێکی خاوەن دڵ بووە، ئەو هانی ئوممەتەکەی داوە بۆ ئەوەی هەمیشە داوای لێخۆشبوون بکەن و دەیفەرموو: "من هەموو ڕۆژێك زیاتر لە حەفتا جار استغفرالله دەکەم."[2]

لەبنەڕەتدا سەرکەوتن لە جیهادی بچووکدا پەیوەستە بە سووربوون و بە ئاگایی ململانێکردنی لە جیهادی گەورەدا، چونکە ئەو مرۆڤانەی نەیانتوانیوە ئەو حەقیقەتانەی کە لە پێناویدا دەجەنگن لە ناخی خۆیاندا بچەسپێنن ئەوا ناتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن. لەبەرئەوە دەبێت ئەوانەی کە خەریکی جیهادن سەرەتا جیهادەکەی نەفسی خۆیان تەواو بکەن و هەمیشە مرۆڤێکی مەعنەوییات بن، دواتر حەقیقەتەکان و جوانییەکان بە چواردەوردا بڵاوبکەنەوە.

گەر بەوردییەوە لە مێژوو بڕوانین، دەبینین ئەوانەی بەشێوەیەکی دروست کاری تەبلیغ و بانگەوازیان بەجێگەیاندووە بەسەر ئەم هێڵەدا ڕۆیشتوون، لە پێغەمبەرەکانەوە بۆ وەلییەکان لە وانیشەوە بۆ مرۆڤە پیاو چاکەکان، هەموویان هەمان ڕێچکەیان گرتووەتەبەر. خوای گەورەش بەهۆی صەمیمییەتی ئەو جۆرە کەسانەوە لە کارەکانیاندا هێزێکی کاریگەری زیاتری بە ووتەکانیان بەخشیوە و سەرکەوتنی کردووە بە دەرئەنجامی کارەکانیان. لەو سەردەمەی کە ئەوانی تێدا ژیاون بۆ ئەم ڕۆژەی ئەمڕۆمان کردەوەوە و ووتەکانیان وەك نموونەیەکی جوان و شیرین چووەتە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە.

---

١ بخاری، تفسیرالصورة (٤٨)، مسلم، منافقین ٨١
٢ بخاری، دعوات ٣

هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا بە بێ وچان و ڕاوەستان خەریکی بڵاوکردنەوەی حەق و حەقیقەتەکانی ئەم ئاینە بووە، هاوەڵە بەڕێزەکانیشی بەهەمان شێوە بەهەر چوارلای جیهاندا بڵاوبوونەتەوە و بە جوانترین شێوە کاریان بۆ بەجێگەیاندنی بڵاوکردنەوەی حەق کردووە.

یەکەمین نوێنەرانی ئەم ئاینە جیهانگیرە هاوەڵە بەڕێزەکان بوون کە بە چواردەوری جیهاندا بڵاوبوونەتەوە و دەرکیان بە گرنگی بەرپرسیارییەتییەکە کردبوو، لەبەرئەمە کە لە شوێنێکەوە دەڕۆیشتن بۆ شوێنێکی تر لە پێناوی خوای گەورەدا جیهادییان دەکرد و شایستەیی خۆیان بۆ گەیشتن بەجوانییەکانی خوای گەورە پیشاندەدا، بەهۆی دڵدانیان بەم مەفکوورە بەرزەوە نرخی ئەم ژیانەیان لەبەرچاو کەمبووبووەوە و لانی کەم هێندەی حەز و ئارەزووی کەسانی دی بۆ ژیان ئەمان بە شەوق و پەرۆشی دیداری پەروەردگارییان ناخیان دەسووتا، لەم ڕووەوە ئەوەندە بە شەوق وئارەزوو بوون کە فەرماندەیەکی بێزەنتی بە پادشاکەی دەڵێت"پادشام لەگەڵ ئەم پیاوانەدا جەنگ ناکرێت، ئێمە چەندێك لە ترسی مردن ڕادەکەین ئەوان ئەوەندە بەرەو ڕووی مردن ڕادەکەن. "

پەرۆشی وپەیوەستی هاوەڵان بە پێغەمبەری خواوە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) و فیداکاری ئەوان بە ماڵ و گیانیان لە پێناو ئەم ئاینەدا بەشێوەیەك بوو کە بیرمەندان تووشی سەرسامی دەکات، هەر لەبەر ئەمەش بووە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەوانی هەمیشە بە پێشینە هێناوەتەوە و شایستەی پەسنی خۆی کردوون. بەهەمان شێوە ئەو فیداکارییەی ژنە موسوڵمانەکانیش پیشانیان دەدا شایەنی سوپاس و پێزانینە و هیچ کاتێك دوودڵییان نەکردووە لەبەخشینی هەرچی کەمالیات و گوارە و بازنەی دەستیان بە پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی بەکاریبهێنێت بۆ ئەوانەی کە بۆ جەنگ دەردەچن.

## جیهاد تەنها "جەنگ" نییە

بەشێوەیەکی گشتی لە زمانە ڕۆژئاواییەکاندا وشەی جیهاد بە"جەنگی پیرۆز" "holy war"وەرگێڕانی بۆ دەکرێت، وەرگێڕانێکی لەم شێوەیە بەشێکە لەو هەوڵانەی کە دەیانەوێت ئیسلام وا نیشان بدەن کە گوایە "ئیسلام بە زۆری چەك بڵاوبووەتەوە"، بۆیە بەرامبەری وشەی جیهاد "جەنگ" نییە، لەگەڵ ئەوەی کە جەنگان لە پێناوی خوای گەورەدا بە جۆرێك لە جیهاد دادەنرێت، بەڵام جیهاد خۆی لەخۆیدا هەموو ئەو هەوڵانە دەگرێتەوە کە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی ئاینی خوای گەورەدا دەدرێت.

موسوڵمان هەرچییەك بکات لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەیکات، جەنگیش بەم شێوەیە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەکرێت، ئەم تێگەیشتنەی ئیسلام بۆ ژیان لە قورئاندا لە ئایەتەکانی (قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين) (الأنعام ١٢)، واتە بێگومان هەموو نوێژەکانم و بەندایەتییەکانم و ژیانم هەمووی هی پەروەردگاری جیهانییانە، لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت (الذين آمنوا يقاتلون في سبيل الله والذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت واتە(ئیمانداران لە ڕێگەی خوای گەورەدا دەجەنگن، سەرپێچیکەرانیش لە ڕێی شەیتاندا (النساء : ٧٦)

لە کاتێکدا کە موسوڵمانان لە پێناوی ئەم مەبەستە گەورەیەدا جیهادیان دەکرد، ئەوانەی کە موسوڵمان نەبوون بە تایبەتی وڵاتە داگیرکەرەکان"جەنگی ناپیرۆزییان بەرپا دەکرد"، ئاسیا، ئەوروپا، ئەفریقا، ئەمریکایان بە خوێن پیس دەکرد، مێژووش پڕە لەم نموونانە.

لەژێر ناونیشانی"دۆزینەوە جوگرافییەکان"سەرچاوە سروشتییەکانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکا دۆزراوەتەوە و دواتر لە ڕێگەی ڕێکخستنی گەشتەوە بۆ ئەم

ولآتانە، هاولآتییەکانی ئەو ولآتانە بە کۆیلە کراون و بەشێکیش لە فەلسەفەی جەنگ لەمەوە سەریهەڵداوە.

ئەمانە بۆ پەردەپۆشکردنی کەموکورتییەکانی خۆیان خەریکی پڕوپاگەندەیەکی ڕیکلامی زۆر گەورەن، بەهۆی کاریگەری پروپاگەندەکانی ئەمانەوە لەکاتی هێنانی ناوی جیهاد یەکسەر موسوڵمانێکیان دێتە بەرچاو کە ئامادەیە بۆ خنکاندنی هەموو ئەوانەی کە موسوڵمان نین، وێنای تورکێکی شمشێر بەدەست و عەرەبێکی تیرۆرستیان لا دورست دەبێت.[1]

لەگەڵ ئەمانەشدا موسوڵمانانیش جەنگیان کردووە، بنچینەی سەرەکی لەم جەنگەدا بەزۆر موسوڵمانکردنی مرۆڤەکان نییە، بەڵکو مەبەست لێی ڕەخساندنی کەشێکە لەو شوێنانەی کە ئیمکانی تەبلیغ کردنی کەسی تێدا نەماوە و مافی گەیشتن بە ئاینی حەقییان لێوەرگیراوەتەوە، بۆ ئەوەشە هەرکەسەو بە ئازادی ئەو بیروباوەڕەی کە هەیەتی هەڵیبژێرێت، بۆئەوەی ئەم چالاکییەش لە داگیرکردن جیابکەینەوە نازناوی (فەتح)ی پێدراوە.

## گەورەترین جیهاد چییە؟

پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە زۆربەی فەرموودەکانیدا سەرنجمان بۆلای گرنگی موجاهەدەکردن لەگەڵ نەفسدا رادەکێشێت، لە ڕاستیدا ناڕەحەتترین جۆری جیهادە، هەر لەم بارەیەشەوە هەمیشە لە نزاکانیدا فەرموویەتی: "خوایە گیان بە ڕەحمەتی خۆت فریام کەوەوە و هێندەی چاوتروکانێکیش لەگەڵ نەفسی خۆمدا بەجێم مەهێڵە ."[2]

---

١ محمد الغزالي، فقه السيرة

٢ . المستدرك للأمام حاكم النيسابوري ٥٤٥/١

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: ”لە جیهادی بچووکەوە بەرەو جیهادی گەورە گەڕاینەوە“[1]، بەڵێ ئەگەر ئێمە نەتوانین چێژی ئیسلام بکەین، چۆن دەتوانین لە پێناو ئەم ئاینەدا کار بکەین .

گەورەترین جیهاد ئەو جیهادەیە کە بەرامبەر گەورەترین دوژمن دەکرێت، پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێت: ”ئەو دوژمنەی کە زۆرترین زیانت پێدەگەیەنێت نەفستە “[2] فەرموودە پیرۆزەکە نەفسی بە گەورەترین دوژمن داناوە، هەروەکو چوون بۆ جەنگ لە بانگەوازیشدا بەهەمان شێوە پێویست بەوەدەکات کە بەسەر نەفستدا سەربکەویت، لە ڕاستیدا جیهادکردن لەگەڵ نەفسدا گرنگترینی جۆرەکانی جیهادە، هەموو ساتێکمان لەگەڵ ئەم جیهادەدا بەسەردەچێت، هەندێجار یەك سات غافڵبوون زۆر لەسەرمان دەکەوێت، بەڵام جیهادی "ماددی" بەردەوام نییە چونکە لە کاتی ئاشتیدا موسوڵمانان مەجبووری ئەم جۆرە جیهادە نین.[3]

بەپێی تایبەتمەندییەکانی ئەو ناوەندەی کە تێیداین و مەرجەکانی، دەبێت بۆ ئەوەی فەرمانبەریی جیهاد بەجێبگەیەنین کەسانی ڕۆشنبیر و زانای ئیسلامی پێبگەیەنین، گۆڤاری هەمەجۆر و ڕۆژنامە دەربکەین، ئەو بەرهەمانە بڵاوبکەینەوە کە ئیسلام بە شێوەیەکی جوان پیشان دەدەن، کتێبخانە بکەینەوە و کۆڕو سیمینار و کۆنفرانس ڕێکبخەین، لە ڕێکخراوە خێرخوازییەکاندا بەشداری بکەین و کەسانی دەوروبەریشمان بانگهێشتی ئەم جۆرە کارانە بکەین.

هاوشێوەی ئەم جۆرە کارانە شێوەیەکی تری جیهادکردن هەیە، ئەویش هەڵسوکەوت کردنە لە چوارچێوەی ئەو هێڵەی کە لەم فەرموودە پیرۆزەدا بۆمان

---

١ المناوی فیض القدیر ٥١١/٤؛ العجلونی، کشف الخفاء ٥١١/١

٢ العجلونی، کشف الخفاء ١٤٣

٣ علاءالدین بشار، وتەگەلێك لە نوور

کێشراوە، پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرموویت " هەرکەسێك لە ئێوە ئەگەر خراپەیەکی بینی با بە دەستی چاکی بکات ئەگەر بەمە نەیتوانی با بە زمانی، ئەگەر بەمەش نەیتوانی با لە دڵەوە پێی ناخۆش بێت کە ئەمەش لاوازترینی جۆری ئیمانە"[1]، واتە ئەگەر یەکێ لە ئێوە خراپەیەکی بینی یان کارێکی زیان بەخشی بینی یەکسەر هەوڵی چاککردنی بدات، ئەگەر توانای ئەمەی نەبوو با لە ڕێگای وتار و نووسینەوە هەوڵبدات، ئەگەر توانای ئەمەشی نەبوو لە ڕێگەی دڵییەوە، موجادەلەکردنیش بە دڵی لە لاوازترینی ئیمانەکانە. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا دەفەرموویت" سەری کارەکە ئیسلامە و کۆڵەکەکەی نوێژە و لوتکەکەی جیهاد."[2]

## ئەو شتانەی دەبنە ڕێگر لەبەردەم جیهاددا چین؟

وەکو هەموو کارێکی چاکە، کۆمەڵە کۆسپێك هەن کە دێنە بەردەم جیهادکردن، یەکەیمینی ئەمانە نەفسمانن دووەمینیشیان هەر نەفسمانە، سێیەمینییان دوژمنەکانمانن.

بەرەنگاربوونەوەی ئارەزووە خراپەکانی نەفس، جیهادە. گوێنەدانە تەڵقینەکانی شەیتان ومانەوە لەسەر ڕێڕەوی ئیستیقامەت جیهادە، بەرەنگاربوونەوەی ئەوانەی کە هەوڵی ڕێگری لە ئیمان و هیدایەت دەدەن جیهادە، لە هەر سێکیانیشدا دەبێت کارەکەمان لەبەر خوای گەورە بێت.

ئەوەی مرۆڤەکان لە جیهاد دووردەخاتەوە پەیوەندی هەیە بە ژیان و پەیوەستبوون بە چێژەکانی ژیانی کەسییەوە، ئەوانەی کە نایانەوێت پشوویان لێتێکبچێت، لە

---

١ مسلم الايمان، ٨

٢ الترمذی الايمان ٨، ابن ماجه "الفتن" ١٢

چێژە کەسییەکانیاندا فیداکاری گەورە نانوێنن، چاوەڕوانی ئەوەیان لیَ ناکرێت کە کاری گەورەی هاوشێوەی جیهاد بە جیَ بگەیەنن، گەر چاوەڕوانیشیان لێبکرێت ئەوا لە خۆڕاییە، چونکە تەنها ئەو کەسانە دەتوانن کارەکان بەجێبگەیەنن کە فیداکاری گەورەیان نواندووە لە چێژە ماددی و تەنانەت مەعەنەوییەکانیشیاندا.

ئێمە چاوەڕوانی هیچ لەوانە ناکەین کە هیچ جۆرە فیداکارییەکی مەعنەوی و ماددیان ئەنجام نەداوە، و لەسەرەتاوە هیچ بڕیارێکی لەو شێوەیان نەداوە، نەك چاوەڕوانی شتیشیان لیَ ناکەین لەپاڵ ئەوەشدا بیر لەو کێشانە دەکەینەوە کە چاوەڕوان دەکرێت لە دوای دەرکەوتنی ئەوانەوە بەسەرماندا بێت، ئەوانەی کە وازیان لە چێژە دونیاییەکانیان نەهێناوە و لە ڕێگەی حەقدا نەیانوتووە"مردن لە پێناوی تۆدا چەند شیرینە"ئەوا ئێمە لەو باوەڕەشدا نین لە پێناوی موسوڵمانێتیدا بتوانێت ڕۆڵێکی ڕزگارکەر ببینێت، ئێمە باوەڕمان بە جیهاد و ململانێی ئەو کەسانەیە کە وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر واز لە هەموو چێژە دونیاییەکانیان هێنابوو تەنانەت ماڵ و شوێنی مانەوەکانیشیان بەجێهێشتووە، ئەو شتانەشی کە لەم کەسانە چاوەڕێی دەکەین بەئیزنی پەروەردگار وەکو هۆکار لێیان دەڕوانین."

مرۆڤەکانمان لەو هەوڵ و تێکۆشانانەی ئەنجامی دەدەن دەبێت بەو شێوەیە بێت کە لەقورئاندا ئاماژەی پێکراوە، قورئانی پیرۆز لەم ڕووەوە دەفەرموێت (ئەی موسوڵمانینە ؟ ئەوە چیتانە و چیتان لێقەوماوە کە پێتان بووترێت دەرچن بۆ جەنگ خۆتان دەدەن بە زەویدا و تەمەڵی دەکەن و لەشی خۆتان قورس دەکەن تا نەڕۆن بۆ جەنگەکە ئایا ڕازی دەبن بە ژیانی دونیا لەبری ژیانی نەبڕاوەی قیامەت کە لەززەت و خۆشی ژیانی دونیا بە نسبەت خۆشی ژیانی قیامەتەوە هیچ نییە و زۆر کەمە، ئەگەر لە پێناو خوای گەورەدا سەفەربەرنەبن خوا سزایەکی زۆر سەختتان دەدات و لە جیاتی ئێوە قەومێکی دیکە دێنێتە ڕوکار، ئێوە ناتوانن

هیچ جۆرە زیانێك لەخوا بدەن، خوا بە توانایە و دەستی بەسەر هەموو شتێکدا دەڕوات ) (التوبة/٣٨-٣٩)، قورئانی پیرۆز بانگی هەموو بڕواداران دەکات بۆ جیهاد و بردنەوەشمان بەستراوەتەوە بە رادەی بەدەنگەوە هاتنمان بۆ ئەم بانگەوازە، ئەگەر نا خوانەخواستەوە دەگونجێت لە دووڕوان بین، یان دەبێت ئێمەش وەکو دووڕووەکان بڵێین" وازهێنان لە خۆشییەکانی ئەم دونیایە بۆ ئێمە گرانە"[١] یان دەبێت وەکو هاوەڵان چیمان هەیە و نییە هەمووی بخەینە لاوە و بەم شێوەیەش لە نامادەباشیدابین.

## تەبلیغ مەبەستی بوونمانە

"فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لەخراپە" ڕێگایەکە مەبەستی بەدییهێنانی بوونمان ئەگەیەنێ. بە ڕاستیی خوای گەورە کۆشکی بوونەوەری لە پێناوی ئەم ئەرکە بەرز و فەرمان بەرزیە مەزنەدا بەدیی هێناوە و پایە و پلەی خەلافەتیشی لەو کۆشکە مەزنەدا هەر لەو پێناوەدا بەمرۆڤ سپاردووە و زنجیرەی پێغەمبەرانیش هەر لەبەر ئەم هۆیە دامەزراوە. جا ئادەمی سەردارمان (سەلامی خوای لێ بێت) یەکەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەرە لەزەویدا، هەر کە منداڵەکانی چاویان بەدونیا هەڵهێنا، دەبینن وا باوکیان پێغەمبەرە، فەرمان بە چاکە ئەدات و، دوورەپەرێزیی لە خراپە ئەکات.

بەم شێوەیە مرۆڤایەتیی کە دامەزرا بە پێغەمبەرایەتیی دەستی پێکرد و لە ئەنجامدا درەختی پێغەمبەرایەتیی سەرداری هەردوو بوونەوەر ئەو پێغەمبەرە مەزنەی کە یەکەم تۆوی ئەو درەختەیە، بە شێوەی بەرهەم پێشکەش کرد و، هەموو گەردوونەکانیش لە پێناوی ئەو پێغەمبەرەدا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەدیهێنران.

١ محمد فەتحوڵلا گولەن (بەرزکردنەوەی ناوی خوا یاخود جیهاد)

بێگومان مەبەست لە ڕەوانەکردنیشی تەبلیغ و بانگ کردنە بۆ لای خوا و بانگەوازکردنە. دیارە ڕۆحی تەبلیغ و بانگەواز فەرماندان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپەیە. بەو مانایە کە بوونەوەر تەنها لە پێناوی ئەم مەبەستەدا هێنراوەتە بوون و، بێگومان کارێکیش کە هۆی بەدیی هێنانی بوونەوەر بێت، ئەو کارە مەزنترینی هەموو کارەکانە.

بەڵێ، منداڵەکانی پێغەمبەر ئادەم (سەلامی خوای لێ بێ) سەرنجیان دا کە باوکیان لە هەموو ئان و ساتێك دا چاو ئەبڕێتە جیهانی بەرز و باڵا و، لەوێوە فەرمان وەرئەگرێ و، لە بەردەم ئەو فەرمانانەدا بەخشووعەوە خۆی بەدەستەوە ئەدات، بگرە ترس و شەرمی ئەو جیهانانە لێی دوور ناکەوێتەوە، وای لێ هات ئەم "باوکە پێغەمبەرە" لە ئاسمانی ئەواندا وەك ئەستێرەی قوتبی لێ هات و ڕێی ڕاستی پیشان ئەدان. کەواتە ئادەمی سەردارمان یەکەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەرێکە کە ئەرکی " فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە" ی ئەنجام دابێت. سەرسوڕمانیشی ناوێت، چونکە ئەمە ڕێیەك نیە بۆ تەنها جارێك بکرێتەوە و پاشان دابخرێت، بەڵکو دوای ئادەمی سەردارمان سەلامی لێ بێ، چەندین پێغەمبەری مەزن، یەك لەدوای یەك، هاتن و هەمان ڕێیان گرتەبەر، چونکە بەردەوام مرۆڤایەتیی پێویستیی بە پێغەمبەران هەبووە، چونکە هەرچەندە مرۆڤ ڕەوشتە بەرزەکانی لەخۆ گرتبێت، ئەوا ئەو ڕەوشتانە، بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار و، بەهۆی کاریگەریی ڕووداوەکانەوە، لاواز ئەبن و ئەبزرکێن و کۆتاییان پێدێت.

قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بۆ چەندین چەرخ کردووە کە ماوەیەکی زۆر بەسەر خەڵك دا تێپەڕیوە، بێئەوەی ئاینیان بۆ تازە بکرێتەوە، سەرەنجام ئەوە بۆتە هۆی دڵڕەق بوونیان و ئەو کاتەش چاوی مرۆڤ لە ئاستی ڕاستی دا دائەخرێن و، بەسیرەتی کوێر ئەبێت و پێی دەخلیسکێت، ئیتر مرۆڤایەتیی ڕاستیی خۆی لەدەست دەدات. بۆیە پەروەردگاری بەخشندە یەك لە دوای یەك پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە،

لەو سۆنگەیەوە کە زانستی تەواوی بە بارودۆخی مرۆڤایەتیی هەیە و، لەبەرئەوەش کە سۆز و بەزەیی خوا لە پێش خەشم و تووڕە بوونیەوەیە. لەبەر ئەم هۆیە هەموو پێغەمبەرێك ئەرکی فەرمان دان بەچاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپەی بە پێی زەمانەی خۆی ئەنجام داوە.

ئادەمی سەردارمان (سەلامی خوای لەسەر بێت) بەم شێوەیە ژیانی خۆی بەسەر برد و، هەمیشەش ئامۆژگاریی منداڵەکانی ئەکرد بۆ ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان و دوورکەوتنەوە لە کردەوە خراپەکان. ئەوەبوو تا ماوەیەکیش دەنگ دانەوەی هاوار و بانگەوازەکەی بەردەوام بوو، کاتێکیش کە بڵندیی ئەو دەنگە کز بوو و هێزی تێدا نەما، خوای بڵند و بێگەرد ئەرکی پێغەمبەرایەتیی خستە ئەستۆی یەکێك لە کوڕە هەڵبژێرراوەکانی ئادەمی سەردارمان. بەم شێوەیە هەر هەموو ئەو ئەرکە مەزنەیان بە تەواوترین شێوە ئەنجام دا. هەر کە خۆری یەکێ لە پێغەمبەرەکانیش ئاوا ئەبوو، دوای ئەوەی ئاسمانی مرۆڤایەتیی تاریك ئەبوو، خۆری پێغەمبەرێکی دی هەڵ دەهات. جا هەرچەندە وەلی یە گەورەکانیش ئەو ئاسمانە تاریکەیان بە وێنەی ئەستێرەی بریسکاوە پڕ لە نوور کردبوو، بەڵام نووری ئەوان ئەوەندەی کە لە نووری خۆری پێغەمبەرایەتیی چاوەڕوان ئەکرا گەشاوە نەبوو.

هەروا چەرخەکان بەسەر چوون تا سەردەمی سەردارمان نووح سەلامی لێ بێ هاتە بەرەوە، ئەو کاتە دەنگە زوڵاڵەکەی کە شیاوی پێغەمبەرێکی گەورەی (أولو العزم) بێت دای بە گوێی مرۆڤایەتیی دا، وەك قورئانی پیرۆز دەری دەبڕێ: "أبلغكم رسلت ربى و أنصح لكم وأعلم من اللهِ ما لا تعلمون." (الأعراف،٦٢)

بەواتاوە پێمان دەفەرموێت: "هەر کەسێك گوێم لێ بگرێت و فەرمان بەردارم بێت و سواری کەشتی یەکەم ببێ سەرفراز ئەبێت و، ئەم سەرفرازی یەش سەرفرازی یەکی زاهیری و باتینی دەبێت. چونکە ئەو کەشتی یەی کە لێشاوی شەپۆلە لە

یەك دەرەكان بە وێنەی چیا لەت دەكات، لاشەتان رزگار دەكات و، لە نوقوم بوون لەناو شەپۆلەكانی ژیانی دونیای و قیامەتی سامناكدا رزگار دەبن و، دەگەنە رۆخی سەلامەتیی، ئەگەر دڵەكانتان وابەستەی من بكەن و، گوێ بۆ قسەكانم بگرن، ئەگینا كۆتاییتان پێ دێ و، جیهانی ماددە و مەعناتان لەبن دێ و، زاهیر و باتینتان بە جارێ دەپووكێتەوەو نامێنیت."

نووحی سەردارمان سەلامی خوای لێ بێ نزیكەی هەزار ساڵی تەمەنی خۆی بەم شێوازە بۆ بانگەواز بەسەر برد. پاشان خوای پاك و بێگەرد، دوای ئەو، سەردارمان هوودی سەلامی لێ بێ رەوانە كرد و، ئەویش هەمان فەرمایشتی دوبارە كردەوە:

"أبلغكم رسالات ربی وأنا لكم ناصح أمین"(الأعراف،٦٨).

ئەویش داوای لە مرۆڤایەتیی كرد تا ئەو كارە ئەنجام بدەن كە لەگەڵ مەبەستی بەدیهێنانیاندا دەگونجا. ئەو مەبەستەی كە مرۆڤی لە پێناودا بەدیی هێنراوە. . ئەوەبوو پێغەمبەران سەلامیان لێ بێ یەك لە دوای یەك هاتن تا ئەم ئەركە بەبیری مرۆڤایەتی بهێننەوە. واتە تا پەروەردگاری خۆیان بناسن و ئیمانی پێبهێنێنن و، لەویژدانیاندا هەست بەوە بكەن كە ئیمانیان پێهێناوە. بەراستیی دوای هوودی سەردارمان (سەلامی خوای لێ بێت) گەلێك پێغەمبەری مەزن رەوانە كران و هەمان ئەركیان بەجێ هێناو، هەمان ڕێگاشیان گرتەوەبەر.

بەم شێوەیە، هەرچەند شوێنەواری فەرمایشتەكانی پێغەمبەری پێشوو لە مێشكی خەڵك دا ئەشۆرایەوە، مرۆڤایەتیی نزم ئەبوویەوە و، رەهەندی ژیانە مەعنەوییەكەی مرۆڤ تووشی چەندین شۆكی توندی یەك لەدوای یەك دەبوویەوە بە ڕادەیەك ژیان ئەبووە زەوی یەكی رووت و قووت كە هیچ ژیانێكی تێدا نەبوو. ئیتر بەتەواویی شنەی ئەو دڵكرانەوەیەی كە لەو جیهانە باڵاوە دەهات كۆتایی پێ دەهات و

مرۆڤایەتییش دادەڕووخا و بەم لاو بەولادا پەرتەوازە دەبوو.

کاتێك کە سەردارمان ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) بە پێغەمبەریی ڕەوانە کرا، مرۆڤایەتیی لەو شەوەزەنگە دا دەژیا، بە هەناسەکانی "فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە" وە کە مایەی بەخشینی ژیانن، خۆی بە ناو ڕیزەکانی خەڵك دا کرد و، بە پەلە خۆی گەیاندە هەر شوێنێك کە ئەی بینیی کۆمەڵێك خەڵکی لێ یە و، بانگی کردن بۆلای خوا و حەق و حەقیقەتی پێراگەیاندن، جا ئەوانەی کە گوێیان بۆ گرت و، شوێنی کەوتن گەیشتنە لووتکەی بڵندیی کەماڵاتی مرۆڤایەتیی و، لەو چڵەپۆپەیەدا دەبزوان.

دوای ماوەیەك جارێکی تر مرۆڤایەتیی چڵەپۆپەی بەجێهێشتەوە و وردە وردە وەك جاری جاران بەرەو خوار کشایەوە. ئیتر ئەوەبوو بیری ماددییەتی ڕەق و تەق مێشکی خەڵکی داگیر کرد، بە رادەیەك کە مرۆڤایەتیی کەوتە هەوڵی دەست خستنی ئاواتەکانی لە ماددییاتدا. جا ئەم موسیبەتەی کە چۆکی دایە سەر سنگی مرۆڤایەتیی تا ئەم چەرخەی ئێستاشمان هەر بەردەوام بوو، بگرە ئێمە زیاتر شارەزای بەڵاو سەرەنجامە بەزیانەکانی ئەوین.

ئەوەتا سەردارمان مووسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە وێنەی ئەو ئاو و هەوا ماددیی‌یەدا، لە دەڵتای نیلی میسردا و، لەناو گەلێکدا کە دڵیان بە وێنەی بەرد، یان زیاتریش ڕەق بوو بوو، هەلکەوت. ئەویش وەك برا پێغەمبەرە پێشینەکانی فەرمانی بەسەردا دراوە تا فەرمان بە چاکە بدات و، دوورە پەرێزیش لەخراپە بکات. ئەویش ئەرکە گرانەکەی گرتە ئەستۆ و، دەستی گەلەکەی خۆی گرت تا جارێکی تر بەرەو لووتکە بەرزیان بکاتەوە. ئەوەبوو تا رادەیەك لەم هەوڵەیدا سەرکەوت. جا هەرچەندە ئەو ڕووی وتاری ڕوو بە قەومێك کرد کە فەرماندەیەتیی و هیدایەتیان هەروا ئاسان نەبوو، بەڵام هێشتا خۆی لە ژیاندا بوو زۆرێك لە

بەرهەمی بانگەوازە پیرۆزەکەی، لە فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە، بەچاوی خۆی بینیی.

ئەوەش کە گومانی تێدانیە ئەوەیە کە دەست گرتنی مرۆڤایەتیی و بەرز کردنەوەی بۆ لووتکە هەرە بەرزەکان و وەهای لێ بکرێ کە پەی بە مرۆڤایەتیی تەواوی خۆی بەرێت، هەروا کارێکی سووك و ئاسان نیە. لەراستیی دا پێغەمبەری زۆر لەو پێناوەدا شەهید بوون، هەتا سەردارمان زەکەریا سەلامی خوای لێبێ بە مشاری ئاسنین دووکەرت کرا و، سەردارمان یەحیاش سەلامی خوای لێ بێ هەر لەو پێناوەدا شەهید بوو ، (صەلیب)یش هەر بۆ ئەو مەبەستە بۆ سەردارمان عیسا سەلامی لێ بێ چەقێنرا.

لەگەڵ هەموو ئەوەش دا هێشتا ئەو زەحمەت و مەینەتەی کە هاتە رێی پێغەمبەری بەرێز (عَلَيْهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە هەموو ئەوانە نارەحەتتر بوو، چونکە هیچ سزا و نارەحەتییەك نەما کە ئەو نەیچێژێت، هەتا ئەوەبوو بە دایکە عائیشەی (خوا لێی رازی بێت) دەفەرموو: " لقد لقيت من قومك ما لقيت ".[1] ئەم وتەیە دەری دەبرێ کە چەندە سزای سەختی لەلایەن قورەیشەوە پێ چەشتراوە.

لەم فەرمایشتەدا ناڵینی دڵێکی شکاو لە پێغەمبەرێکی خەمبارەوە دەبیسترێ. ئەم فەرمایشتە وەربگرن و بیگەیەنن بە هەموو پێغەمبەرێك هەتا دەگاتە سەردارمان ئادەم سەلامی لێ بێ و بە ئەندێشە چاودێریی کاریگەریی فەرمایشتەکە بکەن، دەبینن ناڵینی دڵی شکاوی هەموو پێغەمبەرێکە. هەروەك ببینین سەردارمان ئادەم منداڵەکانی کۆ بکاتەوە و پێیان بفەرموێت: " لقد لقيت منكم ما لقيت." هەروەها نووح و هوودی سەردارمان هەمان فەرمایشت بڵێن. هەروەها پێغەمبەرەکانی تریش هەمان دڵ شکاویی بە قەومەکەیان ئەگەیەنن.

[1] البخاري، بدء الخلق:١، مسلم، الجهاد و السير١١١

خۆ ئەگەر فەرمایشتی مرۆڤە بەختەوەرەکان بگوشین، کە دوای سەردەمی پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) ئەو فەرمان بەری یەیان ئەنجام دا و خستیانە ئەستۆی خۆیان، ئەبینین هەمان دڵ شکاویی لێ دەچۆڕێ:

"بەدرێژایی تەمەنم کە هەشتاو ئەوەندە ساڵە چێژی هیچێ لە خۆشیی و لەزەتەکانی دونیام نەکرد. ... هەموو تەمەنم لە مەیدانەکانی جەنگ و، زیندانەکانی دیلیی، یان بەندیخانەکانی نیشتمان و دادگاکانی وڵات دا بەسەر برد. . هیچ جۆرە ئێش و ئازار و تەنگ و چەڵەمەیەك نیە نەم چەشتبێ . . لە دادگا سەربازی یە عورفی یەکان دا بە وێنەی تاوانباران مامەڵەم لەگەڵ دەکراو و، بە وێنەی سەرگەردانان بۆ هەموو لایەکی وڵات دوور دەخراومەوە ، غەریبییم پێ چەژراوە و، لە زیندانەکانی وڵات دا چەندین مانگ لە تێکەڵیی خەڵك بێ بەش کرام و، چەندین جاریش ژەهرم دەرخوارد دراو و، سووکایەتیی جۆراو جۆریشم پێکرا ، زۆر کاتم بەسەر بردووە کە هەزار قات مردنم بەلاوە چاکتر بووە لەو جۆرە لە ژیان، خۆ ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کە ئاینەکەم خۆکوشتنم لێ قەدەغە ئەکات، لەوانەیە ئێستە سەعید خۆڵی ژێر خۆڵ بوایە."[1]

ئەم وشانە شکاویی و کرۆکی دڵی دڵ شکاوێك دەردەبڕن و، لەوانەیشە ئەم فەرمایشتەشی لەبری هەموو گەورە پیاوە دڵ شکاوەکان دابێت. کەواتە ئەم حاڵەتە جۆرێکە قەدەری ئەم ڕێگایە و لە چارەی هەموو ئەوانە نووسراوە کە ئەرکی فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە ئەنجام ئەدەن. جا لە پێناوی ئەوەی کە هەست بە گرنگیی ئەم کارە و، پایەداریی ئەوانەی کە تیایا بەشدار ئەبن، بکرێت، ویستم بیرتان وەها بجوڵێنم تا هێڵی بە یەك گەیشتن بچنن، بە تایبەت لە نێوان ئادەمی سەردارمان و پێغەمبەری سەردارماندا (عَلَيهِ أفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام).توند هەڵچوونیشم لە پیرۆزیی باسەکەوەیە، کە خەریکە هەست بکەم و بە ئەندێشە

---

[1] ژیاننامەی مامۆستا سەعید

ئاوازی زیکری ئەو مەردانە، لە پیاوانی حەق و حەقیقەت ببیستم.

هەر هەنگاوێك کە ئادەمیزاد لە پێناوی فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە هەڵیبگرێت، پاداشت و میراتگریی پێغەمبەرایەتیی دەستگیر دەبێت، چونکە ئەم فەرمانبەرییە مەزنە لە بنەڕەت دا فەرمانبەریی پێغەمبەرانە. بۆیە هەر مرۆڤێك هەنگاوێکی تێدا هەڵبگرێت، مانای وایە خوای گەورە بە بەخشایشی خۆی ئەم فەرمانبەرییەی پێبەخشیوە، و بەپێی نییەت و پلەی ئەو کەسە خۆی پاداشتی ئەم فەرمانبەرییەی دەست ئەکەوێت.

شایانی باسیشە کە لێرەدا ئاماژە بۆ کارێکی تر بکرێت، کە ئەویش ئەوەیە: لەبەرئەوەی کە ئەم فەرمان بەرییە فەرمانبەریی پێغەمبەرانە سەلامیان لێ بێ و هەمووشیان لەسەر ئەو ڕێ ڕاستەن کە خوای پاك و بێگەرد فەرمانی پێداوە، کەواتە ئەوانەی کە ئەم فەرمان بەرییە "فەرمان دان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لە خراپە" ئەنجام دەدەن، ئەوانیش بەلایەنی کەمەوە، بەپێی پلەی ئەنجام دانیان بۆ ئەم فەرمان بەرییە، لەسەر ئەو ڕێ ڕاستەن.

ئەنجامیش بەو شێوە دەبێت کە: لەسەر ئیماندار پێویستە بەجوانی ئەم فەرمانبەرییە - واتە تەبلیغ - کە خراوەتە ئەستۆی، مافی خۆی پێبدات، بۆ ئەوەی ببێتە زامنی ئەوەی کە لەلای پەروەردگاری مەزن بە ئیماندار وەر بگیرێت و، لەسەر ئیمان بەو فەرمانبەرییەش بمێنێتەوە، ئەمەش بە بۆنەی پەیوەندیی نزیکی نێوان هەردووکیانەوە. جا تاکەکان و هەروەها کۆمەڵەکانیش ناتوانن بوونی خۆیان بسەلمێنن و بەردەوامیش بە بوونیان ببەخشن هەتا مافی تەواوی ئەم فەرمانبەرییە جێبەجێ نەکەن. بە ڕاستی نهێنیی بوونی ئیماندار و، مەرجی مانەوەشی بە ئیماندارێکی ڕاستەقینە ئەوەیە کە: حەق و حەقیقەت لە ژیانی دا جێبەجێ بکات و، لەبەردەم ستەم دا بەوێنەی شەیتانی لاڵ بێ دەنگ نەبێت و، ژیان بە شتێکی

بێ بایەخ بژمێرێت، لە مردن نەترسێت، هەمیشە لە بازنەی تێگەیشتنی هاوەڵە بەڕێزەکان دا بێت، ئەم فەرمانبەرییە بڵندەش بە مەبەستی ژیان دابنێت. بە راستیی ئەو رۆژانەی کە لە خزمەتی ئەو کارانەدا بەسەر نەبران، چاك لە دەست دەرچوون. بۆیە لەسەر هەموو ئیمان دارێك پێویستە پەنا بەرێتە ژێر باڵی رەحمەتی خوای پاك و بێگەرد و پەنا بەخوا بگرێت لە هەر کۆمەڵێك کە ئەو فەرمانبەرىیە ئەنجام نادات.

کاتێك کە مرۆڤ ئەم فەرمانبەرىیە ئەنجام دەدات، ئەبینێت بە ئاسانیی دەتوانێت ئەو بیر و بۆ چوونانەی — کە ئیمانی پێیان هەیە و ئامادەیە خۆی لە پێناویانا بکاتە قوربانیی- بکاتە ژیان، سەرەڕای ئەوەش کە ئیمانەکەی لە بۆشایی دا نابێت. چونکە لە راستیی دا ئیسلام بریتییە لە گوزەران پێکردن و لەگەڵدا ژیان. خۆ ئەگەر نەکرێتە ژیان کەس لێیتێناگات. ئەو مرۆڤەش کە ئیمان و بانگەواز دەکاتە چەقی هەموو شتێك، هەموو چالاکی یەکی ژیانی بە دەوری ئەو چەقەدا دەهۆنێتەوە. یەکەم بنچینەیەك لەو پێنج بنچینەیەی کە لەسەر ئیماندار واجبە بیان پارێزێت، ئاینە. (پێنج بنچینەکە ئەمانەن: ئاین، عەقڵ، وەچە، سامان، مرۆڤ خۆی).

بێگومان مرۆڤ پارێزگاریی لە ناموس و شەرەف و سامان و، ژیان و وەچە و عەقڵی خۆی دەکات، بەڵام لەسەری پێویستە یەکەم جار پارێزگاریی لە ئاینەکەی بکات. ئەمەش نیشانەی ئەوەی کە چ بایەخ و گرنگی یەك بە ئاینەکەی دەدات، بگرە دیارترین هەڵوێست، کە ئەوە دەربڕێ ئەو تاکە تا چ رادەیەك پەیوەندیی بە خوای پاك و بێگەردەوە هەیە، ئەوەیە کە ئەو کەسە چەندە هەوڵدەدا و چەندە غیرەت دەخاتەکار بۆ پارێزگاریی لە ئاینەکەی. ئەوەش کە پێویستە هەرگیز لەیاد نەچێ ئەوەیە کە هەر کەسێ پارێزگاریی لەئاینی خۆی نەکا، ئەوا پارێزگاریی لە چوار بنچینەکەی تریش ناکات. لەوانەشە ئەم وانەیە راست ترین وانەیەك بێت کە

مێژوو فێرمان بکات و، لە هەموو وانەیەکیش زیاتر پەند و ئامۆژگاریی تێدا بێت.

خوای پاك و بێگەرد ئێمەی بەدیی هێناوە هەتا بی ناسین و بەخەڵکیشی بناسێنین. جا ژیان بەسەربردن بەپێی مەبەست و خواستی خوایی نهێنیی بەدیی هێنانمانە و، هەروەك قیامەتمان ئاوەدان دەکاتەوە، دونیاشمان ئاوەدان دەکاتەوە. بە پێچەوانەیشەوە بە سستی کردەکردن لەسەر ئەم خواست و ویستە خواییە کە زامنکەری ژیانی دونیایی و قیامەتییمانە، ئێمە سزا ئەدرێین، وەك ئومەتێك و کۆمەڵگایەك سزا ئەدرێین و، پەنا بەخوا بەرەو داوی فیتنە ملی ڕێ دەگرینە بەر. واتە هەر کاتێك ئەم فەرمان بەری یە مەزنە، فەرمانبەریی تەبلیغ، ئەنجام نەدرا، ئەوا کۆمەڵگا تووشی بەڵا و موێیبەت ئەبێت، ئەوە بوو ڕۆژێکیان پێغەمبەری ئازیز (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام)، هاوەڵان بەوێنەی خەرمانە دەوریان لیٚ دابوو و، هەموو ئەندامێکیان هەر گوێبوو بۆ بیستنی فەرمایشتەکانی. لەو ڕۆژەدا و، لەو زەمانە پاك و بێگەردەوە و، لەو فەرموودە شەریفەی دا کە ئەبویەعلا و ئیبن ئەبو دونیا دەیگێڕنەوە، چەند فەرمایشتێکی هەڕەشە و تیاچوونی فەرموون:

"لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام)، فەرموویەتی: " كيف بكم أيها الناس، إذا طغى نساؤكم وفسق فتيانكم؟" واتە: "خەڵکینە! بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر ئافرەتەکانتان لە سنوور دەرچن و، گەنجەکانیشتان دەست بدەنە فیسق و فجوور؟" وتیان: "ئەی پێغەمبەری خوا! شتی وا روو دەدات؟" فەرمووی: "نعم وأشد منه، كيف بكم إذا تركتم الأمر بالمعروف والنهى عن المنكر؟" واتە " بەڵیٚ، لەوەش خراپتر. بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر واز لە فەرماندان بە چاکە و دوورەپەرێزیی کردن لەخراپە بهێنن؟" وتیان: "ئەی پێغەمبەری خوا! شتی وەها ڕوو دەدات؟" فەرمووی: " نعم وأشد منه، كيف بكم إذا رأيتم المنكر معروفا والمعروف منكرا؟" [1]

١ أبو يعلي، المسند:٣٤/١١، الهيثمي، مجمع الزوائد: ٢٨١-٧/٢٨.

فەرمووی: "بەڵێ، لەوەش خراپتر. بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر خراپەتان بە چاکە و چاکەشتان بەخراپە دەزانیی؟ لەبەردەم ئەم فەرمایشتەدا هاوەڵان سەرسام بوون و واقیان وڕما، چونکە مێشکیان بەرگەی شتی وەهای نەدەگرت، لەبەر ئەوەی کە ئیمانیان وەها بوو ئەم جۆرە فیتنە و لەئاین لادانە لە کۆمەڵێك دا، کە تاقە ئیماندارێکی تێدا مابێ، روو نادات، بۆیە پرسیاریان دەکرد و دەیان وت: "ئەی پێغەمبەری خوا ! شتی وەها روو ئەدات؟"

ئەم پرسیارانەیان دەکرد و لە هەمان کاتیشدا سەرسام ئەبوون، کاتێکیش کە پێغەمبەر(عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) فەرمووی: "والذي نفسي بيده وأشد منه" واتە "قەسەم بەو خوایەی کە گیانمی بە دەستە لەوە خراپتریش، بارێکی نامۆ بەسەردا هات و، چاوەکان زاق بوون و، لە سەرسامییەکی زیاتردا جارێکی تر پرسیاریان کرد: جا چی لەوە خراپترە، ئەی پێغەمبەری خوا؟!!"

فەرمووی: " بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر خراپەتان بە چاك و چاکەشتان بە خراپە زانیی؟" جا با ئەم بەشەی ئەم فەرموودە شەریفە وەربگرین کە ئاماژە بۆ ئەم رۆژەمان ئەکات.

بەڵێ، فەرموودە شەریفەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کێشانە و پێوانەکان و بەهاکان بگرە هەموو شتێك سەرە و ژێر دەبنەوە. ئەو کاتە خراپە ئەبێتە چاکە و، چاکەش ئەبێتە خراپە و، داوێن پیسیی پەرەدەسێنێ ئاژاوە و تۆقاندن بڵاوە دەکات و گاڵتە بە ئیمان و قورئان ئەکرێت و ئیمانداران بەچاوێکی نزم سەیر دەکرێن، دەوڵەت بە پێی یاسا پارێزگاریی لە چەندین کردەوەی خراپ دەکات و ئەو راستییانەش کە تایبەتن بە ئاینەوە بە دواکەوتن و کۆنەپەرستیی دەژمێردرێن.

ئەمەش سەرەو ژێر کردنەوەی بەهاکان و کێشانە و پێوانەکانە. جا مرۆڤی ئەم چەرخە چەند قات و چەندین قاتی ئەم فیتنە و سەرگەردانییانە ژیانی

گوزەراندووە، پێشم وایە ماوەیەکی تریش لەگەڵیانا دەژی. ئەو کاتەش زەلیلیی و سووکیی جێی سەربەرزیی و ڕێزداریی دەگرنەوە، ئەگەر فەرمانبەریی "تەبلیغ" ئەنجام نەدرێت.

جا ئەگەر یاساکانی "فیترەت" چەوت بەکارهێنران، پێویستە شان بۆ سەرەنجامی خراپ و چارەنووسی حەتمیی شل بکرێت. هەر لە دێر زەمانەوە کار بەم شێوەیە بووە و، مرۆڤە ژیرەکانیش جگە لەوە چاوەڕوانی هیچی تر نەبوون. لەبەر ئەوە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە ویژدانیان ئەوەی بەلاوە گران بوو جارێکی تر پرسیاریان کردەوە : "ئەی پێغەمبەری خوا! شتی وەها روو ئەدات؟" واتە: "فەرمان بە خراپە دەدرێت و چاکەش بەخراپە بژمێررێت؟"

"بگرە لەوە خراپ تریش ئەبێت. بەلاتانەوە چۆنە ئەگەر فەرمانتان بەخراپە دا و دوورەپەرێزییشتان لە چاکە کرد؟" بەمانا کاتێك کە ئێوە کەس و کار و نەوە و وەچەکانتان پشت گوێ دەخەن و، ئەوانیش لەگەڵ تەوژمی خراپەکاندا ڕابماڵرێن، تا ئەو رادەیە کە بە کردەوە و رەوشت و هەڵس و کەوتتان فەرمانی خراپەیان بەسەردا بدەن و، بەرەو لە بیرچوونەوەی خوا و لە بیرچوونەوەی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی دەیاندەنەبەر. تیاچوون بۆ ئێوە: بۆ خۆتان و بۆ رۆژتان! لێرەدا سەرسوڕمان و سەرسامیی بەلای هاوەڵە بەڕێزەکانەوە گەیشتە ئەوپەڕی، بۆیە بەدەنگی پچڕ پچڕەوە پرسییان:

- ئەی پێغەمبەری خوا ! شتی وەها روو ئەدات؟

- بەو خوایەی کە گیانمی بەدەستە لەوە خراپتریش روو دەدات.

هەروەها فەرمووی: "فتن كقطع الليل المظلم يتبع بعضها بعضا تأتيكم مشتبهه كوجوه البقر لا تدرون أيا من أى." [1]

١ (مسند أحمد ٢٢٢٣٩مسند الأنثار)

فەرمووی: ”چەندین فیتنەتان دێنە ڕێ کە وەك پارچەی شەوی تاریك وەهان و بەدوای یەك دا دێن و بە وێنەی دەم و چاوی مانگا وەهان لە یەك ئەچن و بۆتان جیا ناکرێنەوە.“

جا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بە روون کردنەوەیەکی پڕ لە ئیعجاز، سەرەنجامی خراپە کە لە پەینەبردن بە گرنگیی ئەم فەرمانبەرییە مەزنەوە روو نەدات، بۆ ئوممەت روون ئەکاتەوە. لە راستی دا ئێمە هەر هەمووومان ئەم فەرمانبەرییە خراوەتە ئەستۆمان. جا لە قووڵایی دڵەکانمان دا ناڵین و ئاخ و نۆفی گوناه و تاوانی سێ سەدەی رابردوو کۆبوونەتەوە و، تاکە چارەسەریش بۆ لابردنی ئەو ناڵە و ئێش و ئازارانە، کارکردنە بۆ ئەوەی ئوممەت جارێکی دیکە پەی بە گرنگیی ئەو فەرمانبەرییە بباتەوە، کە پێغەمبەرە بەڕێزەکان سەلامیان لێ بێ گرتبوویانە ئەستۆ و، بڕیاریان دابوو کە ئەنجامی بدەن.

## چەمکەکانی بانگەواز، تەبلیغ و فەرمانکردن بە چاکە و دوورەپەرێزیکردن لە خراپە چ مانایەك دەگەیەنێت؟

یەکێکی تر لە پێناسەکانی جیهاد، گەیاندنی ئیسلامە بە کەسانی دیکە، واتە فەرمان بکرێت بە چاکە و هەوڵی دوورکەوتنەوە لە خراپە بدرێت، کەواتە مرۆڤێك کە لە ژێرناوی گەیاندنی حەق و حەقیقەت بە مرۆڤەکان تەبلیغ و بانگەواز و فەرمان بە چاکە بکات ئەوا وەکو جیهادێك وایە بۆی.

ئێستاش بە دەستپێکردن لە وشەی تەبلیغەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەم چەمکانە دەدەین:

مانای "تەبلیغ" گەیاندنی هەواڵێکە، بەمانا ناینییەکەی گەیاندنی شتێکی چاك و قەبووڵکراو دێت، واتای تەبلیغ بریتییە لە گەیاندنی هەواڵ. واتە بریتیە

له گەیاندنی شتێکی پەسەندکراو، گەیاندنی شتە چاکەکان و پاکیەکەیان و خێرداریەکەیان بە کەسانی دەورویەر و بانگهێشتکردنیان بۆ پەسەندکردنی ئەم بانگەوازە. بە مانایەکی تر تەبلیغ بریتیە لە گەیاندنی ئەو حەقیقەتانەی کە ئیسلام ڕایگەیاندووە و بانگکردنی مرۆڤەکان بۆ ڕێگەی راست و خۆشەویستکردنی ئەم ڕێگەیە لەلایان.

ڕیشەی تەبلیغیش بریتییە لە " امر بالمعروف نهی عن المنكر" واتە فەرمان "کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە"، معروف واتە ئەو شتانەی کە ئاین فەرمانی پێکردووە و منکریش واتە ئەو شتانەی کە ئاین نەهی لێکردووە، بە واتایەکی کە "معروف" ئەوەیە کە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا هاوتایە و پەیڕەویی لە فەرمانەکانی قورئان و سوننەت دەکات، ئەو شتەشی کە خوای گەورە پێی ڕازی نییەو حەرامە و گوناهە پێی دەوترێت"منکر".

بانگەوازیش بریتییە لە بانگهێشتکردنی مرۆڤەکان بۆ سەر ڕێی حەق و حەقیقەت و ڕێگەی ڕاست و کردەوەی چاك و هەموو جۆرە چاکەیەك کە مرۆڤ بە بەختەوەری هەردوو دونیا بگەیەنێت، ئەو کەسانەی کە ئیرشاد دەکرێن دەگونجێت موسوڵمان بن دەشگونجێت غەیری موسوڵمان بن. بانگەواز کردنی غەیری موسوڵمان بانگهێشتکردنیانە بۆ ئیسلام و ئیمان.

بانگەوازکردنی موسوڵمانانیش بریتیە لە تەڵقین کردنیان بە ڕەوشتی جوان و کردەوەی چاك.

## بانگەواز و تەبلیغ ئامانجی بەدیهێنانی باوەڕدارانە

هەموو ئیماندارێك کە باوەڕی بە خوای گەورە هێناوە پەسەندبوونی لە لای پەروەردگاری و گەرەنتی مانەوەی بە ئیمانداری پەیوەستە بە بەجێهێنانی ئەو فەرمانبەریی و بانگەواز و تەبلیغەی کە لەسەر شانیەتی، تاکەکان و

کۆمەڵگەکانیش، بەردەوامبوونیان تەنها و تەنها پەیوەستە بە بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانیان، کە بانگەواز و تەبلیغە لە بەرئەوەی ئەمە ئامانجی دروستبوونمانە.

هەڵسوکەوتکردن بەپێی ئەم ئامانجە هەم دونیاکەمان هەم ئاخیرەتیشمان ڕزگار دەکات. چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت : "با بەردەوام لەناو ئێوەدا کۆمەڵێ هەبن ئەمر بە چاکە بکەن و نەهی لە خراپە بکەن، ئامۆژگاری خەڵکی بکەن و ڕێی ڕاستیان نیشان بدەن ئەمجۆرە کەسانە لە هەموو کەس چاکتر و سەرفرازترن". (آل عمران /٣-١٠٤)

پێچەوانەی ئەمەش، پێغەمبەری خوا لە یەکێك لە فەرموودەکانیدا ئاماژە بە بارودۆخە سامناکەکە دەکات و دەفەرموێت: "حاڵتان چۆن دەبێت؟ئەو ڕۆژەی کە ئافرەتان سەرپێچی دەکەن و پۆشتەیی فەرامۆش دەکەن و دەکەونە سەر شەقامەکان وخراپەکاری لە هەموو شوێنێکدا بڵاو دەبێتەوە و واز لە باسکردنی خوای گەورە دەهێنرێت؟" هاوەڵان لە بەرامبەر ئەم فەرموودانەدا توشی شوك بوون و چاویان ئەبڵەق بوو، لەبەرئەوەی ئەوان نەیاندەتوانی تەنانەت خەیاڵی بێ فەرمانی پەروەردگاریش بکەن. ئەوان لەو باوەڕەدابوون کە ئەگەر لەناو کۆمەڵگەیەکدا تەنها یەك ئیمانداریش بمێنێتەوە حاڵەکە بەو ڕادەیە شلۆق نابێت.

بۆیە وتەکانی پێغەمبەری خوا زۆر کاری تێکردن، یەکسەر پرسییان:"ئەی پێغەمبەری خوا ئەم شتانە روو دەدات؟ "پێغەمبەری خواش فەرمووی:"سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، لەمە خراپتریش ڕووئەدات. کە ئەمەی فەرموو کەشەکە زیاتر شێواو و هەموو تۆقیبوون."

وتیان : "ئەی پێغەمبەری خوا لەمە خراپتر چی ڕوودەدات"؟

پێغەمبەری خوا لە وەڵامدا فەرموی:

" ئەگەر بزانن حاڵتان چۆن دەبێت، ئەو کاتەی هەموو خراپەکان بە چاکەو

هەموو چاکەکانیش بە خراپە دەزانرێت“.

هاوەڵان دیسان بە سەرسامیەوە پرسییان: ”ئەی پێغەمبەری خوا ئەمشتانەش دەبێت“؟ واتە بە خراپە فەرمان دەکرێت و ڕێگە لە چاکە دەگیرێت؟

- ”لەمە خراپتریش ڕوو ئەدات!“

- ”ئەی پێغەمبەری خوا لەمە خراپتر چی ڕوودەدات“؟

- ”دەبێت ئەو ڕۆژە حاڵتان چۆن بێت کەلە بەرامبەر خراپەکاندا بێدەنگی دەنوێنن هەر بە وێنەی ئەوەی کە هاندەر و پشتگیر بن، وای بە حاڵتان.“

- ”ئەمەش ڕوودەدات ئەی پێغەمبەری خوا؟“

-”بەڵێ تەنانەت لەمە خراپتریش ڕوو دەدات.“

لەمکاتەدا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) سوێندی بە خوای گەورە خوارد و ئەم فەرموودە قودسییەی گێڕایەوە؛ سوێند بێ کۆمەڵێکی لەم جۆرە بە وێنەی زریان فیتنەیان تێدا بلاو دەکەمەوە".

بەڵێ پێغەمبەری خوا بەمشێوەیە ئاماژەی بەوە دەدا کە ئەگەر فەرمانبەری بانگەواز و تەبلیغ وەکو خۆی بەجێنەهێنرێت زۆر بە سەختی لەسەر ئوممەت دەکەوێت، بۆ ئەوەی توشی ئەم بارو دۆخە نەبین، ئیماندار پێویستە کە ئەو ئەرکە سەرەکییەی کە دەکەوێتە سەرشانی فەرامۆشی نەکات و بە عەزم و هیممەتێکی بەرزەوە بەجێی بهێنێت.

مرۆڤەکانی ئەمڕۆ لە هەموو سەردەمەکان زیاتر پێویستیان بە تەبلیغە، واتە: ”فەرمانکردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپە"، لەبەرئەوەی پێغەمبەرایەتی لەگەڵ هاتنی پێغەمبەری خۆماندا بە پایان هاتووە و ئیدی ئەو دەرگایە بۆ هەتا هەتایە ناکرێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا لەمرۆماندا بە هێندەی هەموو سەردەمەکانی

پێشوو کوفر و سەرپێچی تێیدا زاڵە. هەر لەبەرئەمە، ئەوانەی کە لەمرۆماندا بەرپرسیارێتی ئەم فەرمانبەریە گەورەیەیان خستۆتە ئەستۆی خۆیان، لە مرۆڤە بانگەوازکارەکانی هەموو سەردەمەکانی تر زیاتر توشی ناڕەحەتی و ئەشکەنجە دەبن، هەر لەبەر ئەم ئەرکە قورسانەیە کە ئەو کەسانەی کە بانگەواز و تەبلیغ دەکەن، دەخرێنە پێشی هەموو ئەوانەی کە پێش ئەمان هاتوون و ئومێد دەکەین کە مورشیدان و موبەلیغانی ئەم سەردەمەمان ڕاستەو ڕاست لە دوای هاوەڵە بەرێزەکانەوە ڕیز بگرن."[1]

## تایبەتمەندییەکانی پاڵەوانانی بانگەواز

کۆمەڵە گەنجێك کە لە ڕووی ئاستی کۆمەلایەتییەوە هێندە بەرزبوون هەمووکەس ئاواتی پێدەخواستن، هێشتا لە ژیاندا بەر خەم و پەژارە نەکەوتبوون و هەموو ئەو نیعمەتانەی بەناوی دونیاوە هەیە خستبوویانە ژێرپێیانەوە، لیستەیەکیان ئامادەکردبوو و بۆ منیان هێنابوو، لە لیستەکەدا چەند ناوێکی تێدا بوو لە ژێرەوەش ئەم تێبینییەیان نووسیبوو:

"بۆ خاتری خوای گەورە دوعامان بۆ بکە، بۆ ئەوەی هەر ساتێکی ژیانمان لە پیناو خزمەتکردنی ئاین و میللەتەکەماندا بەکاربهێنین و لە کاتی هاتنی ئەجەلەیشدا بە پلەی شەهیدییەوە بچینە ئەو دونیا."

ئەم داوایە واتای سەر لە نوێبوونەوەی هاوەڵان دەگەیەنێت، بۆماوەیەکی درێژخایەن دووعام بۆ کردن بۆ ئەوەی تەمەنیان لە پێناوی ئاین بەسەربەرن و لەکاتی سەرەمەرگیاندا بە پلەی شەهیدییەوە بڕۆنەوە لای خوای گەورە، بە بێ ئەوەی لە تواناکانی خۆشم بڕوانم ناوی خۆشم خستە ناو لیستەکەوە.

---

۱ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، خولگەی بانگەواز

لە دەرگای فراوانی پەروەردگار نزام کرد و پاڕامەوە و ووتم، خوایە ئەو گەنجانە و هەزارانی وەکو ئەو گەنجانە دەبنە هۆی ئەوەی کە ئێمە ئاواتیان پێبخوازین و دڵەکانمان پەرواز دەکەن،بەبینینی ئەوان خۆشی هیواکانمان دادەگرێت و دەڵێین چیتر ئەم فەرمانبەرییە جێی خۆی دەگرێت. چونکە ئیتر گەنجانێك هەن کە بەگوێرەی باڵای ئەو مانایە و بەهاکەی نوێنەرایەتی ئەو مانا ئولوهییە بکەن و ئەمەش چاکەی نەبراوەی پەروردگارە بەرامبەرمان.

بەڵێ ئێستا ژمارەی ئەو مرۆڤانە زۆربووە و تەنانەت کاتێکیش دەخەون دڵیان بۆ مرۆڤایەتی لێدەدات، ئەمڕۆ هەزارەها گەنج هەن لە ڕۆحیاندا ئیزدراب و ژانی بێباوەڕی خەڵك دەچێژن.

بەم شێوەیە لەبەرامبەر ئەو کۆمەڵە گەورەیە لە هاوەڵان، نەوەیەکی نوێی پڕ ئومێد و پەیام هەیە کە بە بۆن و بەرامەی حەزرەتی موحەمەدەوە شانیان داوەتە ژێر ئەم داوا گەورەیە، وەکو ئامێری هەڵمکردن ناخیان بە ئاگری بەجێگەیاندنی ئەم پەیامە دەسووتێنن. پەروەردگارا کەم وکورتییەکانمان لەبەرچاو مەگرە و دڵمان مەشکێنە، ئامین.[1]

## باشترینی مرۆڤەکان کێیە؟

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَیْهِ) لەناو مەسجیدی نەبەویدا لەسەر مینبەر ڕاوەستاوە و لەپڕ پیاوێك خۆی دەکات بە ژووردا و دەپرسێ:باشترینی مرۆڤەکان کێیە؟ پێغەمبەری خواش بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە "باشترینی مرۆڤەکان ئەو کەسەیە کە فەرمان بە چاکە دەکات و ڕێگری لە خراپە دەکات و زۆر دەخوێنێتەوەو زۆر لە خوا دەترسێت و پەیوەندی خزمایەتی بە جێدەهێنێت"، لەم

١ محمد فەتحوڵلا گولەن ( پرسیارە گوماناوییەکانی سەردەم)

ئاماژانەدا ئەوە بەڕوونی دەردەکەوێت کە بۆ ئەوەی ببین بە ئیماندارێك کە ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی بەدەست بهێنێت، دەبێت حەقیقەتەکانی ئاین بە کەسانی دیکە بگەیەنین. چونکە ئەم فەرمانبەرییە لەوە گەورەترە کە مرۆڤ بچێتە کەنارێکەوە و خەریکی بەندایەتی خۆی بێت. ئەگەر وانەبووایە پێغەمبەری ئازیزمان لەماڵ نەدەچووە دەرەوەو پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە نەدەبوو و هەمیشە بە بەندایەتیەوە سەرقاڵ دەبوو. کەوابێ ئەگەر بمانەوێت ببین بە باشترینی مرۆڤەکان دەبێت هەلی جۆراوجۆر بقۆزینەوەو باسی پەروەردگارمان بۆ کەسانی دیکە بکەین و بیناسێنین.

ئەوەی مایەوە ئەوەیە کە ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە بەجێهێنانی ئەم ئەرکە، لە پاداشتی هەموو ئەوکەسانە بەشدار دەبێت کە بە هۆی ئەمەوە فێری هەرشتێکی جوان بووبوون. با بابەتەکە کەمێك ڕوونتر بکەینەوە، بۆ نمونە با وادانێین ئیماندارێك بووە هۆکاری ئەوەی کە کە هاوڕێیەکی ئیمان بهێنێت و کردەوەی باش ئەنجامبدات، ئەوکاتە لە هەموو ئەو پاداشتانەی کە ئەم کەسە دەستی دەکەوێت بە هەمان شێوە دەدرێت بەو هاوڕێیەی کە بۆتە هۆکاری ئەم جوانییە. لەبەر ئەوەی پێغەمبەری نازدار لە یەکێك لە فەرموودەکانیدا دەفەرمووێت: "من دل علی خیر کالفاعلیه."[1] واتە: "هەرکەسێك ببێتە هۆکاری چاکەیەك، وەکو ئەوە وایە خۆی ئەو کارە چاکەی کردبێ."

وەکو دەبینرێت هەر هەنگاوێك کە لەم پێناوەدا دەدرێت بەو شێوەیە خاوەنەکەی توشی ئەو هەموو پاداشتە گەورەیە دەکات. ئەمەش گرنگی فەرمانداان بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپەمان زیاتر بۆ دەردەخات.

1. احمد بن حنبل، مسند ٤٣٢

## بانگەواز و تەبلیغ ئەرکی ئیمانداره

خوای پەروەردگار سەبارەت بەم بابەتە لە ئایەتێکدا بەم شێوەیە دەفەرمووێت:"خاوەن ئیمانەکان لە ژنان و لە پیاوان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن و یەکتریان خۆش دەوێت، ئەمر بە چاکە دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن ونوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەمانە خوای گەورە ڕەحمیان پێدەکات و خوای گەورە سەردارە بەسەر کاری خۆیداو کارەکانی پڕ حیکمەتن."[1]

ئایەتە پیرۆزەکە فەرمانکردنی ئیماندارێك بەسەر ئیماندارێکی تردا بۆ کاری چاکە و نەهیکردن لە کاری خراپە بەبەشێك لە فەرمانبەرێتی ئیمانداری دادەنێت، ئەم بەرپرسیارێتییەش وەکو وەسفی جیانەبووەوەی بوون بە ئیماندار نیشاندراوە.

ئەم فەرمانبەریە بۆچی هێندە گرنگە؟لەبەرئەوەی پەیوەستە بە پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی ئاسودە و بەستراوە بە دوورخستنەوەی مرۆڤەکان لە هەموو جۆرە خراپەیەك، خراپەکان بە وێنەی ڤایرۆسن، ئەگەر لە کاتی خۆیدا بنەبڕ نەکرێن دەگاتە هەموو لەش و پێیدا بڵاو دەبێتەوە و مرۆڤەکە توشی ئیفلیجی دەکات. ئەو خراپییانەی کە بۆتە هۆکاری بە هیلاك بردنی کۆمەڵگە، بەهۆی بڵاوبونەوەی ئەو گوناهانەوە بووە کە هەرلەسەرەتاوە بە بچوك زانراوەو ڕێگە لە بڵاوبونەوەی نەگیراوە.

بزانن سەروەرمان لە یەکێك لە فەرموودەکانیدا چۆن سەرنجمان بو ئەم مەترسیە ڕادەکێشێت و ئاماژە بە دارمانی کۆمەڵایەتی لەناو نەوەکانی ئیسرائیلدا دەکات:

" کاتێك یەکێك لە ئەوان خراپەیەکی ئەنجام دەدا ، هاورێکەی ئامۆژگاری

---

١ التوبة، ٧١

دەکردو دەیوت: ئەی فلان کەس ئەو کارەی تۆ دەیکەیت حەڵاڵ نیە وازی لێبێنە، بۆ سبەینێ ئەم کەسە لەسەر بە ئەنجامگەیاندنی هەمان خراپە بەردەوام دەبێت، هاورێکەی بەردەوامی بە دۆستایەتیەکەی نێوانیان دەداو، لەگەڵ ئەودا هەڵدەسا و دادەنیشت و دەیخوارد و دەیخواردەوە، "لەسەر ئەمە خوای تەعالاش دڵەکانیانی بەیەك چواند."

لە پاشاندا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرمووێت ئەوانەی لە نەوەی ئیسرائیل ئینکاریان کردووە، لەسەر زمانی پیغەمبەر داود و عیسای کوری مەریەمەوە لەعنەتیان لێکراوە. ئەمەش بەهۆی سەرپێچی کردونیان و زیادەرەویکردونیان بوو، لەدوای ئەوەی کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: "ئەوانەی قەدەغەی یەکترییانن دەکەرد لە خراپەکاری، سوێند بێت بەخوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و ناپەسندە."،[1] فەرمووی: "نا وەڵڵاهی دەبێت فەرمان بە چاکە بکەن و نەهی لە خراپە بکەن و دیسان دەبێت دەستی ستەمکار بگرن و بیهێننە سەر رێی حەق."[2]

لێرەدا کاتێك باس لە هەندێ لە نەوەی ئیسرائیلییەکان کرا کە رەواجیان بە خراپەکاری داوە، ئاگاداری ئیمانداران دەکرێتەوە کە بەهەمان رێڕەودا تێنەپەڕن. لەبەرئەوە لێرەدا دەکرێت بڵێین کە فەرمانبەرانی بانگەواز و تەبلیغ وەکو فریادرەسێك وەهان کە کۆمەڵگە لە بەهەلاك چوون دەپارێزن. چونکە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، "فەرماندان بەچاکەو نەهیکردن لە خراپە"بە ئەنجام بگەیەنرێت ئەوا خوای تەعالا ئەو کۆمەڵگەیە لە لەناوچوون دەپارێزێت.

پێغەمبەری خوا سەبارەت بەمە لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "نمونەی ئەوانەی کە فەرمانەکانی خوای گەورە بە جێدەهێنن و ئەوانەی کە بەجێی ناهێنن وەك نمونەی ئەو کەسانە وان کە لە هەمان کەشتیدا رێبوارن، هەندێکیان لە نهۆمی

١ سورەتی المائدة، ٧٨-٧٩

٢ ابو داود، ملاحم ١٧؛ ابن ماجه، الفتن ٢٠

سەرەوەدان و هەندێکیان لە نهۆمی خوارەوە، ئەگەر ئەوانەی سەرەوە بڵێن دەرچەیەك دەکەینەوە و ئەوانەشی لە نهۆمی خوارەوەدان بەوانەی سەرەوە بڵێن ئێمەش بۆ ئەوەی ئێوە نارەحەت نەکەین کە ئاومان ویست هەر لێرەوە کونێك دەکەینە کەشتیەکە، بێگومان هەردوولاتیادەچن.«[1]

لە ڕاستیدا ئەم ئاماژانەی پێغەمبەری خوا خۆی لە خۆیدا نمونەیەکە، بەڵێ لێرەدا پێغەمبەری خوا مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتیی زۆر گرنگمان بۆ دەخاتە ڕوو بە پێی توانای تێگەیشتنی ئێمە. لێرەدا ئەوانەی کە دەیانەوێت کەشتیەکە کون بکەن، لەسەرەتادا ئەم داوایەیان وەکو شتێکی زۆر بەریئانە و بێتاوانانە دەردەکەوێت، بەڵام دەرەنجامەکەی بێتاوانانە نییە.

لەم فەرمودەیەوە دەتوانین بڵێین دونیا وەك کەشتیەکەی نوحەو، هەموو مرۆڤایەتیش بە بێ ئەوەی مافی هیچ هەڵبژاردنێکیان هەبێت سواری ئەو کەشتیە بوون. چونکە لەم دونیایەدا هەموو ناچارین کە لە هەمان زەویدا ژیان بەسەربەرین. واتە ئەو کەشتییەی کە تێیدا دەژین یاخود ئەو پاپۆڕەی کە سەفەری پێدەکەین یەك دانەیە، لەمە زیاتر نییە. پارێزگاریکردنی ئەو کەشتیەی کە تیایداین لە نقوم بوون و لە ناوچوون ئەرکی هەمووما‌نە. ئەم ئەرکە هەر لەگەڵ سواربوونی پاپۆڕەکەوە لەئەستۆمان نراوە.

ئەرکی سەرشانی هەمووما‌نە لە لایەك ڕێگە بگرین لە کاری خراپەو، مرۆڤایەتی لەشەڕی ئەوانە بپارێزین، لە لایەکی تریشەوە دەبێت ئەوشتانەی کە کردەوی چاك و ڕەوشتی جوانن بە مرۆڤەکانی بگەیەنین. خۆ ئەوە ئاشکرایە کە ئەو کۆمەڵگەیەی لە لایەن مرۆڤە فترەت پاکەکانەوە دێتە ئاراوە لە هەموو خراپەیەك دوورە. ئەمە ڕوویەکی مەسەلەکەیە و ئەگەر بێینە سەر ڕووەکەی تری، ئەویش

١ بخاري، شركة،٦

ڕەخساندنی هەلێکی وەهایە کە هەمیشە هەرشتی جوان و چاك بالاَبکات لەناو کۆمەڵگەدا. ئەمە ئەو فەرمانبەریەیە لە ئەستۆمان گرتووە بۆ کۆمەڵگەکەمان. فەرمانبەرییەکی موقەدەسەو بە هێندەی موقەدەسیەکەشی گرانە.[1]

## کارکردن لە پێناو ئایندا، فەرزی سەروو هەموو فەرزەکانە بۆ باوەڕداران

لەمرۆدا، ژیان لە چوارچێوەی بازنەی ئاین و کارکردن بۆ چەسپاندن وبلاَوکردنەوەی ئاین فەرزی سەروو فەرزەکانە بۆ باوەرداران. هیچ باوەردارێك ناتوانێت خۆی لەم بابەتە پەرِ گیر بکات. بەڵێ، هەر باوەردارێك دەبێت سەرەتا خۆی شارەزا بکات لە ئاینەکەی و پاشان رەنگی ئاین بە ژیانی ببەخشێت و پاشانیش هەوڵبدات ئەو ئاینەی کە ژیانی بە ژیانی خۆی بەخشیووە بگەیەنێتە کەسانی دی و ژیانی ئەوانیش بەم نوورە رووناك بکاتەوە.

لە نێو هەموو کۆمەڵ و گەلێکدا هەمیشە کەسانێك هەبوون کە پێویستیان بە بانگەوازکردن بووە. بەڵێ باوەرداران دەبێت مافی هاوسەفەریی ئەو کەسانە بدەن کە لەم کەشتیی ژیانەدا پێکەوەن و لە شیوەکانی گومڕاییدا کەوتوون و ژیانیان لە پێناو کۆمەڵێك شتی پووچدا بەزایە دەروات و بە زوبانی حاڵ هاوار بۆ رزگاربوون دەکەن. ئەمە لە لایەکەوە ئەرکێکی مرۆڤایەتیەو لە لایەکی دیکەشەوە بەرپرسیارێتیەکە کە لە لایەن خواوە خراوەتە ئەستۆمان. هەمووان بەپێی تواناو لەوچوارچێوەیەی تێیدان بەرپرسن لە بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە. بەپێچەوانەوە ئۆباڵی ئەم کارە زۆر سەخت دەبێت لە رۆژی دواییدا!.

گەر کەمێك بە وردی لە مێژوو بروانین دەبینین ئەو کەسانەی بە مافپێدانەوە

[1] موحەممەد فەتحوللا گولەن، خولگەی ئیرشاد

ئەرکی بانگەواز و گەیاندونیان بەجێهێناوە، هەردەم لە چوارچێوەی ئەم بنەمایانەدا هەڵسوکەوتیان کردووە.[1]

پاش ئەوەی ئەو ئەرکە پیرۆزە بە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ‌اللهِ‌وَسَلَامُهُ‌عَلَيهِ) سپێررا، سەرجەم ژیانی لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکەیدا بەسەر برد. ماڵ بە ماڵ دەگەڕا و لە سۆراخی دۆزینەوەی کەسانێکدا بوو کە قەبووڵ کردنی پەیامەکەی لێ ڕادەبینن. کاردانەوەی بەرەی نەیار لە سەرەتادا بریتی بوو لە بایەخ پێنەدان و فەرامۆش کردن. پاشان گۆڕا بۆ لاقرتێ و گاڵتەپێکردن. لە دوا قۆناغیشدا پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی گشت جۆرەکانی زەبر و زەنگ و ئەشکەنجەدان. دڕك و داڵیان فڕێ دەدایە سەر ڕێگاکەی و، کاتێکیش بۆ نوێژ دەوەستا، پاشەڕۆی ئاژەڵیان بەسەردا دەکرد و هەموو چەشنە بێ حورمەتییەکی پێ ڕەوا دەبینرا. بەڵام پێغەمبەری خوا بە هیچ کام لەمانە، بێ ئومێد نەبوو و ورەی نەڕووخا . چونکە ئەو لە پێناوی ئەمەدا نێردرا بوو. بۆیە دەبینی تەنانەت چەندین جار سەردانی سەرسەختترین دوژمنەکانیشی دەکرد و پەیامی خوای پێ ڕادەگەیاندن.

بەڵێ، دەبێ چەند جار ڕۆیشتبێ بۆ لای دوژمنانی ئاینەکەی هاوشێوەی: ئەبوو جەهل و ئەبوو لەهەب و، حەق و حەقیقەتی بۆ باس کردبن؟! پێغەمبەر (صَلَوَاتُ‌اللهِ‌وَسَلَامُهُ‌عَلَيهِ) لە ناو بازاڕەکاندا دەگەڕا و بە ئومێدی ئەوەی ببێتە مایەی هیدایەتی کەسێك، یەکە یەکەی دەوارەکان دەگەڕا. بەڵام گشت دەرگاکانی بەڕوودا دادەخران. لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرفەتێکی تردا لە هەمان دەرگای دەدایەوە و، هەمان شتی دووبارە دەکردەوە. کاتێك مەککە چی تر نەیدەتوانی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ‌وَسَلَامُهُ‌عَلَيهِ) لە ئامێز بگرێ، کۆچی کرد بۆ مەدینە تاکو لەوێ بەردەوام بێ لە بڵاوکردنەوەی نوور و هیدایەتدا.

---

١ محمد فەتحوڵلا کولەن، بەرزکردنەوەی ناوی خوا یان جیهاد،٧

بەڵام بۆ ساتێکیش ئەرکی تەبلیغی فەرامۆش نەکرد. سەرجەم لایەنەکانی ئاین، تا دەگاتە بچووکترین مەسەلە، هەمووی ڕوون کردەوە و گەیاندی. بە درێژایی مانەوەی لە مەدینەی مونەووەرەدا و، وێڕای دەرگیر بوونی لەگەڵ دەوڵەتانی دیکە، هەرگیز بانگەوازی تاکەکانی پشتگوێ نەخست.

پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بیست و سێ ساڵی ڕەبەق بەرپرسیارێتییەکی سەنگینی وەك پێغەمبەرایەتی هەڵگرت و بە سەرکەوتوویەکی بێ وێنە کە بۆ هیچ خاوەن بانگەوازێکی تر نەڕەخساوە، بەجێی گەیاند.[1]

١ محمد فەتحوڵلا کولەن، نوری نەمر، بەرگی یەك ٦١-٦٢

## شێوازی بانگەوازکردن لای گەنجان پێویستە چۆن بێت؟

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، پێویستە موسوڵمان لە هەر تەمەن و ئاستێکدا بێت دەبێت ئەو بابەتانەی پێویستیان بە ڕوونکردنەوە و تەبلیغ هەیە بە چواردەورەکەی بگەیەنێت. ئەمە گرنگترین ئەرکی ژیانی مرۆڤە. حیکمەتیش لە ناردنی پێغەمبەران، بە جێهێنانی ئەم ئەرکەیە. بەڵێ ئێمەش ئەرکێکی هێندە پیرۆزی لەم شێوەیەمان لە ئەستۆ گرتووە. خزمەت کردن لەم بواردا پێشبڕکێکردنە لە (فەزیلەتدا)و ئەوانەشی لەم مەیدانەدا سەرقاڵی خزمەت کردنن،خاوەن گەورەترین فەزیلەتەکانن.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هزر و بیرو بۆچونەکان نامۆ کراون بەرامبەر ئیسلام. وەك بڵێی موسوڵمانێتی خراوەتە دەرەوەی کایەکانی ژیان.هەمیشە وا نیشاندراوە کە زانست و پێشکەوتن دژی ئاینن و بەم وڕێنانە توێژەکانی کۆمەڵگا خەڵەتێنراون! بۆیە پێویستە شارەزایی باشمان دەربارەی بنەماکانی ئیسلام و ئیمان و مەبەستەکانی قورئان و سونەت هەبێت و پاشان بە شێوەیەکی حەکیمانەو هەنگاو بە هەنگاو و بێ زۆر لێکردن ئەم پەیامە نوورانیە بە کەسانی دیکەش بگەیەنین.

بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هەر کارێك کۆمەڵێك ڕێکاری تایبەت بەو کارە پێویستە بگیرێتە بەر. پشتگوێ خستنی ئەم ڕێکارانەش دەبێتە هۆی پوکاندنەوەی کارەکەو لەبارچونی خەونی بە ئەنجام گەیشتنی. کەوابێ، پیرۆزترین کارێك کە بریتیە لە ئیرشادو تەبلیغ "فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگریکردن لە خراپە"و بانگەوازکردن بۆ ئاین،ڕێکارو ڕێبازی تایبەت بە خۆی هەیە.

بۆ ئەوەی بەجوانترین شێوە کاری ئیرشاد و تەبلیغ بە ئەنجام بگەیەنرێت و مافی خۆی پێ بدرێ پێویستە ڕەچاوی چەند خاڵێك بکرێت، لێرەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی ئاماژەیان بۆ بکەین:

## ١) پێویسته بەباشی شارەزای ئاینەکەمان بین

لە پێش هەموو شتێکەوە ئەو کەسەی کە کاری تەبلیغ بەجێ دەگەیەنێت دەبێت بە باشی لە بنەماو ناوەڕۆکی دینەکەی شارەزا بێت و خۆی پێبگەیەنێت. بە پێچەوانەوە، ڕەنگە لەم ڕێگەیەدا توشی چەندەها هەڵە ببێت و لە ئەنجامدا کەسانی دەوروبەری لەخۆی و لە ئاینەکەشی بخاتە گومانەوەو بسڵەمێنەوە. سەرەتا دەبێت زۆر بە باشی شارەزای "قورئان ی پیرۆز "بێت. هەوڵ بدات لەگەڵ فێربوونی خوێندنەوەکەیدا پەی بە واتاو مەبەستەکانی ببات، پێویستە بۆ ئەمەش سوود لە تەفسیرەکانی قورئان وەربگرێت. زیاد لەوە دەبێت شارەزایی لەسەر ژیانی ئازیزمان(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ)و فەرموودە پیرۆزەکان و ژیانی هاوەڵاندا هەبێت و زانیاریی دەربارەی هێڵە گشتیەکانی مێژووی ئیسلام هەبێت. لە پاشان دەبێت زانیاری لەسەر" فیقهی ئیسلامی "هەبێت و ئەو کتێبانەش بخوێنێتەوە کە باس لەو حەقیقەتانە دەکەن کە ئەم ئامانجی گەیاندنیانی هەیە.

بۆ فێربوون و شارەزابوون لە دینەکەمان دوو سەرچاوەمان هەیە کە "قورئان و سوننەتن". لە کاتێکدا شتێك بە ناوی ئیسلامەوە باس دەکەین، دەبێت لە چوارچێوەی ئەو دەستوورانەدا بێت کە لەم دووسەرچاوە سەرەکییەدا ئاماژەیان پێکراوە ودەبێت هێندە شارەزای پەیدا بکەین کە بتوانین بە باشی بیگەیەنین. ئەو شتانەشی کە باسیان دەکەین دەبێت پێشتر خۆمان پێی ئاشنا بووبین و باش لێی تێگەشتبێتین تا بەرامبەریش بتوانێت بە ئاسانی وەریان بگرێت.

وەکو مامۆستا نورسی ئاماژەی پێدەکات، دەبێت ئێمە وەکو "مەڕ" وابین کە شیری پاك دەداتە بێچووەکانی نەك وەکئەو باڵندەیە "مەل" کە ڕشانەوەی خۆی دەکات بەدەم بێچوەکانییەوە و دەرخواردیانی دەدات. پێویستە ئەو شتانەی کە پێیان ئاشنا دەبین بە باشی لێیان شارەزابین و پاشان وەك شیرێکی شیفا بەخش

پێشکەشی ئەو دڵانەی بکەین کە پێویستیانە. بەم شێوەیەش، کاتێ زانیاریەکان چووە ناو ڕۆحیانەوە،ئەو زانست و زانیاریانە ڕەگ دادەکووتێت و پاشان چنار ئاسا گەشە دەکات. بێگومان ئەمەش بە خوێندنەوە و تێگەیشتن و دەوڵەمندکردنی پاشخانی ڕۆشنبیری و زانستیمان دێتە دی. هەربۆیە ئەو کەسانەی کە بانگەوازیان وەك فەرمانبەرییەك لە ئەستۆ گرتووە، بە دڵنیاییەوە دەبێت بەشێکی دیاری کراوی کاتەکانیان بۆ خوێندنەوە تەرخان بکەن. کەسێکی بێبەش لە فەرهەنگی سەردەمەکەی شتێکی پێ نیە کە بە دوێنراوەکانی بگەیەنێت. بە واتایەکی دی، ئەو کەسەی کە ئاستی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری تەسك بێت، ناتوانێت دوێنراوەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ تێر بکات. لەبەر ئەوە ئەو بانگەوازەی بەریەککەوتنی لەگەڵ هەموو توێژەکاندا هەیە دەبێت ئەو بابەتانەی کە دەیگەیەنێت، هێندە شارەزایی دەربارەیان هەبێت کە بتوانێت دڵی دوێنراوەکانی تێر بکات.

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە بانگەوازیان کردووەتە ئامانجی ژیانیان دەبێت خۆیان بە زانست و مەعریفە پڕچەك کردبێت. گەر مرۆڤێك کە تێشووی زانستی خاڵی بێت، گوفتارەکانی پوچ و بێ سوود دەبن. ئەم کەسانە بۆ داپۆشینی پوچی و بێ ئەرزشی ئەو قسانەی کە دەیکەن، پەنا بۆ بەکارهێنانی زەبرو توندوتیژی دەبەن. لە بەرامبەریشدا ، وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەو هەڵسوکەوتانەی ئەوان تەنانەت لەو بابەتانەش سڵ کردنەوە دروست دەبێت کە پەسەند کردنیان بە دیهی و بەڵگە نەویستن.

## ٢)پێویستە ڕەچاوی زانست و شێوازی سەردەمەکە بکرێت

لەم سەردەمەی ئێستاماندا، جیهانبینی مرۆڤەکان وخوێندنەوەیان بۆ ڕووداوەکان زۆر گۆڕاوە، لە ئێستادا لۆژیك و ئەقلانیەت سەنگ و قورساییەکی جیاوازی هەیە. ئەو توێژانەی کە تینووی باوەڕن، بە زمانی زانست و فەلسەفە دەدوێن.

لەبەرامبەر ئەمەشدا موسوڵمان پێویستە ڕەچاوی ئەم تایبەتمەندیانە بکات و هەوڵ بدات بەو شێوازە بەرامبەرەکانی بدوێنێت کە لێی تێدەگەن.

ئەمەش پەیوەندیەکی نزیکی بە تێگەیشتن لە ڕۆشنبیری و کلتوری سەردەمەکەمان دێتە دی. خۆ لەلایەکی دیکەشەوە عیلم و عیرفانی ڕاستەقینە بریتیە لەمە. دەشتوانین بڵێین عیلم و عیرفان بریتین لە دوو تایبەتمەندی کە هەرگیز لە کەسی باوەڕدار جیا نابنەوە.

لەم ڕۆژگارەی ئێستادا گەر بێتو بانگخوازانمان تەنانەت ئینسکلۆپێدیاش بن هێشتا هەر دەبێت پێویستیەکانی بواری زانست و تەکنەلۆجیای سەردەمەکە ڕەچاو بکەن. بە پێچەوانەوەبانگەوازەکەیان تایبەتمەندێتی گشتگیریی لەدەست دەدات و دەبێتە لێدوانێکی تایبەتی کە تەنها چەند کەسێکی کەم گوێیان بۆ دەگرێت.

ئەو مرۆڤەی کە شارەزای ڕۆژگارەکەی نەبێت، مانای وایە لە ناو ڕاڕەوێکی تاریکی تەسکدا ژیان بەسەردەبات. ئەم حاڵەتەش کاریگەری هەوڵەکانی ئەم مرۆڤە سەبارەت بە بانگەواز بۆ دین و ئیمان کەم دەکاتەوە. ئەمڕۆ نا سبەی لە ژێر پاڵەپەستۆی چەرخی ڕۆژگارو ڕووداوەکان ئەم مرۆڤە هیچ کاریگەری نامێنێت، لەبەر ئەوە دەبێت ئاستی ڕۆشنبیری موسوڵمان هاوتەریب و گونجاو بێت لەگەڵ سەردەمەکیدا و لەو چارچێوەیەدا پەیامەکەی بگەیەنێت.

## ٣)دەبێت بە دوای ئەوڕێگایانەدا بگەڕێین کە دڵی بەرامبەرمان بۆ دەکاتەوە

سەرەتا دەبێت بە دوای ئەو ڕێگایانەدا بگەڕێین کە وامان لێدەکات بچینە دڵی بەرامبەرەوە. ئەمە شێوازێکی لێك نزیکبوونەوەی مرۆڤانەیە. وەك پێدانی دیاریەك یاخود هاوکاریکردنی کەسێك لە لابردنی ناڕەحەتیەکیدا کە دوچاری بووە. کە خۆی لە خۆیدا جێبەجێکردنی ئەو بابەتانەیە کە ڕۆحی دین فەرمانی پێ کردووە. لە

پێناوی بەدەستهێنانی دڵی بەرامبەر پێویستە هەموو ڕێگایەکی پەسەندکراو بەکار بهێنرێت، ئەو مرۆڤەی کە دەمانەوێت شتێکی پێبگەیەنین پێش هەموو شتێك دەبێت ئێمەی بە دۆستی خۆی قبووڵ کردبێت، ئەمە فاکتەرێکی گرنگ و کاریگەرە بۆ پەسەندکردنی ئەو بیرو بۆچونانەی کە لەگەڵی دەگۆڕینەوە و نابێت هەرگیز فەرامۆشی بکەین.

## ٤) لەکاتی گفتوگۆدا پێویستە ڕەچاوی ئاستی تێگەیشتنی دوێنراوەکە بکرێت

پێویستە دابەزینە ئاستی دوێنراو لە کاتی باسکردنی بابەتێکدا، چونن ئەمە ڕەوشتێکی ئیلاهیە. پێغەمبەری خوا(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بانگمان دەکات بۆ ئەوەی ڕەوشتە خواییەکان لە خۆماندا ڕەنگپێبدەینەوە. قورئانیش بریتیە لە گوفتاری پەروەدگار کە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتای لە ئاستی ژیری مرۆڤدا دابەزیوە.

گەنجانی ئەمڕۆمان هەست بە نامۆیی دەکەن لەبەرامبەر زاراوە و ئاماژە دینیەکانەوە. پێویستە بەو شێوەیەی ئەوان لێی تێدەگەن گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت. هەروەك چۆن کاتێك دەمانەوێت پیاسە بە منداڵێکی سێ ساڵان بکەین، ئێمەش بە پێی هەنگاوەکانی ئەودەڕۆین و وەکو ئەوان قسە دەکەین و وەك ئەوان پێدەکەنین، بە هەمان شێوە دەبێت لەکاتی بە جێهێنانی ئەرکی بانگەواز و تەبلیغدا ڕەچاو کردنی ئاستی تێگەیشتنی دوێنراو مەرجێکی سەرەکیە.

## ٥) دورکەوتنەوە لە دەمەقاڵێ و مشتومڕی بێبنەما و بێمانا

لە گفتوگۆ دووقۆڵیەکاندا زۆر گرنگە وریابین لەوەی کە ئاڕاستەی قسەکانمان بەرەو دەمەقاڵێ و مشتومڕی بێ بنەما نەڕوات .چونکە لەم جۆرە قسەکردنانەدا دەنگی ئەنانیەت بەسەر حەقدا زاڵ دەبێت. جا قسەکانمان چەندە ڕاست و باوەڕپێکەریش بن، کاریگەریی لەسەر بەرامبەر درووست ناکات.

ئەگەر لە گۆشە نیگای دەروونناسیەوە سەرنجێك لە بابەتەکە بدەین لامان ڕوون دەبێتەوە لە کاتی هەوڵدان بۆ دەربڕینی حەق و حەقیقەت دەمەقاڵێ و مشتومڕ چەند بێسوودە. چونکە، چۆن ئێمە خۆمان ئامادە دەکەین بۆ ئەوەی بە سەر بەرامبەرەکەماندا زاڵ بین، بێگومان دوێنراوەکەشمان بە هێندەی ئێمە خۆی ئامادە دەکات. ئەو بەڵگانەی کە ئێمە دەیهێنین بێگومان ئەویش لە بەرامبەردا چەندین بەڵگەی پێچەوانە دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەی خۆی، بەوشێوەیە قسەکردنەکان لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دەخولێنەوە و ئەگەر چەندەها ڕۆژیش بەردەوام بین هەرگیز بە ئەنجام ناگەین.

## ٦) پێویستە متمانەی بەرامبەرەکەمان بەدەست بهێنین

دوێنراوەکەتان دەبێت هێندە متمانەی بە ئێوە هەبێت و هێندە وابەستەی ئێوە بێت کە ئەگەر ئێوە لەگەڵ هەموو خۆشەویستانیدا لە تەرازوو بدات، ئێوە قورستر دەربچن. چونکە پەیوەندی نێوان ئێوە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورەیە. لەبەرئەوەی ئێوە ئەوتان لەبەر خوا خۆش دەوێت، ئەو خۆشەویستیە کاریگەری لە دڵی ئەودا دادەنێت. بۆیە دەبێت ئەم خۆشەویستیەی ئێوە لە دڵی ئەودا هێندە بەتین بێت، ئەو ئەرکە قورسەی لە ئەنجامی پێکەوەبوونتان لە نێو هەمان بازنەدا لەسەر شانییەتی لای پەسەند تر بێت لە خۆشی و ئارەزووەکانی دەرەوە.

تەنانەت دەبێت هەموو ئەو مەترسی و غەم و ئازارە جۆراوجۆرەی کە دێتە ڕێتان لە ئەنجامی ئەو ڕێبازەی هەڵتانبژاردووە بۆ ژیانتان لە خۆشیی و ئارامی ژیانی پێشووی پێ خۆشتر بێت.ئەمەش پەیوەستە بەوەی ئەو کەسە باش ئێوە بناسێت و تا ئەو پەڕی پشتان پێ ببەستێت.

## ٧) دەبێت ژیرو واقیع بین بین

مرۆڤی بانگخواز کەسێکی ژیرو واقیعبینە. هەم لەکاتی خوێندنەوەی بۆ

ڕووداوەکان و هەم لەکاتی گەیاندنی شتێك بە کەسانی دیکەدا ئەو هەمیشە بە پێی ئاستی تێگەیشتنی کەسانی بەرامبەری و لە چوارچێوەیەکی ژیرانەدا هەوڵ دەدات بابەتەکەیان بۆ ڕوونبکاتەوە و بڕوایان پێ بهێنێت. مرۆڤی بانگخواز، بە پێی ڕاددەی ژیرییەکەی، لە ناو کۆمەڵگەدا قبوڵ دەکرێت وتەکانی پەسەند دەکرێن. ئەمەش نمونەیەکی کاریگەر لە پێغەمبەری خواوە(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ):

جولەیبیب (خوای گەورە لێی ڕازی بێت)، گەنجێك بوو لە بەرامبەر ئافرەتاندا لاواز بوو،"نەیدەتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات" . چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) و تی: ئەی نێردراوی خوا مۆڵەتم بدە زینا بکەم!

کاتێك هاوەڵان گوێیان لە داوایەکی لەمجۆرە بوو، وتیان "بێدەنگ بە ! بێدەنگ بە!"بەمشێوەیە ویستیان بێدەنگی بکەن.

بەڵام شانازیی مرۆڤایەتی بانگی دەکاتە لای خۆیەوە و جولەیبیبیش دێتە تەنیشتی و دادەنیشێت وسەرداری مرۆڤایەتی دەست دەکات بە قسەکردن لەگەڵیدا و دەفەرموێت: "ئادەی ئێستا پێمبڵێ بزانم ، تۆ پێت خۆشە کەسێك لەگەڵ دایکت داوێنپیسی (زینا ) بکات؟

- بەقوربانت بم نەبەخوا هەرگیز ڕازی نابم.

ئاشکرایە کەس ڕازی نابێت بەوەی زینا لەگەڵ دایکی بکرێت.

- ئەی حەزدەکەیت لەگەڵ کچەکەتدا زینا بکرێت؟

- گیانم بە فیدات بێت یا رسول اللهِ ،نەبەخوا ڕازی نابم.

(ئاشکرایە کەس ڕازی نابێ بەوەی لەگەڵ کچەکەیدا زینا بکرێت).

- ئەی ڕازی دەبیت کەسێك لەگەڵ خوشکەکەتدا زینا بکات؟

- بەقوربانت بم نەبەخوا هەرگیز ڕازی نابم.

(ئاشکرایە کەس ڕازی نابێت بەوەی لەگەڵ خوشکەکەیدا زینا بکرێت).

- ئەی لات ئاسییە زینا لەگەڵ پورتدا بکرێت؟

- گیانم بە فیدات بێت یا رسول اللهِ ،نەبەخوا ڕازی نابم."

(ئاشکرایە ڕازی نابێت بەوەی لەگەڵ پوریدا زینا بکرێت).

بەمجۆرە پێغەمبەری خوا(صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) لە ڕێگەی گوفتاری ئەقڵانیەوە جولەیبیبی ڕازی کرد و گومانەکانی ڕەواندەوە. لەپاشاندا دەستی خستە سەر سنگی جولەیبیب و بەم شێوەیە پاڕایەوە(دوعای کرد): "خوایەگیان لە گوناهی جولەیبیب خۆشببە و دڵی پاکبکەرەوە و ناموسی بپارێزە."[1]

ئیدی ئەوە بوو جولەیبیب لە پاش ئەم دوعایە بووە ڕەمزی(نموونەی) داوێنپاکی.

## پێغەمبەری سەروەرمان چۆن متمانەی کەسانی دیکەی بە دەست دەهێنا؟

فەرموون ئێوە و تابلۆیەکی کاریگەر و نموونەیەکی جوان لە چەرخی سەعادەتەوە: عوتبەی کوڕی وەلید یەکێك بوو لە هەرە پیاوە دەوڵەمەندەکانی مەککە و لە دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەری ئازیزمان. سەری هەموو فیتنەیەك ئەو بوو.لە کوێ سەرپێچیەك بەرامبەر فەرمانەکانی خوای گەورە بکرایە ئەم سەری مارەکە بوو. بەڵێ لە ماڵی ئەم پیاوە بەدبەختەدا کەسێکی بەختەوەر دەژیا، کە کوڕی عوتبە بوو. بەڵام هیچ لە عوتبە نەدەچوو. ڕاستگۆیانە پەیوەست بوو بە پێغەمبەری خواوە و هەموو ئەو نیعمەت و خۆشیانەی باوکی خستبویە بەردەمی بە پشتی دەستی ڕەتی

---

١ احمد بن حنبل،المسند٤/٤٢٠؛هيثمي، مجمع الزوائد،٣٨٦/٩

کردبوەوە و ئاینی خوای هەڵبژاردبوو. ناوی حوزەیفەبوو. باوکی تەنها لەبەرئەوەی لە بڕیاری شوێنکەوتوویی پێغەمبەری خوا پەشیمان بێتەوە هەرچی سەروەتی هەبوو خستبوویە بەردەستی. بەڵام حوزەیفە ئەو وانەیەی کە لە ڕابەرەکەیەوە وەریگرتبوو بەتەواوەتی پێیگەیاندبوو، بیرو باوەڕی دامەزراو بوو. هیچ شتێك نەیدەتوانی لەو بڕیارەی پەشیمانی بکاتەوە،چونکە ئەوکاتەی کە هەمان پێشنیار ئاڕاستەی هەتاوی هەردوو جیهانیان کرا، ئەو لە وەڵامدا ئەیفەرموو؟"ئەگەر خۆر بخەنە سەر شانێکم و مانگیش بخەنە سەر شانەکەی ترم هەرگیز واز ناهێنم". ئەم فەرمودەیەی سەروەری مرۆڤایەتی لە نێو دڵەکاندا کاریگەریەکی وەهای دروستکردبوو، کە ئەم پێشنیارە ئاڕاستەی کام لە هاوەڵان بکرایە، هەمان کاردانەوەی دەبوو. ئەوان مامۆستاکەیان بەو جۆرە ناسیبوو و بەوشێوەیەش چووبووە دڵیانەوە و کاریگەری لەسەر جێهێشتبوون.

هەتا ئەمڕۆش، گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ ڕووی نەداوە لە بواری بانگەوازدا نە بۆ بانگخوازان و نە بۆ بانگکراوان. ئەو چەمك بابەتانەی دوێنێ بە شێوەیەك بانگەوازیان بۆ دەکرا، ئەمڕۆش بە شێوەیەکی کەمێك جیاواز هەر بەردەوامن. کەواتە ئێمەش، بەهەمان شێوە دەبێت ڕێکاری پێغەمبەرانە بگرینە بەر بۆ چوونە نێو دڵی کەسانی دیکە. بە پێچەوانەوە، گەر وانەکەین ئەو بابەتانەی کە باسیان دەکەین لە هەوادا دەمێننەوە و کاریگەری دروست ناکەن .

ئەمە پێی دەوترێت چوونە نێو دڵەکان و تەخت دانان لە نێویاندا.ئەگەر پێغەمبەری سەرورمان‌لەناودڵی‌هاوەڵاندابەوڕادمیە جێی‌خۆی‌نەکردبایەتەوە،ئایا هاوەڵان‌بەرەوبەدر لەگەڵیدا بەڕێ دەکەوتن؟ پێغەمبەر (صَلَوَاتُ‌اللهِ‌وَسَلامُهُ‌عَلَیهِ) ، ماوە ماوە، ئەوەی وەبیر دەهێنانەوە و ئەوەی دەخستە ذلیانەوە کە دەبێت نێردراوی خۆشەویستی خوایان لە هەموو شتێك لەلا ئازیزتربێت.

بۆ نمونە ئەو کاتەی کە 'کعبی کوڕی مالیك" لە سەفەرەکەی تەبووکدا دوا دەکەوێت، سەروەرمان پێی دەفەرموێت: "ئەی تۆ لە عەقەبەدا بەڵێنت بە من نەدابوو کە دوا نەکەویت و بۆ هەرکوێیەك بچم شوێنکەوتەم بیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت :بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا من بەڵێنم دابوو. وە هەتاکو ئەمڕۆش بە هێندەی ئەم جەنگە بۆ هیچ جەنگێکی دیکە ئامادەکاریم نەکردووە، بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەمڕۆم خستە سبەی، سبەیم خستە دووسبەی، ڕۆژ هات و تێپەڕی و کار لە کار ترازاو منیش نەمتوانی بە ئێوە بگەمەوە. بەمشێوەیە داوای لێبووردنی لە سەروەرمان دەکرد، بەهۆی ئەوەوە کە ڕاستی وتبوو، وە لە ڕێی حەقدا بە دامەزراویی مایەوە خوا لێی خۆشبوو."

بەڵێ پێویستە بانگخواز بەو شێوەیە بچێتە دڵی دوێنراوەکانیەوە. داواکاری و چاوەڕوانیەکانیشی لە دوێنراوانی دەبێت تەنها لە پێناو خوادا بێت. واتە نابێت هیچ داوایەکی لە پێناو نەفسی خۆی لێیان هەبێت. بەپێی ئاماژەکانی قورئانی پیرۆز نمونەی ئەو کەسانەی کە داواکارییەکانیان لە خەڵکی دی لە پێناو نەفسی خۆیاندایە، وەك نەمرووەکان و فیرعەونەکانن. ئەمە لە کاتێکدا، کە پێغەمبەران هەموو داواکاریەکانیان تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا و بۆ خزمەتی ئومەتەکانیان بووە. ئەمەش بابەتێکی زۆر گرنگەو پێویستە بە وریاییەوە ئاگامان لێبێت.

## ٨)هەموو ئەو کارانەی کە دەکرێت دەبێت هەوێنەکەی ئیخلاس و دڵسۆزی بێت

لە نیەتەکاندا دەبێت هەمیشە ڕەزامەندی خوا ئامانج بێت و کارەکان لەو چوارچێوەیەدا بە ئەنجام بگەیەنرێن.هەرکارێك دەکەین سەرەتا دەبێت بە باشی لێیبکۆڵینەوە کە ئایا خوای گەورە پێی ڕازییە یاخود نا، ئەگەر ئەو پێی ڕازی بێت دەبێت بکرێت، ئەگەر نا، دەبێت بە تەواوی دەستی لێ هەڵبگیرێت. لە

فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئەم حاڵەتەمان بەمشێوەیە بۆ ڕوون کراوەتەوە؛ ئەبو موسای ئەشعەری، دەگێڕێتەوە؛ لە پێغەمبەری خوا دەپرسن: "کەسێك لە پێناوی پیشاندانی ئازایەتییدا، یەکێکی دی لە پێناو پاراستنی شەرەفی خۆی و خێزانەکەی و میللەتەکەی و کەسێکی دیکەش لە پێناو ئەوەی کە پێی بوترێ پاڵەوانە تێدەکۆشێت، کام لەمانە لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدایە و پاداشتی دەدرێتەوە؟"

پێغەمبەری خوا فەرمووی: "هەرکەسێك لە پێناو بەرزڕاگرتنی ناوی خوای گەورەدا تێبکۆشێت، ئەوا ئەوکەسە لەسەر ڕێی خوای گەورەیە ."[1]

بەڵێ پێغەمبەری خوا لەم فەرموودە پیرۆزەدا تێکۆشان لە پێناو خوای گەورەدا تەنها لە "بەرزکردنەوەی ناوی خواو پێغەمبەرەکەیدا"سنوردار دەکات. ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر لە پێناو بەرزکردنەوەی ناوی خوای گەورەدا تێبکۆشین، ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست دەهینین. بە پێچەوانەوە، ئێمە تەنها لە خۆمان دەدوێین و لەمبارەشدا نە ئیخلاس بوونی دەمێنێت و نە پاداشت. لە شوێنێکیشدا کە ئیخلاس ئەوەندە زیانی پێگەشتبێت بێگومان نە ڕەزامەندی خوای گەورە نە کاریگەری لە دڵەکاندا شایەنی باس نابێت.

ئەوانەی پێش ئێمە ئەم ئیشەیان بە ئیخلاسەوە بە ئەنجام گەیاند، هی وایان هەبوو ئەوکاتەی بەوپەڕی بێخەوشی وبێ لەکەیی قسەی دەکرد، لەپڕ سەری دەخستە سەر زەوی و دەیوت: " ئەی پەروەردگار تو گەورەیی خۆت دەستم بگرە و لە بێ ئیخلاسی بە دوورم بگرە." بۆ نموونە عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەك دەنوسێت و پاشان کە دەیخوێنێتەوە سەرسام دەبێت بە جوانی داڕشتن و ئەدەبیاتەکەی، یەکسەر بۆ ئەوەی لە لەخۆبای بوون خۆی بپارێزێت یەکسەر دەیدڕێنێت و سەر لە نوێ نامەیەکی دی دەنوسێتەوە. بەڵێ ئیخلاس و لەدڵسۆزی

---

١ بخاري، علم ٤٥، جهاد،١٥

بریتین لە ڕۆح و نهێنی زیندویی ئەو شتانەی کە باسمان کردن، گەر دەمانەوێت ئەو شتانەی باسیان دەکەین نەدرێنەوە بە ناوچاوماندا، ئەوا دەبێت دەست بە ئیخلاسەوە بگرین.

## ٩) هەندێك جار ڕەنگە پێویست بکات بابەتەکە لە لایەن کەسێکی دیکەوە بگەیەنرێت

ئەگەر هاتوو باسکردنی بابەتێك لەلایەن ئێمەوە لە هەندێك لە ویژدانەکاندا ببێتە هۆی دروستکردنی کاردانەوەی جیاواز لە ناخی بەرامبەرەکەماندا، ئەوکاتە دەبێت بە پێی دەستوری "خاتری حەق تەعالا بەرزترە" و تەبلیغی ئەو بابەتە لە لایەن کەسانی دیکەوە دەبێت خۆشحاڵمان بکات. لێرەدا وردەکاریەکی گرنگ هەیە کە دەبێت ئاگاداری بین. ڕازی بوون بەوەی کە شتێك لە لایەن کەسێکی ترەوە بگەیەنرێت جیاوازەو دڵخۆش بوون پێی جیاوازە. بەڵێ ئێمە دەبێت لەو کەسانە بین کە خۆشحاڵ دەبن کاتێك برایەکیان هەڵدەستێت بە گەیاندنی حەقیقەتێك. گومانیشی تێدا نیە کە ئەمە بەلای نەفسەوە ئەوەندە گرانە کە دەتوانرێ بە ئەنجامدەرەکەی بگوترێت 'جوامێر'.

هەندێك کەس بەهۆی هەندێك تایبەتمەندی کەسێتی ئێمەوە، ڕەنگە کاردانەوەی جیاوازیان هەبێت بەرامبەرمان. هەرچیەك کە ئێمە باسی بکەین ڕەنگە لەو جۆرە کەسانەدا کاریگەریەکی پێچەوانە دروست بکات. لە بارێکی لەم جۆرەدا هەوڵدان بۆ گەیاندنی حەق و حەقیقەت بەم جۆرە کەسانە، جیاوازی نابێت لەگەڵ ئەوەی کە هەوڵ بدەین هەرچیەکمان بۆ باس کردووە پەسەندی نەکات. بەو شێوەیەش ئەو بە پەسەندنەکردنی حەقێك توشی زیان دەبێت، ئێمەش بەوەی کە بوینەتە بەربەست لەبەردەم پەسەندکردنی حەقیقەتێکدا توشی زیان دەبین. چارەسەری ئەمەش بریتیە لەوەی کە ئەو بابەتە، لەلایەن ئێمەوە نا بەڵکو لە لایەن کەسێکی دیکەوە بەو کەسە

بگەیەنرێت. بەوشێوەیە هەروەك چۆن ئەو، ئەو حەقیقەتانە پەسەند دەكات، ئێمەش بەهۆی ئەوەی بوینەتە هۆكاری گەیاندنی حەقێك خێرو پاداشتمان بۆ دەنوسرێت.

هەربۆیە لە ناو مرۆڤەكاندا، كێ توانی بە باشترین شێوە حەقیقەتەكان بگەیەنێت ئەوا دەبێت هەموو زەمینەیەكی لەباری بۆ بڕەخسێنرێت و كەسانی دیكەش نابێت هەست بە ناڕەحەتی بكەن بەوەی كە لە ناو گوێگراندا خۆیان ببیننەوە.

## ١٠) ئەوكاتەی بابەتێك دێتە پێشت و زانیاریت لە بارەیەوە نیە دەبێت بتوانیت بە ئاسانی بڵێیت نازانم

ڕابەر و سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لەم بابەتەشدا دیسان باشترین پێشەنگە بۆ ئێمە. ئەوەتا كاتێك یەهودیەكان پرسیاریان دەربارەی ڕۆح لێكرد وەڵامی نەدانەوە. هەر چەندە ئەو خاوەنی پێگەیەكی بەرزی وەك پێغەمبەرایەتی بوو، بەڵام نەیدەویست قسە لەسەر شتێك بكات كە زانیاری دەربارەی نییە. ئەو نەیارە سەرسەختانەی پێغەبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) كە بە خەیاڵی پوچی خۆیان دەیانویست گومان و دوودڵی بخەنە دڵی پێغەمبەری خواوە بەو جۆرە پرسیارانە سەبارەت بە پێغەمبەرایەتیەكەی، ئەویش وەڵامی نەدەدانەوە هەتاكو لە لایەن خوای گەورەوە وەحی بۆ هات.

ئەو كاتەی كە فریشتەی نیگا "جبرئیل" دێتە لای و پرسیاری دەربارەی كاتی هەڵگیرسانی قیامەت لێدەكات، لە وەڵامدا دەڵێت:"ئەوەی كە پرسیارەكەی ئاڕاستەكراوە زیاتر لەو كەسە نازانێت كە پرسیارەكەی كردووە". ئایا لەم نمونەیە جوانتر هەیە بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین كە ئێمە ناچارنین بەوەی وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بدەینەوە كە لێمان دەكرێت.

ئەوەتا سەد پرسیار ئاڕاستەی حەزرەتی "ئیمام ئەبو یوسف " دەكرێت لە وەڵامی شەستیاندا دەڵێت نازانم.ئەوانەی پرسیاریان كردبوو وتیان ئاخر ئەی ئیمام شتی وا

چۆن دەبێت؟ ئێمە مووچە دەدەینە تۆ، کەچی تۆ لە وەڵامی شەستیاندا دەڵێیت نازانم! ئیمام لە وەڵامدا پێی وتن: ''ئێوە لەبەرامبەری زانیاریەکانمدا مووچەم دەدەنێ، ئەگەر لە بەرامبەر ئەو شتانەی کە نایزانم موچەتان پێ بداماية، ئەوا هەموو دنیا بەشی مووچەی منی نەدەکرد."لەو سەردەمەدا ئیمام ئەبو یوسف لە بەرزترین پایەی فتواداندا بوو.''

ئەم نمونانە و هاوشێوەی ئەمانە ئەوەمان نیشان دەدەن کە تەنانەت، چەندەها کەسی خاوەن شکۆ و پلە و پایەی بەرز وەڵامی هەموو پرسیارێکیان نەداوەتەوە، تەنانەت توانیویشیانە بڵێن "نازانم".

ئێمەش دەبێت بتوانین بڵێین نازانم بەڵام بە دیوەکەی تردا هەر سووربین لەسەرهەوڵدان هەتا فێردەبین. وە بەرامبەرەکەمان ببەین بۆلای کەسێکی باوەڕپێکراو کە لە ئێمە شارەزاترە و تا هەم خۆشمان فێرببین و هەم دەرگای فێربوونیش بە ڕووی بەرامبەرەکەماندا بکەینەوە و ژینگەی فێربوونیش بۆ ئەوان بڕەخسێنین.

## ١) ئەو شتانەی کە باسی دەکەین سەرەتا دەبێت لە خۆماندا ڕەنگی پێبدەینەوە، پاشان هەستین بە تەبلیغ کردنیان

باسکردنی ئەوەی کە جێبەجێی دەکەیت، جێبەجێکردنی ئەوەی کە باسی دەکەیت" بریتیە لە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکانی مرۆڤی بانگەوازکاران. چونکە مرۆڤی بانگەوازکار لە ڕێگەی کامڵبووندایە بەرەو گەشتن بە ئیمانداری ڕاستەقینە دایە.

بێجگە لەمەش مرۆڤی بانگخواز، دەبێت ئەوە بزانێت کە هەر قسەیەك کە دەیکات ئەگەر بێت و لە ژیانی خۆیدا جێبەجێی نەکات ئەوا هیچ کاریگەریەکی ئەرێنی لە دڵی بەرامبەردا دروست ناکات. خوای گەورە بەرەکەت و کاریگەریی بە وتەیەك یان کردارێك نابەخشێت کە ئیخلاس و لێبڕاویی تێدا بێت.

کەسی بانگخواز پێویستە زۆر بە وردی مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتەدا بکات، ئەو

کاتەی کە لە ناو خەڵکیدایە ڕەفتاری چۆنە لە کاتی تەنهاییشدا دەبێت بەهەمان شێوە هەڵس و کەوت بکات و هەوڵ بدات کرداری پەنهان و ئاشکرای بە هەمان دڵسۆزی و لێبڕاوییەوە ئەنجام بدات .

ئەو کەسەی کە پەیڕەویی ڕەوشتە ئیسلامیەکان ناکات و بەجێهێنانی سونەتەکان فەرامۆش دەکات و بە کەمتەرخەمیی و تەمبەڵی فەرزەکان جێبەجێ دەکات، ئەوا هەرکارێك بەناوی گەیاندنی ئاینەوە ئەنجامی دەدات یان بە واتایەکی دی ئەو جیهادەی بە زوبان ئەنجامی دەدات خۆی لە خۆیدا تاوانە. کاتێك ئەو ژیانە سادە و فیترییەی ئیسلام کە هەموو مرۆڤایەتی تینوویەتی و نەیانتوانیوە بەدەستیبهێنن لە لایەن کەسانێکەوە بانگەشەی بۆ دەکرێت کە لەسەر قەنەفەی نەرم دانیشتوون و شاهانەترین خواردەمەنی دەخۆن و گوفتار و ڕەفتاریان یەکدی تەواو ناکەن، لە لایەن دوێنراوەکانیانەوە پێیان دەوترێت" فەرموون ئەو ژیانە سادەیەی کە بانگەشەی بۆ دەکەن خۆتان پێش ئێمە جێبەجێی بکەن با ئێمەش شوێنتان بکەوین" و بەرپەچدەدرێنەوە.

بەڵێ تاکە مەرجی کاریگەریی درووست کردن لەسەر بەرامبەر و چوونە نێو دڵی دوێنراوەکانمان، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ئەنجامی دا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) ئەویش جێبەجێکردنی ئەو شتانەیە پێش هەموو کەسێك کە بانگەشەی بۆ دەکەین.

## ١٢)دەبێت مرۆڤی بانگەواز و تەبلیغ جوامێر بێت

مرۆڤی بانگەواز دەبێت ئامادەبێت کە هەرچی هەیەتی و نیەتی لەپێناوی ئاینەکەیدا بەختی بکات. لە پێناوی کردنەوەی دەرگای دڵەکاندا، دەبێت جوامێرییەکەی ببێتە بوراق و ڕێی پڕ هەوراز و نشێوی پێ تەی بکات. کاتێك باسی جوامێری دەکرێت یەکسەر (خەدیجة الکبری)ی دایکمان دێتەوە یاد. لە دایك بوون و کۆچی دواییشی زۆر پێش پێغەمبەری خوا بووە. ڕەنگە ئەم زوو

کۆچکردنەشی لە ناوەکەیەوە هاتبێت. لەبەرئەوەی خەدیجە بەمانای کەسێك دێت کە زوو لەدایکبووبێت. ئەو کاتەی کە سەروەری جیهانیانی ناسی، پێغەمبەری خوا خاوەنی هیچ شتێك نەبوو لەم دونیایەدا. حەزرەتی خەدیجەش دەوڵەمەند و خانەدان و جوان بوو. سەرەڕای ئەمەش، ئەم کەڵە ژنە ژیرە ئەو مانا مەزنەی نێو ناخی پێغەمبەری خوای هەست پێکردبوو و خوازیاری هاوسەرگیری بوو لەگەڵیدا. کاروانی بازرگانی ڕێکدەخست و لەم بوارەدا قسە ڕۆیشتووبوو. پاشان بووە دایکی چەند منداڵێکی پێغەمبەمبەری خوا. بەڵام بە ژیانی مەدینە ڕانەگەیشت و کۆچی دوایی کرد و بە پەروەردگاری شادبووەوە.

ئەم خانمە گەورەیە، وەك بڵێی ڕێك بەو شێوەیە بەدیهێنرابوو کە ببێتە خێزانی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی جوامێربوو. ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا دەستی کرد بە گەیاندنی پەیامەکەی، ئەو بەبێ هیچ دوودڵیەك، هەروەك پێشتر هەستی بە هاتنی ئەم هەواڵە کردبێت یەکسەر باوەڕی پێ هێنا. پاشان هەموو سەروەتەکەی خۆی خستە ژێر فەرمانی پێغەمبەری خواوە، ئەویش ئەو سەروەتە زۆرەی تەنها لە پێناوی خوادا بەکار هێنا. لە ئەنجامی ئەو ئابلۆقەیەی کە موشریکەکانی مەککە بەسەر پێغەمبەری خوا و موسوڵمانەکانیاندا سەپاند، هیچ شتێك لە سەروەتەکەی خەدیجە بەجێ نەما، هەمووی بەکارهێنرا. بە ڕادەیەك جاری وا هەبوو کە پێغەمبەری خوا خەریك بوو دەبورایەوە لە برسانا بەڵام هیچی دەست نەدەکەوت بیخوات، بە ڕادەیەك لەو کاتەدا پارچە نانێکی وشکیشیان نەبوو بیهێننە سەر سفرە. ئەوەبوو حەزرەتی خەدیجە لەم ماوەیەدا نەخۆش کەوت؛ تەنانەت لەبەر نەبوونیی نەدەتوانرا هیچ چارەسەرێکیش بکرێت، بەڵێ بەو شێوەیە لەوێبێ نەواییەدا کۆچی دوایی کرد.کۆتا ئاسۆی جوامێریش بریتییە لە توانەوەو گیانفیداکردن لە پێناو ئەو ڕێبازەی بروات پێیەتی، دایکمان حەزرەتی خەدیجە هەر زوو بەم ئاسۆیە گەیشتبوو.

حەزرەتی ئەبوبەکریش بەو بەردانەی لەنێو جامەکەدا دانابوو باوکی سەرقاڵ

دەکرد و هەموو ئاڵتونەکانی لە پێناوی خوای گەورەدا بەخشیبوو. تەنانەت لە سەردەمی جێنشینیشدا، هێندە هەژار بوو کە بە لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتی خەڵکی هەوڵی دەدا ژیانی دابین بکات.حەزرەتی ئەبو بەکر کە سەردەمانێك یەکێك بوو لە بازرگانە هەرە دەوڵەمەندەکانی مەککە و هاوەڵی ئەشکەوتی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) و سەرداری ڕاستگۆیان بوو، ئەویش وەك نمونەیەکی جوامێری لە پێناوی ڕەزامەندی پەروەردگاریدا هەمووشتێکی بەخت کردبوو. پێشەواحەزرەتی عومەریش هەژارترین کەس لە مەککەدا بەچی ژیانی بەسەر ببردایە ئەویش بەوە ژیانی دەگوزەراند، واتە لە چەند دەنکە خورمایەك زیاتر نەبوو. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە لە پێناوی ئەرکەکەیدا دەرگای چێژە ماددیەکانی بە ڕووی خۆیدا داخستبوو.

هاوەڵان هەموو لە جوامێریدا پێشبڕکێیان بوو، بەو جوامێریەش کە نیشانیان دەدا لە پێناوی ئەو بەها بەرز و باڵایانەی کە باوەڕیان پێهێنابوو، دەرگای دڵەکان دەکرانەوە و بەم جۆرە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە لێشاو خەڵکی موسوڵمان دەبوون. چونکە ئەوان هەروەك چۆن لە هەموو بابەتێکی تردا سەروەری مرۆڤایەتییان کردبووە پێشەنگ و ڕابەری خۆیان لەو بابەتەشدا بەهەمان شێوە بوون و وانەیان لە پێغەمبەری خوا وەردەگرت.

ڕۆژێکیان زاتێك دەچێتە لای هۆزەکەی و پێیان دەڵێت: ئەی هۆزەکەم هەر ئێستا شوێن ئەو پیاوە بکەون و باوەڕی پێبهێنن. ئەگەر ئەو پێغەمبەرە من بوومایە لە ترسی کەمبوونەوەی ڕزق و سەروەتەکەم هێندە بەخشندە و دەستکراوە نەدەبووم. بەڵام ئەو هەر کەسێ داوای شتی لێبکات دەیداتێ!

گەنج و پیر پێویستە هەموومان ،بەم ڕێگایانە هەوڵ بدەین بچینە دڵەکانەوە و فەتحیان بکەین، گەر کەسێك لەم ڕێیەدا هەموو سەروەتەکەی بەخت بکات و لە

ئاكامیشدا ئیمان بە خوای گەورە بگەیەنێتە دڵی یەك كەس، ئەوا دەستكەوتێكی مەزنی دەست كەوتووە و هیچ زیانێكیشی لێنەكەوتووە.

یەكەم كەس كە دەرگای بەهەشت بە ڕوویاندا دەكرێتەوە بەخشندەكانن. با لە دونیادا ئەو ڕێگایانە بكەینەوە كە بەرەو ئەو دەرگایە دەچن. بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆماندا چەندین كەسی دیكەش بەرەو ئەو دەرگایە بەرین. بەڵێ ئەوانەی یەكەم جار دەچنە بەهەشتەوە بریتی نین لە زانا و وتاربێژ و مامۆستا ئاینی یەكان. بەڵكو ئەو بەختەوارانەن كە لە پێناوی گەیاندنی حەق و حەقیقەتدا ماڵ و گیانیان بەخشیوە.

## ١٣) نابێت بووەستین، نابێت بڕوخێین، بەڵكو دەبێت سووربین لەسەر فەرمانبەریەكەمان

سووربوون و نەسرەوتن لەسەر بانگەواز و تەبلیغ، هۆكاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە. پێداگری و بەردەوامبوون نیشانەی ڕاستگۆیەتی مرۆڤی بانگەوازە و نهێنی پەسەندكردنی بانگەوازەكەیەتی لای دوژنراوەكانی. پێداگری و سووربوون (إصرار) نیشانەی بە گەورە زانین و هەستیاری بوونە بەرامبەر ئەو مەسەلانەی كە بە كەسانی دیكە دەگەیەنرێن. ئەمە مانای وایە كە خوای گەورە گرنگی دەدات بەوەی كە مرۆڤەكان "لاإله إلا اللهِ محمد رسول اللهِ" بڵێن و لەنێو دڵیاندا دایبنێن. بەم جۆرە مرۆڤی بانگخواز ژینی خۆی بۆ ئەم بابەتە تەرخان دەكات كە جێ بایەخێكی زۆری پەروەردگاریەتی ،بەردەوام كۆشش كردن بۆ چەسپاندنی "وشەی یەكتاپەرستی" لە دڵەكاندا، وەڵامدانەوەی ئەو گرینگیپێدانەی پەروەردگارە بۆ ئەم بابەتە بە شێوەیەك كە شایستەی گەورەییەكەی بێت، بەڵێ ئەو بەردەوامبوون و سووربوونە لەسەر ئەو ئەركە پیرۆزە ئەم واتایە دەبەخشێت.

كەواتە خزمەتگوزاری قورئان، دەبێت سووربوونی خۆی لە سەر ئەوشتانە

دەربېرێت کە بەلای خوای گەورەوە گرنگە. ئەمە نیشانەی پەرۆشیی ئەو دەردەخات لەو شتانەدا کە بانگەشەی بۆ دەکات. بەڵێ ئەو کەسەی کە هەموو تەمەنی خۆی نەکاتە قوربانی ئەو بەها باڵایانەی کە دڵی پێداوە، ناگونجێت ببێتە بانگخواز. بێگومان ئەگەر کەسێك بەو شێوەیە نەبێت پێی ناوترێت بانگخواز. مرۆڤی خزمەت و بانگەواز "سەد جار" بابەتەکان دەگەیەنێت، ئەگەر هەر گوێیان نەگرت دەیکاتە "سەدو یەکجار" و دیسان بەردەوام دەبێت لە تەبلیغ. چاوەڕێی کات و هەلومەرجی گونجاو دەکات، هەوڵ دەدات ئەو کاتە بدۆزێتەوە کە دوێنراوەکەی توانای پەسەندکردنی هەیە. بەبێ بێزار بوون و ناڕەحەتی بە درێژایی تەمەنی هەمیشە هەر لەسەر ڕێبازی بانگەواز دەمێنێتەوە. هاوشێوەی پێغەمبەران. لەبەرئەوەی تەواوی ژیانی ئەوان بریتی بوو لە هەوڵدانی بەردەوام و چۆکدانەدان. بەڵێ ئەوان بەو پەڕی پێداگری و سووربوونەوە کاری بانگەوازیان بەجێدەهێنا.

## ١٤)پێویستە ئەنجام بۆ خوای گەورە بە جێبهێڵرێت

ئەو کەسانەی کە خەریکی بانگەواز و تەبلیغن، دەبێت ئەنجام و پەسەندبوونی بانگەوازەکەیان بۆ خوای گەورە بە جێبهێڵن و هیچ کاتێك خۆیان لە ئەنجام هەڵنەقورتێنن. لەبەرئەوەی فەرمانبەریی ئەوان تەنها بریتییە لە تەبلیغ، ئەنجامەکەشی بە تەواوەتی کاری پەروەدگاری باڵا دەستە.

ئەوانەی کە بانگهێشتی خەڵکی دەکەن بۆ ئاینی ئیسلام، دەبێت تەنها بیر لە فەرمانبەرییەکەیان بکەنەوە. مێژوو داستانی چەندین پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە بە درێژایی تەمەنیان هەمیشە خەریکی کاری بانگەواز بوون، کەچی تاکە کەسێکیش باوەڕی پێ نەهێناون. بەڵام ئەوان سەرەڕای ئەمەش هەرگیز توشی نائومێدی نەهاتوون و هەمیشە هەر بەردەوام بوون لە ئەرکەکەیان بۆ ئەوەی مافی فەرمانبەرییەکەیان بدەن. لە هیچ ساتێکی ژیانیاندا ناڕەزاییان دەرنەبڕیووە و

نەیانوتووە: "بۆچی نەمتوانی خزمەتێکی باش بگەیەنم و بانگەواز بکەم؟ بۆچی کەس باوەڕم پێناهێنێت؟ بۆچی ئەم کارە تووشی نسکۆ دەبێت؟ ئەم هەموو سەرنەکەوتنە یەك لە دوای یەکە بۆچی؟" بەڵێ هەموو پێغەمبەرێك تەنها بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن ئەو ئەرکەی سەرشانی بەجێبهێنێت. لەبەر ئەمە خوێندنەوەی بۆ هەموو مەرجەکان هەیە و ئەرکەکەی بەوشێوە بەجێدەهێنێت کە لەگەڵ مەرجەکاندا گونجاو بێت. بەڵام باوەڕهێنان یان باوەڕنەهێنانیان بەشێك نییە لە فەرمانبەرییەکەی ئەم، بەڵکو حوکمی ئەو مەیدانە بەپێی ویستی پەروەردگاری مەزنە.

## چەند پێوەرێك بۆ شاسوارانی ڕێی بانگەواز

- پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بە درێژایی ژیانی تەنها یەکجار حەجی کردووە، بەڵام هەموو تەمەنی پیرۆزی بە بانگەواز و تەبلیغی ئاین بەسەربردووە.

- هەندێك فرمێسك هەیە دەشێت ببێتە هۆکاری کردنەوەی دەرگای زۆرێك لە دڵەکان.

- گەورەیی لە کاری گەورە و پلانی گەورەدا نی یە، بەڵکو دەبێت لە بەئامانجگرتنی ڕەزامەندی خوای گەورە و لە چاوەڕوانیی "من لە تۆ ڕازیم" ی پەروەدگاردا بەدوای گەورەییدا بگەڕێین.

- بێگومان دەبێت مرۆڤی باوەڕدار باوەڕەکەی بخاتە زەمینەی کردارەوە. هەرکاتێك هەستەکانی مرۆڤ ڕەنگی ئیمان و کردەوەکانی گرت ، ئەو کات ئیستیقامەت لە ڕەفتارەکانیدا دەردەکەوێت.

- ئەگەر مرۆڤ هەڵەکانی پێشووی ناڕەحەتی بکات، مانای وایە ئەو کەسە دەتوانێت گوناه و پاداشت لەیەکدی جیابکاتەوە.

- دوژمنی سەرکەوتن بریتییە لە پشوودان و پاڵدانەوە و هەڵپەکردن بۆ ژیانی شاهانە، سەرکەوتنی موسوڵمانان تەنها بە ژینێکی سادەی سەرباز ئاسا دێتەدی.

- ڕەچاوکردنی هۆکارەکان ئەگەر نەبێتە هۆکاری گۆڕینی قەدەریش ئەوا لانی کەم مرۆڤ لە بەردگرتنە قەدەر ڕزگار دەکات.

- لە بانگەوازدا پاش ئیخلاس، پەسەندکردنی بەرامبەر بەشێکی گرنگی

کارەکەمان پێکدەهێنێت. بۆیە دەبێت هەوڵبدەین تەبلیغەکەمان بە جۆرێك ئەنجام بدەین کە لە لایەن بەرامبەرەکەمانەوە پەسەندبکرێین. تا بکرێت نابێت هیچ کەس بانگەوازی کەسانێك بکات کە ئاستیان لە سەروو ئاستی خۆیەوەیە، چونکە ئەم کارە رەنگە رووبەرووی دەرەنجامێکمان بکاتەوە کە دژبێت بەو دەرەنجامەی چاوەڕێمان کردووە. نابێت منداڵ بۆ باوکی، قوتابی بۆ مامۆستاکەی، شاگرد بۆ وەستاکەی هیچ شتێك بگەیەنێت، مەگەر ئەوەی هیچ رێیەکی تر نەمێنێت. ئیمان نەهێنانی ئەبو تالیب بە پێغەمبەری خوا لەم بوارەدا شایەنی هەڵوێستە لەسەر کردنە.

- وریابە نەکەی تۆ و چاندن هەڵبگریت بۆ وەرزی دروێنە، چونکە ئەوکات هەوڵی هەردوو وەرزەکەت بە خۆڕایی دەچێت.

- ئیماندار نوێنەری ئاسایش و دڵنیایی یە لەسەر زەوی.

- مرۆڤە شەڕەنگێزەکان دەتوانرێت بە نیشاندانی مامەڵەیەکی مرۆییانە، ڕێگە لە زیانەکانیان بگیرێت و شەڕەکانیان هێور بکرێتەوە. با ئەو وتەیەمان هەمیشە لە یاد بێت کە دەڵێت: "مرۆڤ کۆیلەی چاکەیە."

- شەیتان، زۆربەی کات ئەو کەسانە بە لا ڕێدا دەبات کە نەخشەی ژیانیان لە چوارچێوەی بازنەی بانگەوازدا دانەڕشتووە. ئەو کەسانەی کە هەڵناستن بە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە لە بەرەکەتی وەحی بێبەش دەبن. ئەم مرۆڤانە هەرگیز شنەی ئیلهام ڕوویان تێناکات. ڕەنگە بتوانن کتێب بنووسن، بەڵام نووسینەکانیان ئاوێتەی ئیلهام نابێت بەڵکو بێبەرەکەت و تاریك دەنوێنێت. بەڵام ئەوانەی کە هەڵدەستن بە ئەنجامدانی ئەم فەرمانبەرییە، هەمیشە شنەی ئیلهامیان بە ڕوویاندا هەڵدەکات. هەر لەبەر ئەمەیە دەبێت هەمیشە بخوێنینەوە و بیربکەینەوە و هەوڵ بدەین

ئەوەی دەیزانن بیگەیەنن بە هەمووکەسێك تا بەوهۆیەوە رۆحمان هەمیشە بە زیندویی بمێنێتەوە.

- دەبێت خەمی هەموو بانگخوازێك بریتی بێت لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە (جل جلاله)، نابێت بە هیچ شێوەیەك هیچ هەست و بیرێکی تری دونیایی بکاتە ئامانج. دەبێت بانگخواز بەم شێوەیە بیر بکاتەوە: "ئەگەر هاتو ڕۆژێك ڕێم لە دۆزەخ هەڵکەوت ئەوکات لەوێش هەوڵ دەدەم سیمایەکی تامەزرۆ بە حەقیقەت بدۆزمەوە و حەق و حەقیقەتی بۆ باس بکەم"بەڵێ، ئەمەش وێنای مرۆڤی خزمەتی نموونەییە کە لەم سەردەمەدا پێویستمان پێیەتی.

## ٣- بەکردەکردن، زمانی حاڵ

"ئەو زمانەی کە پێویستە بەکار بهێنرێت لە گەیاندنی حەق و حەقیقەت بە کەسانی دی، زیاتر لە زمانی گوفتار دەبێت زمانی حاڵ بێت."[١]

### واتای بەکردەکردن یان زمانی حاڵ چییە؟

بەکردەکردن یا زمانی حاڵ بریتیە لەوەی مرۆڤی بانگخواز ئەو مەفکورەیەی هەیەتی، لە رێی هەڵوێست و ئاکار و هەڵسوکەوتەکانیەوە بە خەڵکی بگەیەنێت و دەبێت ئەو شتانەی کە بانگەوازی بۆ دەکات سەرەتا لە خۆیدا ڕەنگیان پێ بداتەوە و ژیانێکی نموونەیی بەرجەستە بکات.

بەڵێ، مەردایەتی ڕاستەقینە لە بەکردەکردندا دەردەکەوێت. ئەو کەسەی کە تەبلیغ کردنی حەقیقەتەکانی ئیمان و قورئانی کردووە بە ئامانجی ژیانی، ناگونجێت ژیانی پێچەوانەی ئەو شتانە بێت کە بانگەشەی بۆ دەکات. چونکە بەها و ڕەفتارە جوانە ئەرێنییەکان کاتێك کاریگەریی لە دڵی دوێنراودا دروست دەکەن کە لە کەسێتی گەیەنەردا ڕەنگیان دابێتەوە. واتە ئەگەر کەسێك ویستی باسی نوێژ بۆ کەسانی دیکە بکات، دەبێت خۆی هێندە بەجوانی نوێژ بە جێبهێنێت کە تەنانەت

---

١ محمد فەتحوڵلا گولەن

ئەوانەی لە دووریشەوە تەماشای دەکەن بڵێن"ئەم کەسە هیچیشی نەبێت، تەنها ئەم نوێژەی نیشانی دەدات کە لەسەر ڕێگەی ڕاستە". دەبێت ئەم نوێژە هێندە جوان بەجێبهێنرێت تەنانەت ببێتە جێگەی سەرنجی ئەوانەش کە بە تەواوەتی باوەڕیان دامەزراو نییە.

ئەو کەسە خۆشبەختانەی کە فەرمانبەریی بانگەوازیان لە ئەستۆ گرتووە، دەبێت ئەو شتانەی باسی دەکەن، سەرەتا خۆیان باش جێبەجێی بکەن. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەگرنگی ئەمە دەکات و وەك ئاگادارکردنەوەیەك پێمان دەفەرموێت: "ئەوە چۆن ئەمر دەکەن بە خەڵك کە کرداری چاك بکەن، کەچی خۆتانتان لەبیر دەچێت؟" (البقرة، ٤٤). "ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە! بۆ بەدەم شتێ دەڵێن کە بە کردەوە نایکەن؟ ئەوە لای خوا زۆر بێزرار و ناپەسەندە بەدەم شتێ بڵێن کە بە کردەوە نایکەن. "(الصف، ٢-٣)

پێغەمبەری ئازیزیشمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) لە فەرمودەیەکی پیرۆزدا بەم جۆرە ئاماژە بەم ڕاستیە دەکات: ئەو کەسانەی کە فەرمان بە خەڵکی دەکەن بە چاکەو نەفسی خۆیان لە بیر دەکەن، لە دوارۆژدا ڕیخۆڵەکانی خۆیان بە نێو ئاگری دۆزەخدا دەگێڕن. کە لێیان دەپرسن ئێوە کێن؟ لە وەڵامدا دەڵێن: "ئێمە ئەوانەین کە فەرمانمان بە چاکە دەدا بەڵام نەفسی خۆمان لە یاد کردبوو."[1]

زۆر پێویستە کەسی بانگخواز حاڵەتی ڕۆحی لەگەڵ وتەکانیدا ڕەنگدانەوەی یەکدی بن. هەروەها دەبێت زۆر بە وردی ڕەچاوی ئەوە بکات کە وتەکانی بە کردەوە بکات و زوبانی حاڵی لەگۆدا بێت. کاریگەر بوونی قسەکانی پەیوەستە بەوەی سەرەتا ئەو شتانەی کە باسیان دەکات لە خۆیدا جێبەجێیان بکات.

---

١ سيوطي، الدر المنثور، ١/١٥٨

## بەکردەکردن لەلای پێغەمبەری سەروەرمان لە پێش بانگەوازی زارەکییەوە دێت

کاتێك لە ژیانی سەروەری مرۆڤایەتی (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) دەڕوانین، دەبینین کە بەکردەکردن لەلای سەردارمان هەنگاوێك لە پێش تەبلیغی زارەکییەوە دێت. ئەو بە چەشنێك وەها جوان بە جوانترینی ڕەفتارەکان خۆی ڕازاندبووەوە، کە کاتێك کەسێك لێی دەڕوانی، بێ ئەوەی پێویستی بە بەڵگە بێت دەکرا باوەڕ بە بوونی خوا بهێنێت. تەنانەت زۆر جار تەنها دیتنی ئەو بەس بوو بۆ قەبووڵکردنی پێغەمبەرایەتییەکەی. عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە چەند جوان لەم ڕاستییە دەدوێت کە دەڵێت: ”ئەگەر سەروەرمان بە موعجیزەی ڕوون و ئاشکراشەوە نەهاتایە ئەوا تەنها دیتنی ئەو بەس دەبوو بۆ ئەوەی کە باوەڕی پێبهێنرێت.“

زمانی حاڵی ئەو هێندە کاریگەری بوو زانایەکی یەهودی وەکو عەبدوڵڵای کوڕی سەلام هەر لە یەکەم بینینیدا وتی: ”ئەم سیمایە هەرگیز سیمای درۆزن نییە، دەبێت خاوەنی ئەم سیمایە نێردراوی پەروەردگاربێت و پاشانیش باوەڕی هێنا.“

کەواتە دیتنی ئەو بەس بوو بۆ لەدڵدا جێگیربوونی. ئەو کەسانەی ژیانیان تەرخانکردووە بۆ گەیاندنی شتانێك بەوانی دی، لە هەموو کەس باشتر لە سەختی ئەم لە دڵدا جێکردنەوەیە تێدەگەن. زۆرێك لەمانە بەدرێژایی تەمەنێك لە هەوڵ و تێکۆشانی بێوچاندان، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی کە قەبووڵیان کردوون و لە دڵیاندا جێیان بۆ کردوونەتەوە و گوێیان لێ گرتوون لە ژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕناکەن. ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر سەرنج بدەین ئایا جگە لە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) کەسێکی تر هەیە کە چووبێتە دڵی نزیکەی ملیارێك مرۆڤەوە؟ هیچ کەسێکی دیکە هەیە ڕۆژی پێنج جار بە دەنگێکی جیهان هەژێن و بە جۆشێکی تایبەتییەوە ناوی پیرۆزی لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە بەرز ببێتەوە؟

کەواتە مرۆڤایەتی ئەوی خۆش دەوێت و لە ڕۆژێکدا چەندەها جار پەیوەستی خۆی بەوەوە دوپات دەکاتەوە. سەرەڕای هەموو شتێکیش هێشتا پێغەمبەری خوا(عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)هەر بەردەوامە لە چوونە نێو دڵی مرۆڤەکانەوە و تەختی خۆشەویستی دانان تێیدا. لەبەرئەوەی پێغەمبەر ئەو شتانەی کە دەیگەیاند سەرەتا لە خۆیدا جێبەجێی دەکرد و خۆی بوویوو بە نمونەیەکی زیندووی ئەو فەرمایشتانەی کە دەیفەرموون. بۆیە هەموو وتەیەکی پیرۆزی ئەو لە دڵی هەموو ئەوانەدا جێی خۆی دەکردەوە کە پێیان دەگەیشت و لە سینەیاندا ڕەگی دادەکوتی.

ئەو لە کاتێکدا کە مرۆڤەکانی بۆ بەندایەتی پەروەردگار بانگهێشت دەکرد، خۆی جوانترین بەندایەتی ئەنجام دەدا، ئەوەندە نوێژی دەکرد هەتا قاچەکانی دەئاوسان. تا ڕۆژێکیان حەزرەتی عائیشەی دایکمان پێی دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا، کە خوای گەورە لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە بۆچی ئەوەندە خۆت دەخەیتەناڕەحەتییەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت: "ئەی نەبمە بەندەیەکی سوپاسگوزاری پەروەردگارم؟"[1]

ئەو ئەگەر بیویستایە وەك پادشاکان دەژیا و دەیخوارد و دەیخواردەوە. هێشتا لە مەککەدا بوو دەستپێشخەرییەکی لەو جۆرەی خرایە بەردەم. بەڵام ئەو لە پێناو ئاینەکەیدا ژیانێکی پڕ ئازاری لەبری ژیانێکی پڕ لە حەوانەوە هەڵبژارد. ئەم ژیانە سادەیەشی بوو کە کۆمەڵ کۆمەڵ خەڵکی کەمەندکێش دەکرد.

جێنشینەکانیشی هەر بەو جۆرەبوون، لەوانە حەزرەتی عومەر ژیانێکی زۆر سادە دەژیا، بەڵام ژینی پێغەمبەری خوا تەنانەت ئەسرینی لە چاوانی ئەویش دەهێنا. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە هۆکاری ئەم گریانەی حەزرەتی عومەر دەپرسێت؟ حەزرەتی عومەریش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی پێغەمبەری

---

١ إبن حبان، صحيح، ٢/٣٨٦

خوا، ئێستا پادشاکان لەسەر جێگەیەك کە لە پەڕی باڵندە دروستکراوە ڕادەکشێن کەچی تۆ لەسەر حەسیر دەنوویت و شوێنی حەسیرەکە لەسەر لاشەی موبارەکت دەردەچێ، لەکاتێکدا تۆ نێردراوی پەروەردگاریت و لە هەموو کەسێك زیاتر شایەنی ژیانی خۆش و ڕازەوەیت. پێغەمبەری خواش لە وەڵامدا دەفەرموێت: ئەی عومەر ئایا تۆ ناتەوێت دونیا بۆ ئەوان و پاشەڕۆژیش بۆ ئێمە بێت؟[1]

ئەو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا بە سادەترین شێوە دەژیا، لە ڕاستیدا ئەو لە خەمی ژیانی خۆی نەبوو بەڵکو لە خەمی ژیاندنی کەسانی دیکەدابوو. بەڵێ ئەم بەکردەکردنە جوانە نهێنی بەدەستهێنانی دڵەکان بووە لای سەردارمان.

لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری پێغەمبەری خوادا چەندەها وانەی کرداریی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە فەرمانبەریی تەبلیغیان کردۆتە ئەرکی سەرشانی خۆیان و ئامانجی ژیانیان.

تاکە مەرجێك بۆ چوونە نێو دڵان و کاریگەربوون تەنها بەوە دەبێت کە ئێمەش شوێنپێی پێغەمبەری خوا هەڵ بگرین و پێش ئەوەی هەرشتێك کە دەمانەوێت بیگەیەنین و بیڵێین لە هەڵسوکەوتی خۆماندا ڕەنگی دابێتەوە.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێك باسی شەو نوێژ (تەهەجود) و فرمێسك ڕشتن لە پێناوی خوای گەورەدا بکات، ئەم کەسە سەرەتا دەبێت خۆی شەو هەستێت بۆ شەونوێژ و بە ئەسرینەکانی بەرماڵەکەی تەڕ بکات ئەگەرنا بەر هەڕەشەی ئایەتی پیرۆزی: "لم تقولون مالا تفعلون؟"واتە: بۆچی شتانێك دەڵێن کە خۆتان نایکەن؟ (الصف، ٢) دەکەوێت.[2]

---

١ احمد بن حنبل، مسند، ٢٣١/٢

٢ محمد فەتحوڵلا گولەن، نوری نەمر، ٢٦٢/١-٢٦٦

## حەزرەتی ئەبوبەکر بە بەکردەکردنەکەی مرۆڤەکانی شەیدای خۆی کردبوو

هاوەڵانی دەورویەری پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بەهەمان شێوە کرۆکی ئاینیان لە خۆیاندا ڕەنگپێدابوویەوە و تەمسیلی ئاینیان دەکرد. لە ژیانی ئەوانیشدا هەمیشە رەفتار لە پێش گوفتارەوە بوو. ئەوان بەو ژیانە نموونەییەی خۆیان کاریگەرییان لەسەر مرۆڤەکان دادەنا و دەبوونە هۆکاری ئەوەی کە موسوڵمان ببن.

حەزرەتی ئەبو بەکریش (ڕەزای خوای لێبێت) یەکێك بوو لەوانە. ئەو کاتەی مەککە لە دۆخێکدا بوو کە ئیمانداران شوێنیان نەدەبوویەوە، حەزرەتی ئەبوبەکریش یەکێك بوو لەوانەی کە مەککە لە ئامێزی نەدەگرت. ئەویش بیری لەوە کردەوە کە هاوشێوەی هاوەڵەکانی، کە پێشتر بەرەو حەبەشە کۆچیان کردبوو، کۆچ بکات. لەڕێگا توشی موشریکێك دەبێت بە ناوی ئیبنولدەغینە دەپرسێت:

- بەرەو کوێ دەڕۆی ئەی کوڕی ئەبوو قوحافە؟

- هۆزەکەم منیان دەرکرد و ئیدی نایانەوێت لە نێویاندابمێنم.

- چۆن کەسێکی وەك تۆ لە مەککە دەردەکرێت؟ لە کاتێکدا تۆ یارمەتی هەژاران و بێباوکان و بێوەژنان دەدەیت. دەرکردنی کەسێکی وەك تۆ لە مەککە، بێبەشکردنی مەککەیە لە گەورەیی و بایەخی تۆ. وەرە ژێر پارێزگاری منەوە من دەتپارێزم.

حەزرەتی ئەبوبەکر دەگەڕێتەوە، ئەویش ئەوە ڕادەگەیەنێت کە حەزرەتی ئەبوبەکر ئیدی لەژێر پارێزگاری ئەودایە و کەس ناتوانێت ئازاری بدات. بەڵام موشریکەکان تا چ ڕادەیەك خۆیان پێ ڕادەگیرا لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر و چواردەورەکەی و کەشی مەعنەوی قورئان خوێندنەکەی تێپەڕبوونی کات ئەمەی ڕوون دەکردەوە.

حەزرەتی ئەبوبەکر مەرجەکانی ئەو موشریکە پەسەند دەکات و دەچێتە ماڵەکەی خۆی و بۆ خۆی دەست دەکات بە قورئان خوێندن. پاش ماوەیەك بەردەم پەنجەرەکەی ڕێك دەخات و ئیدی لەوێدا نوێژ دەکات و قورئان دەخوێنێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر مرۆڤێکی چاو بە فرمێسك بوو ئەو ساتەی بیوتایە "اللهِ" یەکسەر ئەسرین لە چاوانی دەباری. بە دەم هەنسکی گریانەوە نوێژی دەکرد. ئەو کاتانەی کە لەبەر پەنجەرەکەیدا خەریکی بەندایەتی بوو بۆ پەروەردگاری، خەڵکیش لە منداڵ و پیاو و ژن و هەرکەس لەو ناوەبوایە وەکو پەروانە چواردەوریان دەگرت و گوێیان لێدەگرت کاتێ قورئانی دەخوێند و لە هۆش خۆی دەچوو، ئەوانیش بە گوێبیستبوونی ئەو دڵیان بۆ ئیسلام گەرم دەبوو.

ئەم دۆخە موشریکەکان بێزاردەکات، بۆ ئەو مەبەستە دەچنە لای ئیبنول دەغینە و پێیدەڵێن: " حەزرەتی ئەبوبەکر لە سایەی پارێزگاری خۆت دەربکە، وەگەرنا دەبینە تێکدەری ئەو پارێزگارییەی کە تۆ لەوی دەکەیت، دواتر با خەڵکیش بە خراپە باست نەکەن."

ئیبنول دەغینە بە حەزرەتی ئەبوبەکر دەڵێت کە واز لە قورئان خوێندنەکەی بهێنێت، حەزرەتی ئەبوبەکریش لە وەڵامدا دەڵێت: "من چۆن دەبێت لە قورئان خوێندن دەستهەڵبگرم، ئەمە کەلامی خوایە، ئەم کەلامە بۆیە دابەزیوە بۆئەوەی مرۆڤایەتی گوێڕایەڵی بکەن، سوێند بە خوا گەر تۆش لە سایەی پارێزگاری خۆتی دەرمبکەیت، من لەژێر سایەی پارێزگاری خوادا درێژە بەم کارەم دەدەم."

## چۆن دەبێت سپی پێستێك خزمەتی ڕەش پێستەکان بکات؟!

ئێمە لە ناوچەیەکی هەژارنشینی کینیادا ژیان بەسەر دەبەین. ڕۆژەکانی ژیانمان زۆر دووبارەن. دەستکەوتنی پارچە نانێك بەسە بۆ دڵخۆش کردنمان، خۆم و هاوسەرەکەم ومنداڵەکانم لە ماڵێکی گچکەی لە تەنەکە دروستکراودا دەژین. هەرگیز سکاڵای حاڵمان ناکەین چونکە زۆربەی خەڵکی کینیا بارودۆخیان وەك ئێمە وایە. ئاوەڕۆ بە کۆڵانە تەسکەکانی گەڕەکەکەماندا تێدەپەڕێت. تیشکی خۆری بەتینیش ماڵە لە تەنەکە دروستکراوەکەمان وەك تەنوور گەرم دەکات. نەخۆشییەکانی وەك مەلاریا و سکچوون و گرانەتا یەخەمان بەرنادەن. لەم وڵاتەی ئێمەدا سپی پێستەکانیش دەژین، بەڵام تەواو جیاواز لە ئێمە. ژیانمان هەمیشە لە چوارچێوەی جیاوازی"ئێمە"و"ئەوان"دا بەسەر دەبەین. بوونی ئەو هەموو جیاوازییە لە نێوانماندا شتێکی نامۆ نییە. لەبەرئەوەی کابرای سپی پێست هەمیشە لە ئێمە پلەی بەرزترە. هەردەم بەهێزە. بەردەوام شایستەی ڕێزە. نوێنەرانی ئاینە جیاوازەکانیش کاتێك دێن بۆ گەیاندنی بیرو باوەڕەکانیان، ئەم جیاوازیەی ڕەنگی پێستمان لەبەرچاو دەگرن و زەقیدەکەنەوە، گەر بە گوفتاریش ئاماژەی پێ نەکەن، لە کرداریاندا هەستی پێدەکرێت.

سپی پێستەکان لە سەر سفرەی جیاواز دادەنیشن، ئوتومبێلی جیاواز بەکار دەهێنن، لە خانوی جیاوازدا دەژین، ئێمە هەمیشە لە ئەندێشەی ئەوەدا بوین ڕۆژێك لە ڕۆژان کەسانێکی سپی پێست بناسین کە وەك ئێمە بیربکەنەوە. بە چاوی پڕ فرمێسکەوە خەون بەوەوە دەبینین چارەڕەشیی ئەفریقامان بەم بەیەك گەیشتنە سپی ببێتەوە. بەڵام کاتێك بەیانی بەخەبەر دێین خەیاڵەکانمان کۆتای دێن و ڕاستییەکانی ژیان وەك قامچیەك دەدرێتەوە بە ڕوومان‌دا.

چیرۆکەکەمان بەم جۆرە بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژەی ئەوانمان ناسی، واتە ئەو

کاتەی کە هاوسەرەکەم لە یەکێك لە خوێندنگاکانی خزمەتدا وەك مامۆستایەك دەست بەکار بوو. بەڵێ ئەوانیش سپی بوون بەڵام بە هەڵسوکەوتیان و شێوازی ژیانیان سەرجەم ئەو بیر و بۆچوونانەیان تێکشکاند کە لە مێشکماندا دەربارەی سپی پێستەکان ڕەگیان داکوتیبیبوو.

حەسەنی هاوسەرم ئەو هاوینە وەك مامۆستا دەستی کرد بە کار لەو خوێندنگەیەی خزمەت کە تازە کرابوویەوە. هەرگیز ئەو قسانەی حەسەنم بیر ناچێتەوە کە ئێوارەی یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوونی کردنی. بە تاسەمەندییەکی قووڵەوە ئەمانەی بۆ باس کردم: "دەزانی بەشێك لە مامۆستاکان وکارمەندانی بەڕێوەبردنی ئەو خوێندنگایەی کاری لێدەکەم سپی پێستن، بەڵام زۆر جیاوازن لەو سپی پێستانەی ئێمە تا ئێستا ناسیومانن! ئێمەش لەگەڵ ئەوان لە ژێر هەمان هەلومەرجدا کاردەکەین، لە سەر هەمان مێز و هەمان خواردن دەخۆین. لەوەیە باوەڕ نەکەی، بەڵام وەك یەکێك لەخۆیان و هاوڕەگەزی خۆیان مامەڵە لەگەڵ من و هاوڕێ ڕەش پێستەکانی دیش دەکەن. مامۆستایەکی سپی پێست بە سینی چای بۆ گێڕاین! بەڕێوەبەری خوێندنگەکە جارێکیان منی بانگ کردو دەربارەی هەلو مەرجی ژیانمان زانیاری لێ وەرگرتم.

ئەو شتانەی کە حەسەن باسی کردن بەڕاستی سەرسووڕهێنەر بوون، کابرایەکی سپی پێست چۆن خزمەتی ڕەش پێستەکان دەکات! ئەمانە بە ڕاستی هەڵسوکەوت گەلێك بوون کە ئەو کاتە نەمان دیبوون. بۆیە بە حەسەنم گووت: ”حەتمەن ئەم هەڵسوکەوتانەیان لە ناخەوە نییە، تازە هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و پێویستیان پێمانە لەبەر ئەوەیە بەم شێوەیە هەڵسوکەت دەکەن، پاش چەند مانگێك ئەمانیش وەك سپی پێستەکانی تر مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن.“ بەڵام چەندین مانگ تێپەڕین و هەڵسوکەوتی مامۆستاکانی ئەم خوێندنگەیە لەگەڵمان هیچ نەگۆڕا. بگرە بە پێچەوانەوە تا دەهات گەرم و گوڕتر دەبوون و تێکەڵبوون و یەکترناسینمان زیاتر

دەبوو. وای لیّ هاتبوو مێردەکەم هەموو ئێوارەیەك کە دەهاتەوە، باسی ئەوانی بۆ دەکردم، زۆر تاسەمەند بووم دەرفەتێکم دەست کەویّ و ئەم مرۆڤانە بناسم. لە مێشکمدا هەردەم ئەم پرسیارە هەبوو: "پیاوێکی سپی قەت خۆی بە هاوتای ئێمە نابینێت. لە دڵی خۆمدا دەمگوت بێگومان ئەم دۆخە پەیوەندی بە یاسا و ڕێساکانی خوێندنگەکەوە هەیە." ئێوارەیەکیان دیسان حەسەن بە جۆش و هەڵاوە هاتەوە ماڵیّ پێی وتم: "فاتمە مژدەم بەریّ، ئیدی ئەوان لە نزیکەوە دەناسیت. بەڕێوەبەر پێی وتم لەگەڵ چەند میوانێك کە لە تورکیاوە هاتوون، دەیانەوێت سەردانمان بکەن." لە سەرەتادا زۆر سەرسام بووم چونکە هەرگیز چاوەڕێی شتێکی لەو جۆرەم نەدەکرد. تەنانەت تۆزێکیش لە حەسەن زویر بووم وتم: "تکا دەکەم گاڵتەم پیّ مەکە"ئەویش بە هەمان ئەو دەنگە بەجۆشەوە پێی ووتم"گاڵتە ناکەم، بە ڕاستیمە سبەی ئێوارە دێنە ماڵی ئێمە، باوەڕم پیّ بکە." هاوسەرەکەم تا بڵێی شێلگیر و جددی بوو. باش دەیناسم، ئەستەمە بەو تۆنەی دەنگیەوە و بەو دەربڕینانەی دەموچاوییەوە گاڵتە بکات. ئیدی تاسەمەندی و مەراقێکی شیرین دایگرتم. بەڵام هێشتا بیرم لای ئەوە بوو کە پێدەچێت هەڵەیەك ڕووبدات، بە دەنگێکی بڵند بە حەسەنم وت: "کابرای سپی پێست نایەت بۆ ماڵی ئێمە" ئەوکات دەرکم بەوە کرد کە دەگریم. . . ئای خوایە گیان! بۆ دەگریام. تۆبڵێی ئەم ئەسرینە سپیانەی دەڕژانە سەر پێستی ڕەشم بۆ ئەو ئەفریقا سپییە بێت کە لە مێژبوو بە حەسرەتەوە چاوەڕێی بووم؟ تۆ بڵێی ئەو مرۆڤە ڕوخسار پڕ نوورانەی چاوەڕوانیان بووم ئەمان بن؟ وەك بڵێی لەسەر ئاگر بووم هێندە بەحەسرەتەوە چاوەڕێی سبەینیّ وهاتنەکەیانم دەکرد، لە ناخمدا لە خۆمم دەپرسی"تۆ بڵێی بێن؟، گەر بێن، چۆن لێمان دەڕوانن؟، چۆن مامەڵە دەکەن؟، ئەم دۆخ و ژینگە جیاوازەمان چۆن دەبینن؟"

لەکۆتایدا هاتن. . .

لە پێشدا یەك بە یەك باوەشیان بە مێردەکەمدا کرد. دواتر بە ڕێزێکەوە سڵاویان

لە من کرد بە ڕەوشتێکی بەرزەوە لە ئەحواڵیان پرسیم. لە پەرۆشیدا هەموو گیانم دەلەرزی، لە خۆشیدا قوڵپی گریان لە ناخمەوە دەهات، ڕەنگە گریابێتیشم. پیاوە سپی پێستەکان بە ڕێزێکەوە لە ناخەوە سڵاویان لێ کردم کە تا ئەو ڕۆژە لە کەسم نە دیتبوو. یەکەمین جارم بوو ڕەش پێستێك و سپی پێستێك ببینم بەو جۆرە دۆستانەیە باوەش بە یەکتری دا بکەن. لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بوو، هەموو منداڵەکانمیان یەك یەك لە ئامێز گرت و دەستیان بە سەریاندا هێنا. بە چاوێکی نامۆوە لە ماڵە تەنەکەییە یەك ژوورەکەمانیان نەدەڕوانی و خۆیان بە بەرزتر لە ئێمە نەدەبینی. ئەوکات تێگەیشتم کە ئەو مرۆڤە سپی پێستە ڕوو نوورانی یانە، ئەمانن! دیسان ئەو کاتە تێگەیشتم کە خانووە تەنەکەکەمان شاهیدی بۆ مێژوو دەدا. وا دیاربوو ئەو مرۆڤە سپییانەی کە چاوەڕێ بووم بەختی ڕەشی ئەفریقامان بگۆڕن ئەمان بوون.

## بازمانت بێدەنگ بێت و هەڵسوکەوتت بدوێ

لە ئیسلامدا بناغە کردارە و ڕەفتارە. ئەوەشی کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان دادەنێت زمانی حاڵ وهەڵسوکەوتیانە.

لە ڕاستیشدا هەروایە، ئەو زمانەی کە دەبێ حەق و حەقیقەتی بەوانی دی پێ بگەیەنرێت، پێویستە زیاد لە زمانی"قال"، "زمانی حاڵ"بێت. ئەوانەی گەیشتوون بە ڕێگەی هیدایەت، زمانێکی بەهێزتر لە گوفتار پاڵنەریان بووە. بۆ قەبووڵکردن و بە دەمەوە هاتنی ئیسلام، ئەویش ئەو ژیانە ڕۆحییە بووە کە لە ڕێی ڕەنگپێدانەوەی جوانییەکانی ئاینەوە لە گەیەنەرەکاندا نیشاندراوە. کاتێك حەوارییەکانی حەزرەتی عیسا و هاوەڵانی سەرداری کائینات دەچوونە لای بە نەتەوە جیا جیا کان و ڕاستییان پێ دەگەیاندن، زمانی ئەو میللەتانەیان نەدەزانی، نامۆش بوون بە

کلتوری ئەوان، بەڵام بە دۆخ و هەڵسوکەوت و هەڵوێستیان توانیبویان جێی خۆیان لە سینەیاندا بکەنەوە.

کەواتە دەبێت ئیماندار کرداری پێش گوفتاری بکەوێت. دەبێت ئیماندار ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی سەرمەشقی گوفتارەکانی بێت، لەبەر ئەوەی نە لای پەروەردگار بە درۆزن دەربچێت و نە لە چاوی خەڵکیدا لەکەدار بێت. لە ئاینەکەماندا ئەوەی گرنگە "سەرڕاست یان ڕاستگۆ دەرکەوتن" نی یە، بەڵکو گرنگ "ڕاستگۆ بوون"ە. جەنابی حەق تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: "فاستقم کما امرت ومن تاب معك ولا تطغوا انه بما تعملون بصیر" واتە: "ئەی محمد کەواتە چۆن فەرمانت پێکراوە ئاوا بەڕێك و ڕاستی فەرمانەکان بە جێبهێنە هەروەها ئەو کەسانەش کە لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆلای خواو تەوبەیان کردووە نەکەن لەسنووری فەرمانی خوا دەربچن چونکە بەڕاستی ئەوزاتە زۆر بینایە بەو کردەوانەی ئێوە دەیکەن". ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین نافەرموێت تەنها لە گوفتارداتاندا ڕاستگۆبن و هەوڵی ڕازاندنەوەی وتەکانتان بدەن بۆ ڕازیکردنی مرۆڤەکان. بەڵکو دەفەرموێ "چۆن فەرمانت پێکراوە، لە کارو کردەوەت ڕاست و دروستیت بپارێزە" بەڵێ لەئاینی ئێمەدا گرنگ دەرکەوتن نیە بەڵکو "بوون"ە. وتن و وتنەوە نیە بەڵکو "بەرجەستە کردن و جێبەجێ کردنە". بەم شێوەیە کلیلی کاریگەر بوون بەندە بە بەرجەستە کردنەوە. کاریگەریی لە گوفتاردا نییە بەڵکو لە وەرگێڕانی ئەو وتانەدایە بۆ کردار و پاشان چاوەڕوانی ڕەزامەندیی پەروەردگار دەکرێت.

# که دەیڵێن، خۆشتان جێبەجێی بکەن

نرخی مرۆڤ لای پەروەردگار هێندەی بەجێهێنانی فەرمانەکانی ئاین و خۆپارێزییەتی لە قەدەغە کراوەکان، چەندە نرخ و بەهاشی زیاتر بێت لای پەروەردگار هێندەش کاریگەری زیاتر دەبێت لای خەڵکی. بە هێندەی قەدر و قیمەتەکەشی کاریگەری دەبێت. زمانی گوفتار و زمانی حاڵ دوو ئاوازی جیاوازی یەك زمانن لە بەرزکردنەوە و بەرجەستەکردن وگەیاندنی حەق و حەقیقەتدا. کاتێك ئەم دوو ئاوازە ئاوێزانی یەکدی دەبن لە هەوار و نەعرەتەی حەقدا کەریگەرییەکی سەرسوڕهێنەریان دەبێت. ئەوانەی گوفتار و کرداریان دوو دیوی یەك ڕاستی نیشان دەدەن، دەربڕینەکانیان شوێنی خۆیان دەگرن و بۆ هەمیشە کاریگەر دەبن.

کەسێك گەر خۆی ناتوانێت نوێژەکانی بە خشوع و خضوعەوە ئەنجام بدات، و لە بەرامبەر پەروەردگاری مەزندا هێندە بەڕێزەوە ڕەفتار ناکات کە هەست بە ترس و گەورەیی ئەو بکات لە ناخیدا، با نزیکی باسکردنی نوێژی کامڵ نەکەوێتەوە. چونکە خوای گەورە هۆکاری کاریگەربوونی هەر شتێکی پەیوەست کردووە بە بەرجەستەکردنی ئەو بابەتەوە .

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە نابێت بە هەڵە لەم ئایەتە پیرۆزە تێبگەین کە دەفەرمووێت: "ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆچی شتانێك دەڵێن خۆتان نایکەن؟ وتنی شتانێك کە خۆتان نەیکەن لەو شتانەیە کە خوای گەورە زۆر نەفرەتی لێ دەکات "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟"(الصف ٦١/٢-٣) ئایەتە پیرۆزەکە دەپرسێ (بۆ- بۆچی) نافەرموێ "هەرگیز ئەوانە باس مەکەن کە لە خۆتاندا بەرجەستە نەبووە" بەڵکو دەفەرموێ"مادەم دەیڵێن و دەبنە زوبانی گۆیای حەق و ڕاستی، بۆچی ڕەفتارەکانتان دەربڕی ئەوڕاستیانە نین؟ وتنی

شتێك و جێبەجێ نەکردنی یەکێکە لە گەورەترین ئەو هۆکارانەی دەبنە مایەی تووڕەبوونی خوایی" واتە ئایەتە پیرۆزەکە نافەرمووێت ئەو کەسەی کە باسی شتێك دەکات بەڵام خۆی جێبەجێی نەکردووە دەبێت بەتەواوەتی لێی بێدەنگ بێت، بەڵکو دەفەرمووێت دەبێت ئەو کەسە ئەو شتانەی باسیان لێوە دەکات لە هەوڵی جێبەجێکردنیاندا بێت لە خۆیدا. دەربارەی ئەم بابەتە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە هەمان خەمیان هەبوو پرسیاریان لەم بارەیەوە لە سەردارمان کرد. حەزرەتی ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت لە پێغەمبەرمان پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)! ئایا ئێمە تا ئەو کاتەی کە خۆمان هەموو چاکەیەك بە تەواوی جێبەجێ دەکەین فەرمان بە چاکە نەکەین و تا ئەوکاتەی کە خۆمان لە هەموو خراپەیەك دەپارێزین فەرمانی خۆپاراستن لە خراپە بە خەڵکی نەکەین؟" حەزرەتی رسول اللهِ (روح سید الأنام) فەرمووی: "نەخێر! ئەگەر خۆتان هەموو چاکەیەك، ئەوی ئامۆژگاری کراون جێبەجێشی نەکەن، فەرمانی پێبدەن. گەر خۆتان دوورە پەرێز نەبوون لە هەموو خراپەیەك دووبارە هەوڵی ڕێنموێنی کردنی خەڵکی بدەن بۆ خۆپاراستن لە خراپە."[1]

چونکە باسکردن و بەرجەستەکردن دوو پەرستشی جیان، ئەوەی کە هیچی جێبەجێ ناکات دوو گوناه و ئەوەی کە یەکێکیان جێبەجێ ناکات یەك گوناهی ئەنجام داوە و کاریگەریی کردارەکەی یان گوفتارەکەی نەهێشتووە. وتنی ئەو شتانەی کە نایکەن یان ڕاستتر بڵێین جێبەجێ نەکردنی ئەو شتانەی کە دەیڵێین هەم سزای خوای گەورە بەدوای خۆیدا دەهێنێت و جێ پەنجەتان لێڵ دەکات ومتمانەشتان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. لە ئەنجامدا ئەوەی کە باسی دەکەین وەك ووتەیەکی بێ پێز دەبیسترێت و هەر زوو لەبیر دەچێتەوە.[2]

---

١ ابو حامد الغزالي، إحياء العلوم دين، ٣٢٩/٢
٢ محمد فەتحوڵلا کولەن ، ڕیشەی شکاو، ١٩.٩.٢٠٠٤

## دەبێت دوێنراوەکان بڵێن " لەو ڕوخسارەدا درۆ بوونی نیـیە"

لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا ئەوانەی تینووی ئیسلامن، کاتێك تەماشای حاڵی موسوڵمانان دەکەن و ئەو دۆخانەیان دەبینن کە لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە دەکرێ دووربکەونەوە لە هاتنە نێو بازنەی ئیسلامەوە ئەمەش نموونەی زۆری هەیە. فەرموون نموونەیەك بۆ ئێوە.

مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بوو "ئیبراهیم حەققی"[١] بانگ هێشت کرابوو بۆ کۆڕێکی وتار و ئامۆژگاری لە گوندێکی سەر بە پارێزگای (ئەرزڕوم)، بۆ ئەو مەبەستەش خزمەتکارێك بە خۆی و ئەسپێکەوە نێردرا بە شوێنیدا تا لە بەرامبەر بڕێك پارەدا بیهێنێت بۆ گوندەکە، شایەنی باسە ئەو خزمەتکارە موسوڵمان نەبوو. خزمەتگوزارەکە لەگەڵ ئیبراهیم حەققیدا بەرەو گوند بەڕێ کەوتن بەڵام لەبەر ئەوەی یەك ئەسپیان پێبوو "ئیبراهیم حەققی" نمونەی ئەو ڕەوشتە بەرزەی حەزرەتی عومەری دووبارە کردەوە کە لە ڕۆشتنی بۆ "قودس" لەگەڵ خزمەت کارەکەیدا بە نۆرە سواری وشترەکە دەبوون. خزمەتکارە نا موسوڵمانەکە وتی "گەر خەڵکی لادێکە ئەمە ببیستن ئازارم دەدەن، ڕەنگە کرێکەشم نەدەنێ!"و لەم بارەیەوە پێداگری لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم حەققیدا دەکرد، بەڵام بێ سوود دەبێت، حەزرەتی ئیبراهیم حەققی دەفەرموێت: "کوڕم کەس نازانێ لە دوانەفەسماندا حاڵمان چی دەبێت! تۆ خەمی ئەوەتە خەڵکی گوندەکە ئازارت بدەن، منیش لە خەمی لێپرسینەوەی گەورەی بەردەم خوای پەروەردگاردام" ئیدی بەم جۆرە بەنۆرە سواری ئەسپەکە دەبن. حیکمەتی خوای گەورە وەابوو ئەوکاتەی دەچنە نێو گوندەکەوە هەروەك بەسەرهاتەکەی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) نۆرە دێتە سەر خزمەتکارەکە و خزمەتکارەکەش بە هۆی ترسی لە خەڵکی

١ ئیبراهیم حەققی، یەکێك بووە لە سۆفی و فەیلەسووفانی تورکیا لە نێوان ساڵانی ١٧٠٣-١٧٨٠ ژیاوە، کتێبێکی بەناوبانگی هەیە بە ناوی (معریفتنامە).

گوندەکە، دیسان پێداگری دەکات ودەیەوێت سەرنەکەوێت، بەڵام لە بەرامبەردا حەزرەتی ئیبراهیم حەققی دەڵێت: ”سەرەی تۆیە!“ و لە پێش ئەسپەکەوە دەڕوات و دەچنە نێو گوندەکە. کاتێ خەڵکی گوندەکە ئەم دۆخە دەبینن یەکسەر دەوری خزمەتکارەکە دەدەن و پێی دەڵێن: ”هەی نەفام! بێ ئەوەی لە گەنجیت بڕوانیت چویتە سەر ئەسپەکەو ئەم مامۆستا ڕیش سپی یە بە تەمەنەش بە پیادە دێنیت! ئەمەیە سەر ڕاستییەکەت؟ ئێمە ئاوا تۆمان ڕاسپارد؟“بەم جۆرە کەوتنە سەرزەنشت کردنی. حەزرەتی ئیبراهیم حەققی، مەسەلەکەیان تێ دەگەیەنێت و ئەوانیش واز لە سەرزەنشتی خزمەتکارەکە دێنن. لەم کاتەدا یەکێ لە دانیشتوانی گوندەکە بە خزمەتکارەکە دەڵێ: ”کابرا ! ئەم هەموو چاکە و ڕەفتارە جوانەت لەگەڵ کراوە و بە چاوی خۆت بینیت، ئیتر موسوڵمان ببە!“ پاش یەك دوو خولەك بێدەنگی، خزمەتکارەکە ئەم ڕستە پڕپەندە بە ئامادەبووان دەڵێت: ”ئەگەر بانگهێشتم دەکەن بۆ ئاینەکەی خۆتان ئەوا هەرگیز نابم . . . بەڵام گەر بۆ ئاینی ئەم زاتە موبارەکەم بانگهێشت دەکەن، من هەر لەڕێگا ئیمانم هێناوە.“ بەڵێ مرۆڤی بانگخواز سەرەتا لەبەر خاتری خوای گەورە پاشانیش پێغەمبەرەکەی و ئاین و نەتەوەکەی پێویستە بە جۆرێك بێت ئەوانەی لێی دەڕوانن بڵێن: ”لە ڕوخساریدا درۆ نییە“و پێویستە کەسانی بەرامبەر بگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی کە بڵێن: ”ئەگەر ئەوەی ئەم مرۆڤانەی گەیاندبێتە ئەم کەسێتی و ڕەوشتە بەرزە، ئاینەکەیان بێت، ئەوا بێگومان ئاینەکەیان ڕاستە و درۆی تێدا نییە.“

## بەرجەستەكردنی حەقیقەتەكانی ئیمان لای بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی چۆن بوو؟

وەك خاوەن ژینێكی پڕ نوور كە خۆی بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی تەرخان كردبوو، حەزرەتی "بەدیعوززەمان" هەموو ساتێكی ژینە پڕ ئازارو مەینەتییەكەی سەرقاڵی بەرجەستەكردن و بانگەوازی ڕاستییەكانی ئیمان بووە. كاتێك مامۆستا لە ژێر دیلی و بەندیی ڕووسەكانەوە دێتەوە ئیستانبوڵ ئەم ڕووداوەی بەسەردێت: كە مامۆستا دەگەڕێتەوە لەوكاتەدا كەرنەڤاڵی "كاغت خانە"ی جەماوەری دەبێت. مامۆستا لەگەڵ دوو هاوڕێیدا كە پەڕلەمانتاربوون "مامۆستا مەلا سەید تەها و حاجی ئیلیاس" بەبەلەم دەیانەوێت بچن بۆ شوێنێك، بەڵام هەر لە پردی "گالاتە"وە هەتا "كاغت خانە" ئەمبەر و ئەوبەری ئاوەكە بێشومار كیژ و ئافرەتی ڕۆم و ئەرمەنی و ئیستانبوڵی لێ بوو. بەلەمەكەش لە نزیكییانەوە دەڕۆیشت. وەكو مامۆستا خۆی دەفەرمووێت تەنانەت ئاگای لە بوونی ئەو هەموو ئافرەتەش نەبوو لەوێدا. بەڵام مامۆستا تەها و حاجی ئیلیاس بڕیاریان دابوو مامۆستا تاقی بكەنەوە. بە نۆرە چاودێرییان دەكرد، لەپاش گەشتێكی یەك كاژێری هەردووكیان وتیان: "لەم حاڵەی تۆ سەرمان سوڕماوە، هیچ تەماشات نەكرد."

لەبەرامبەر ئەمەش مامۆستا پێی گووتن: "چێژگەلێكم ناوێ كاتی وئالوودەبوو بە گوناە و نا پێویست بن و سەرەنجامیشیان ئازار و پەشیمانی بێت. "بەڵێ حەزرەتی ئوستاد، لە سێ ماوەی جیاوازدا بۆماوەی دەساڵ لە شاری ئیستانبوڵ ماوەتەوە، بەڵام وەك خۆی دەفەرمووێت تەنانەت بۆ جارێكیش تەماشای حەرامی نەكردووە. لەو ماوەیەی كە بە مەبەستی پشتگیری كردنی بزووتنەوەی ململانێی میللی ڕۆیشتبوو بۆ ئەنقەرە لە كاتی گەڕانەوەیدا بەرەو (وان)، ڕۆژێك بە مەلا حەمید كە لەوكاتەدا لە خزمەتیدا دەبێت دەڵێت: "هەر وەك چۆن ئاگرێكی

بچووك ئەگەر لەدارستانێکدا بڵاو ببێتەوە، وردە وردە ئەو دارستانە دەسوتێنیٚ، خراپی دەکات و لە ناوی دەبات. ئەو ئیماندارەش کە دادەبەزێتە ئاستی نەزەڕکردن و ڕوانینی حەرام، ئەو گوناهە ڕۆژ بە ڕۆژ کردەوەکانی دەخوات و لەناویان دەبات! دەترسم ئیدی عاقیبەتی ئەو بابایە بە ئازار بیٚ. " بەڵیٚ ئەو لە ڕێگەی ئەم شێوازە لە بەکردەکردنەوە هەوڵی دەدا کە حەق و حەقیقەت بۆ خەڵکی باس بکات. بێگومان ئەوەی کاریگەریشی لەسەر خەڵکی دادەنا هەر ئەم جۆرەبوو لە زمانی حاڵ.

## مرۆڤی بەکردەکردن " مامۆستا تاهیری موتڵۆ "

حەزرەتی بەدیعوززەمان بەعەزمێکی سەرسوڕهێنەر و دامەزراوی و فیداکاری و خاوەن هەڵوێستیەوە ژیانی بەسەر بردووە. ئەوانەشی لە خزمەتیدا ژیاون و قوتابیی بوون، وەك مامۆستا خۆی بوونەتە نمونەی زۆر جوان بۆ چواردەوریان . هەر لە خلوصی ئەفەندی یەوە بگرە هەتا خواجە صبری و لە حافظ علی یەوە تا حەسەن فەیزی ئەفەندی و لە ڕوشدی چاکن ەوە تا مصطفی صونگور هەریەك لەم مامۆستا بەڕێزانەمان هەر یەکەو بەپلەی خۆی لە بەرجەستەکردن و بەکردەکردنی حەقیقەتدا زۆر ڕاستگۆ و بەوەفا بوون. ئەوان کۆمەڵێك نوێنەری پڕبەپێستی ڕاستگۆیی و وەفاو ڕۆحی تەبلیغ و ئاشنایی حەق و خۆ تەرخان کردنن. تێگەیشتنی ئوستاد بۆ خزمەت بە شێوەیە بوو، کە ئەگەر لە ناوچەیەك قوتابی یەکی نوور هەبێت، ئەوا ئەو ناوچەیە لەڕوانگەی ئیسلامەوە بە فەتحکراو دادەنرێت. مامۆستا بەو چاوەوە تەماشای قوتابیەکانی دەکرد کە بڵێن " هیممەتەکەم بۆ هەموو نەتەوەکەمە."

بەڵیٚ ئەرکی گەیاندنی حەق و حەقیقەت تەنها لەسەر شانی ئەو سوارچاکانە بنیات دەنرێت کە دڵیان وابەستەی مەفکورە گەورەکان کردووە. یەکێك لەو

قووتابیانەی کە لە خزمەتی مامۆستادا بوون و بوونە پاڵەوانی خزمەتی قورئانی و ئیمانی مامۆستا تاهیری موتلۆیوو. بۆ یەکەم جار کە پەیامەکانی نوور لە چاپخانە لە چاپ دەدران مامۆستا قوتابی یەکانی دەنارد بە ڕاست وچەپدا تا پارەیەکی وەك (٥٠-١٠٠) لیرە بۆ ئەو مەبەستە پەیدا بکەن. "بینینەکانی گەشتیارێك" نوسرابوو بەڵام پارەی لە چاپدانی نەبوو. یەك لە قوتابییە فیداکارەکانی نوور "مامۆستا تاهیر"خوای گەورە بە بەهەشتی شادبکات وتی: " مامۆستا سێ ڕۆژ مۆڵەتم بدە"و خێرا گەڕایەوە گوندەکەی و لە مەیدانی گونددا هەرچی ماڵ و موڵکی هەبوو بۆ خەڵکی ژماردو وتی ئەمانە بۆ فرۆشتن. لە ناو ئەمانەدا ئەو زەوی و زارانەش هەبوون کە لە باپیرییەوە بۆی مابوونەوە. خزمێکی کە بەمەی زانیبوو هات و بە سەرسوڕمانەوە پێی وت"تاهیر! تۆ چی دەکەی؟ دوای فرۆشتنی ئەمانە تۆ چی دەکەیت؟"لە وەڵامدا پێی وت "بە تۆچی دۆخی من؟ من دەمەوێ زەوییەکە بفرۆشم، گەرتۆ نایکڕی بەکەسێکی دی دەفرۆشم".لە کۆتاییدا ئەو خزمە نزیکەی مامۆستا تاهیری کێڵگەکەی کڕی و پارەکەی بە گریانەوە تەسلیم کرد. مامۆستا تاهیریش بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە پارەکەی وەرگرت و تەسلیمی مامۆستای کرد. وە پەیامی "بینینەکانی گەشتیارێك" لە پاش ئەو فیداکاریە گەورەیە توانرا بڵاوبکرێتەوە.

دەبێت گەنج و لاوەکانی ئەمڕۆشمان حەققی ئیرادەیان بدەن و لە کاروانی ئەوان بەجێ نەمێنن. هەر یەکێك لە ئەوان ڕووی لەهەر شوێنێك بکردایە، لەوێ وەك بڵێی زریانێك هەڵیکردبێت، گۆڕانێکی زۆری دروستدەکرد و ڕێی خۆش دەکرد بۆ گەیاندنی حەق و حەقیقەت. لەبەر ئەمە زۆر گرنگە هەر کەسە بە پێی ئاست و داخوازی ئەرکەکەی مافی ئیرادە بدات. ئەگەر ئێمە بەو عەزمە گەورە و دامەزراوییەوە هەڵوێستی خۆمان نیشان بدەین خوای گەورەش ئەو کار و فەرمانە دەکاتە بەشێك لە فیترەت و سروشتمان ئێمەش بێ چەمینەوە و ساردبوونەوە و

دوور لەهەر لەرزەیەك ڕێك دەوەستین و دەكەوینە سەر شاڕێی ئەم كاروانە پیرۆزە.

## كە ئاینەكەتان ئەوەندە جوانە، ئەوا منیش موسوڵمان دەبم

دراوسێیەكی ئیمام ئەبو حەنیفە كە خۆی موسوڵمان نەبوو ماوەی چەند ڕۆژێك بوو چاوی بە ئەبو حەنیفە نەكەوتبوو خەمی لێهاتبوو، بەڵام ئەبو حەنیفەی خۆش دەویست و گەلێك لێی ڕازی بوو. هیچ خراپەیەكی لێ نەدیبوو. بێجگە لەمەش هەركات ئیشێكی هەبوایە زانای پایە بەرز دەمودەست یەكسەر بۆی جێبەجێ دەكرد. ئەو كاتەی كە زانی ئەبو حەنیفە نەخۆش كەوتووە یەكسەر سەردانی كرد. سڵاوی كردوو چووە ژوورەوە. كە لەدەرگاكە چووە ژوورەوە بۆنێكی ناخۆش هاتە لوتی، هەروەكو هەستی بە بۆنەكە نەكردبێت وتی:

- دراوسێكەم. پێمناخۆشبوو بەمشێوەیە بینیمیت. خوای گەورە شیفات بدات.

- سوپاست دەكەم دراوسێكەم.

بۆنی ژوورەوە هێشتا هەر مابوو، زۆر دەیویست بزانێت ئەو بۆنە چیە و لەكوێوە دێت. دەیزانی كە لەماڵی موسوڵمان بۆنی ناخۆش نایەت و گرنگی بە پاك و خاوێنی زۆر دەدەن، بەڵام دەبوو ئەم بۆنە ناخۆشە هۆكارێكی تری هەبێت. پێش ئەوەی بپرسێ دیواری ژوورەكەی بینی كە بەپارچە قوماشێك داپۆشرابوو. پیاوەكە پرسی تۆش هەست بەم بۆنە دەكەیت؟ پێشەوا نەیویست وەڵام بداتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی هاوسێكەی بەبەردەوامی سەیری دەكرد بە ناچاری سەری لەقاند، ئەمە واتای بەڵێی دەدا. دراوسێكەی كە قوماشەكەی لابرد ئیدی هەموو شتێك ئاشكرا بوو. ئیمام فەرمووی: "هاوسێكەم. ئاوی پیسی ماڵەكەی ئێوە بەتەنیشتی ئەم دیوارەدا تێدەپەڕێت. لە ئێستاشدا درزی بردووە و لە دیوارەكەوە دڵۆپە دەكات"پیاوەكە سەری سوڕمابوو.

- ئەی بۆچی بە منت نەوتبوو؟

- بەتۆ؟ چۆن شتی وا دەڵێم!

کەمێك خۆی ڕاستکردەوە و وتی ئەی دەراوسێی ئازیز ئەگەر یەکسەر سکاڵام لەدەستی تۆ بکردایە ئەی مافی دراوسێیەتیم چۆن بەجێبێنایە. بەهۆی ئەو ڕووداوە پیاوە ناموسوڵمانەکە باشتر لەوە گەیشت کە موسوڵمانان چەندە ڕێز و گرنگی بە مرۆڤ دەدەن. ماوەیەك بەبێدەنگی مایەوە و خەیاڵی ڕۆشت. لە پاشاندا وتی:

"ئەو شتەی کە ئێوەی جوان کردووە ئاینەکەتانە"

"بەڵێ جوانی ئیسلامە" مادەم ئاینەکەتان هێندە جوانە، کەواتە منیش وەکو ئێوە دەمەوێت ببمە موسوڵمان. پیاوەکە لەپاش ئەم ڕووداوە شایەتمانی هێناو موسوڵمان بوو. ئەو جوان بەرجەستە کردنەی ئاین لەلایەن ئیمامی ئەبو حەنیفەوە بووە هۆکاری موسوڵمانبوونی دراوسێکەی.

# ٤- فیداکاری و خەمخۆری

## "فیداکاری و بەس"

### فیداکاری و خەمخۆری بە مانای چی دێت؟

فیداکاری ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانێت لە پێناو نەفس، ماڵ و موڵك، سەربەرزی و تەنانەت شەرەفیشیدا واز لە هەندێك شت بهێنێت و بیانکاتە فیدای گەلێك بەهای باڵاتر و بەنرختر. خەمخۆریش کە پلەیەك لە سەروو بەخشندەییەوەیە، واتە بیرکردنەوە لە کەسانی دیکە بەبێ گوێدانە بە هیچ جۆرە بەرژەوەندیەك، هەروەها فیداکاری بەو هەستە دەوترێت کە مرۆڤ بەرژەوەندی کەسانی دیکە بخاتە پێش بەرژەوەندی خۆیەوە.

فیداکاری لە بنەڕەتدا ئەو حاڵەیە کە تێیدا مرۆڤ هەڵدەستێت بەبەخت کردنی ئەو شتانەی کە مافی خاوەندارێتی بەسەریانەوە هەیە، هەروەها ڕەوشتێکیشە کە لە هەموو گۆشەیەکی گەردووندا و لەلای زۆربەی بەدیهێنراوان پەیڕەو دەکرێت. سەرباری ئەوەی کە ئەم خەسڵەتە لە بنچینەدا ئێجگار جوان و بەپێزە، بەڵام دەکرێت بەپێی شوێن و مەبەستی بەکارهێنانەکەی دەرئەنجامی جیاوازیشی لێبکەوێتەوە. ئەوەتا کاتێك بەدیهێنراوە بێ هەستەکان ئەم سیفەتە لە سروشتیاندا دانراوە، کەچی دەبینین لە مرۆڤ داوا کراوە کە ئیرادەی بخاتە گەڕ و ئەم هەستی فیداکارییە بخاتە مەیدانەوە.

دایك لە پێناو کۆرپەکەیدا و سەربازیش لە پێناو نیشتیماندا خەو لە چاوی خۆیان دەتۆرێنن. دڵی دایك و باوك بەوێنەی دڵی کۆترێك بەسەر جگەرگۆشەکانیانەوە دەلەرزێت و هەمیشە دڵیان لە مشتیاندایە و هەزارەها فیداکاری بێ وێنە دەنوێنن. مامۆستاش بەوێنەی هەنگ بە هەزار و یەك هەوڵ و لە هەزاڕ و یەك سەرچاوەوە ئەو هەموو ئەو زانیاریانەی بەدەستی دەهێنێت بە قوتابیەکانی دەبەخشێت. مرۆڤ، ئامادەیە لە پێناو هاوڕێکەیدا هەموو جۆرە فیداکارییەك لەبەرچاو بگرێت و ئەمەش بەناوی خۆیەوە یاخود کەسێکی ترەوە ئەنجام دەدات.

کاتێك دێینە سەر کەسی باوەڕدار، ئەوا بەر لە هەموو شتێك لە بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتیدا بەچەندین فیداکاری زۆر هەڵدەستێت. گشت ئەو نوێژانەی کە بەبێ گوێدانە ساردی و گەرمی، بەیانیان زوو، یاخود لە درەنگانی شەودا بەجێ دەهێنرێن. . ئەو ڕۆژووانەی بەبرسێتی و تونێتییەوە بەبێ جیاوازی لە نێوان هاوین و زستاندا دەگیرێن. دەرکردنی ئەو زەکاتانەی کە بەشێکە لە ماڵی کەسی و بەخشینی بە هەژارەکان. فیداکاری بە ماڵ و بە گیان لە بەجێهێنانی فەریزەی حەجدا، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ داوە. . بەردەوام بوون لە فەرماندان بە چاکە و دوورە پەرێزی کردن لە خراپە بە دێژایی تەمەن کە بەرزترین پلەیە. وە هەموو ئەو جەنگانەش کە لەپێناوی خوادا ئەنجام دەدرێن. . هەموو پێکەوە بەشێکن لە ڕستەی بەندایەتی و ئەو شتانەن کە تەنها بە کەشتی فیداکاری دەتوانن دەریای ژیان تەی بکەن.

دوورکەوتنەوە لەهەموو چێژە ماددی و مەعنەویەکان لە پێناو تەبلیغی ئاینە پیرۆزەکەماندا، چ لەلایەن تاکەوە بێت یان کۆمەڵگە و بەدەمەوە چوونی مرۆڤەکان لەم پێناوەدا، خۆی بۆ خۆی جۆرێکە لە فیداکاریی.

## مرۆڤی فیداکار دەبێت چۆن بێت؟

مرۆڤی فیداکار ئەو کەسەیە کە لە کاتی پێویستدا بەبێ بیرکردنەوە و بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە، گشت ئەو شتانە فیدا دەکات کە خاوەنیەتی و خۆشی دەوێن و گرنگییان پێدەدات. تەنانەت ئامادەیە ئەگەر تووشی جۆرەها ناڕەحەتی و ئازاریش ببێت، واز لە هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی خۆی بهێنێت و نەفسی براکەی پێش نەفسی خۆی بخات. ئەوانەی کە هێندەی خەمەکانی خۆیان بەخەمی خەڵکییەوە سەرقاڵ نابن، ئەو کەسانەن کە لە ڕۆح ناسکیی ڕاستەقینە بێبەشن. ئەم ئاکارە جوانە، یەکێکە لەو گرنگترین تایبەتمەندییانەی کە باوەڕدار لە کەسانی بێباوەڕ جیادەکاتەوە.

فیداکاری، لە بنچینەدا بریتییە لە شێوازێکی ژیان کە لە هێزی باوەڕەوە سەرچاوەی گرتووە. هەموو عاشقێکی حەق کە فیداکاری لە سروشتی خۆیدا دەنەخشێنێت، زۆر هەستیارانە مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەدا دەکات کە لە دەوروپشتی ڕوودەدەن. هەربۆیە دێت ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە وەلا دەنێت کە دەڵێت: "ئاگر ئەو شوێنە دەسوتێنێت کە تێی دەکەوێت" و لەبری ئەوە ئەو وتەیە دەکاتە مەشخەڵی ڕێگەی فیداکاری کە دەڵێت: "ئاگر لە هەرکوێدا بکەوێتەوە لەپێشدا من دەسوتێنێت!" جا کەسێکی لەم جۆرە لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا کەسێکی ستەملێکراو یان چاو بە ئەسرینێك یان برسییەك یاخود خاوەن پێداویستییەك ببینێت، ئەوا دەستبەجێ هەست بە بەرپرسیاری دەکات و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکات.

هەرگیز خۆ کەڕکردن و گوێ پێنەدان لە فەرهەنگی ئەودا جێیان نابێتەوە و دوورە لەو ئاکارە خراپە. هەروەها هەمیشە دەرگای دڵی بەرامبەر ئەو بۆچوونە داخراوە کە دەڵێت: "من خودی خۆم گەلێك پێداویستیم هەیە. ئەوەتا چەندین

کەسی خاوەن دارایی هەیە کە دەتوانن چارەسەر بۆ ئەم بابەتانە بدۆزنەوە. با ئەوانە بیری لێ بکەنەوە و خۆیانی پێوە خەریك بکەن." ئەوەتا قورئانی پیرۆز هانمان دەدات تا یەکێك بین لەو کەسانەی خاوەنی ئەم چاکە کارییە بەرزەن و دەربارەیان دەفەرموێت: "بریا لەناو نەوەکانی پێش ئێوەشدا کەسانی خاوەن چاکە هەبوونایە کە بەریان لە ستەم و نارێکی بگرتایە لە دونیادا! تەنها بەشێکی زۆر کەم لەوانەی ڕزگارمان کردن بەم کارە هەستان. ستەمکارانیش کەوتبوونە شوێن ئەو خۆشییانەی تێیکەوتبوون. بەڕاستی ئەوانە کەسانێکی تاوانکار بوون." (هود ١١٦)

خوای گەورە لەبەرامبەر پاداشتی ئەم ڕەوشتە بەرز و ناوازەوە، هەر لە دونیادا بە چەندین بەخششی جۆراوجۆر پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە و لە دوا ڕۆژیشدا بە چەندین ناز و نیعمەتی بێسنوور خەڵاتیان دەکات. ئەوەتا ئایەتێکی تر لە قورئانی پیرۆز ئەم ڕاستییەمان بەم شێوەیە بۆ دەخاتە ڕوو: "ئەو کەسانەی لە ژیانی دونیادا کردەوەی چاکەیان ئەنجامداوە، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا باشتر لەوەی کە خۆیان کردوویانە پاداشتی چاکەکانیان دەداتەوە، واتە پاداشتێکی لە بەهەشت گەورەتریان پێدەدرێت کە بینینی جەمالی خوای گەورەیە. ئەوانە لەو ڕۆژەدا هیچ لەکە و زەلیلییەك بە ڕوویانەوە نابینرێت. ئەوانە جێگایان بەهەشتی بەرینە و بۆ هەتا هەتایی تێیدا دەمێننەوە."(یونس ٢٦)

بێگومان هەندێك لە مرۆڤەکان پێومریان بۆ فیداکاری جیاوازە و دەڵێن: "با لە پێشدا حەوانەوە و پێویستی و داخوازیەکانی خۆم بەجێ بێن، پاشان بیر لەکەسانی دیکەش دەکەمەوە!"بەڵام ئەم جۆرە ڕوانینە لە ژیان بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەو ڕەوشتی فیداکارییەدا یەکناگرێتەوە کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکات. چونکە ئەو فیداکارییەی کە ئەم کەسانە باسی لێوە دەکەن، لە ڕاستیدا "ئەو بەشە ماددییەی داراییەکەیانە کە خۆیان پێویستیان نییە" هەروەها لە دەمی نەبوونی ئەو

بەشەشدا پێیانەوە دیارنییە و زۆر کاریان لێناکات. ئەو مرۆڤانەی کە ئەمجۆرە ڕەفتارەیان هەیە، دەکرێت وابیر بکەنەوە کە کەسانی فیداکارن. بێگومان ئەمانەش کۆمەڵە ئاکارێکی جوانن، بەڵام هەڵسوکەوتێك نین کە ببنە هۆی ئەوەی کەسانی تریش چاویان لێبکەن و بە تەواوی مانا بە فیداکاری هەستن. کاتێك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەو ڕەوشتە دەکات کە خۆی لێی ڕازییە دەفەرموێت: ” گەر پێویست بوو دەبێت مرۆڤ دەست لەهەموو بەرژەوەندییەکانی خۆی هەڵبگرێت و بەبێ بیرکردنەوە بتوانێت لە خۆشەویستترین شتەکانی دوورکەوێتەوە." خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا پێوەری ئاکاری جوانمان بەمشێوەیە بۆ دیاری دەکات: "خێرو سوودی تەواوی چاکەکاریتان دەستگیر نابێت تاوەکو ئەو شتە نەبەخشن کە زۆر لاتان خۆشەویستە. بێگومان خوای گەورە ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە کە لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن ." (آل عمران ٩٢)

## تایبەتمەندی ڕۆحە فیداکار و خەمخۆرەکان

یەکێك لە لایەنە هەرە گرنگەکانی بانگەواز و گەیاندن بریتییە لە خەمخواردن لە کەسانی دیکە، واتە وازهێنان لە ژیانی خود لە پێناوی خولیای ژیاندنی کەسانی دیکەدا، ئەگەر هاتوو تاکەکانی کۆمەڵگەیەك بەهەستی فیداکاری و خەمخواردن لە کەسانی دیکە خۆیان لێوان لێو نەکردبێت، ئەوا زیندوو بوونەوە و بەپێوە ڕاوەستانی ئەو کۆمەڵگەیە ئەستەمە، سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) شتێکی بەناوی ماڵی دونیا لە دوای خۆی بەجێ نە هێشت، بەهەمان شێوە حەزرەتی ئەبوبەکریش لە کۆچی دواییدا میراتێکی نەبوو دابەش بکرێت. ئەو کاتەی کە حەزرەتی عومەریش خەنجەرەکەی لێدەدرێت و لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا دەبێت، بەم شێوەیە وەسیەت دەکات: "بزانن ئایا موڵکەکەم بەشی دانەوەی قەرزەکانم دەکات؟،

ئەگەر بەشی نەکرد لەکوڕەکانی عدیە داوای بکەن، ئەگەر ئەوانیش لایان نەبوو لە قوڕەیش قەرز وەربگرن و بیدەنەوە."[1]

"ئەو کەسەی کەتەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە یا مرۆڤ نییە، یاخود کەسێکی پڕ کەموکورتییە. ڕێگای گەیشتن بە مرۆڤایەتی ڕاستەقینە لە خەمخواردن و بیرکردنەوە لە کەسانی دیکەوە تێدەپەڕێت، بە ئەندازەیەك کە کەسی فیداکار پێویستییەکانی خۆی فەراموۆش بکات و لەباسی هەوڵی هەڵگرتنی خەمی ئەوانی دی بێت و لەبەرامبەر کەم وکوڕییەکانیاندا دەوری پارێزەر و داکۆکیکەرێك ببینێت. مرۆڤی پێگەیشتوو ئەو کەسەیە تەنانەت کاتێکیش لە دۆزەخ دەری دەکەن و بەرەو بەهەشت دەیبەن ئەو دیسان وشەی "فەرموون" لە یاد ناکات. مرۆڤی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە لەکاتی پڕکردنی سەتڵی خۆی لە شیر، سەتڵی کەسانی دی بە بەتاڵی جێناهێڵێت."[2]

بڵندیی مرۆڤ لای جەنابی حەق، بە گوێرەی هیممەت بەرزییەکەیەتی. دیارترین نیشانەی هیممەت بەرزیش ئەوەیە کە مرۆڤ فیداکاریی بکات لە خۆشی و ئارەزووەکانی خۆی، لە پێناوی دڵخۆشکردنی کەسانی دیکەدا. ئایا، دەکرێت لەو فیداکارییە گەورەتر هەبێت بۆ پاراستنی ئیرادە و تەندروستی کۆمەڵگا، کاتێك مرۆڤ شەرەف و ناموسی دەخرێتە ژێر پێوە بەڵام ئەو تووڕەبوونەکەی دەخواتەوە و هەوڵی خۆڕاگریی دەدات لە پێناو بەختەوەری کەسانی دیکەدا.[3]

ئەوانەی لە پێناو ڕووناك کردنەوەی مرۆڤەکاندا تێدەکۆشن، ئەوانەی لەپێناو بەختەوەریی کەسانی دیکەدا هەمیشە لە بزاوتندان، لە چەندەها هەورازی جۆراوجۆری ژیاندا دەستی یارمەتییان درێژ دەکەن، ئەمانە ڕۆحگەلێکی هێندە

---

١ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر، ١/٦٥

٢ محەمەد فەتحوڵلا گولەن، پێوەر یان تیشکەکانی سەر ڕێ، ١٢١

٣ محەمەد فەتحوڵلا گولەن، پێوەر یان تیشکەکانی سەر ڕێ،١٩٧

مەزنن کە ئیدراکی ناسینی خودی خۆیان کردووە. ئەمانە هەروەك فریشتەی پارێزەری ئەو کۆمەڵگەیەی خۆیان وەهان کە دەبنە بەربەست لەبەردەم هاتنی بەڵا و موسیبەت و زریان و ئاگر. لە ئەگەری هاتنی هەر لەرزەیەکیشدا ئەوان هەمیشە بە وریاییەکی بێوێنەیەوە ئێشك دەگرن.[1]

## فیداکاری دەبێت تەنها لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوای گەورە بکرێت

هەموو ئەو فیداکارییانەی کە دەکرێن، دەبێت لە چوار چێوەی ئیخلاسدا بن. نابێت ئەو کەس و کۆمەڵانەی فیداکارییان لەگەڵ ئەنجام دەدرێت منەتبار بکرێن. فیداکاریی ڕاستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ بەبێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشتێکی ماددی یاخود مەعنەویی بێت، تەنها و تەنها بە ئامانجی ڕەزامەندی خوای گەورە ئەنجامی بدات. پەروەردگاری مەزن بەم شێوەیە پەسنی ئەم جۆرە بەندایەتییەمان بۆ دەکات: "دۆخی ئەوانەش کە ماڵی خۆیان لەپێناوی دەسکەوتنی ڕەزامەندیی خوادا سەرف دەکەن و دڵ و نەفسی خۆیان لە سەر ئیمان دادەمەزرێنن، کارەکەیان وەك باخێك وایە لەسەر شوێنێکی بەرز بێ و بارانێکی دڵۆپ گەورە بەسەریا بباریێ و ئەو باخە دووقات بەر بدات، یا ئەگەر بارانی قەترە گەورە گەورەیش بەسەریا نەبارێت، لەبەر باشی و بەپیتیی شوێنەکەی تەنها شەونم لێی بداو پێی بگەیێنێت. خوای گەورە بە کردەوەتان ئەزانێ و بینایە و هیچی لێ ون نابێ." (البقرة، ٢٦٥)

لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە لە باسی ئەو ئیخلاسەی کە ئیمانداران لە کاتی فیداکاریدا نیشانی دەدەن و تەنها ڕەزامەندی خوایی لەبەرچاو دەگرن

[1] محەمەد فەتحوڵڵا گولەن، پێوەر یان تیشکەکانی سەر ڕێ، ٢٠٨

دەفەرموێت: "تاکە ئامانجی ڕازیکردنی خوای پەروەردگارە و خۆشی لە ڕۆژی دواییدا خۆشنوود دەبێت" (اللیل-٢٠-٢١)، بەڵێ بەو پەڕی شوکرانەبژێرییەوە بەو بەخششە قەشەنگانەی خوا خۆشحاڵ دەبێت، لە ئایەتێکی تریشدا سەبارەت بەوانەی کە لەترسی هەژاربوون واز لە فیداکاری دەهێنن و چاکەکاری فەرامۆش دەکەن دەفەرموێت: "لە قیامەتدا بۆ ئەوەی لە سزا ڕزگاریان ببێت، ئامادەن هەرچییەکیان هەیە و هەرچیشیان شاردووەتەوە و کۆکردووەتەوە هەمووی ببەخشن لە فیدییەی خۆیاندا، بەڵام هیچ کام لەمانە قەبووڵ ناکرێن!"(الرعد ١٨)

## فیداکاری پێغەمبەری سەروەرمان لە لوتکەدا بوو

فیداکاری و خەمخۆریی ئەوانی دی، لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی بانگخوازن. ئەگەر مرۆڤەکان هەر لەسەرەتاوە فیداکاری لەبەر چاو نەگرن یاخود نەتوان لەبەر چاوی بگرن، ئەوا ناتوانن بگەنە ئامانجەکەیان. بێگومان ئەو کەسانەی کە لە کاتی پێویستدا ئامادەن هەرچی سەروەتی ماددی و مەعنەوییان هەیە بیبەخشن، لە کۆتاییشدا بێگومان دەگەنە لوتکە. گەورەترین پێشەوا کە وێنای فیداکاریمان لە بەرزترین لوتکەدا بۆ دەکات، سەروەرمانە. هەموو ژیانی ئەو نازدارە لەسەر بنەمای فیداکاری چنرابوو، هەر لە بەر ئەمە لە پێناوی سەلامەتی مرۆڤایەتیدا تەواوی سەروەتی ماددی و تەندروستی و حەز و ئارەزووە کەسیەکانی کردووەتە قوربانی، لە مەککەدا ئەو کاتەی بناغەکانی ئاینی دادەمەزراند، سەرەتا لە خۆیەوە پاشان لەکەسە نزیکەکانیەوە دەستی پێکرد و وانەی فیداکاری بە هەموو ئەو کەسانە وتەوە کە دڵیان بە ئاینەکەی داو ئاشنای کرۆك و گیانی فیداکاری کردن و خۆشی بوو بە نموونەی بەرجەستە بۆیان.

بۆ نموونە حەزرەتی خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) وەك یەکەم خێزانی سەرومری

پێغەمبەران و سوڵتانی دونیا و دوارۆژ، هەر لەسەرەتاوە بە بێ هیچ دڵە خورپەیەك هەرچییەکی هەبوو لە پێناوی ئەو ئاسۆ پیرۆزەی کە باوەڕی پێهێنابوو، بەخشی. خۆی ئەرکی خەرجی سەرجەم ئەو میوانداریيانەی دەگرتە ئەستۆ کە پێغەمبەری سەروەرمان بۆ تێگەیاندنی بێباوەڕانی مەککە لە ئاینی ئیسلام ڕێك دەخستن، ئەو دایکە بە شکۆیەمان پێش ئیسلام یەکێك بوو لە گەورە دەوڵەمەندانی مەککە، کەچی کە کۆچی دوایی کرد هێندەی کڕینی کفنێکیش ماڵ و سامانی بۆ نەمابووەوە.

## هاوەڵانی سەروەرمان پێشبڕکێیان لەگەڵ یەکدی دەکرد لە فیداکاریدا

ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) پێی گەیاندبوون، نموونەی باڵای بێوێنەی گیانی فیداکارییان نیشان داین، و لە دوای خۆشیان داستانی ژیانیان وەك گەواهی ئەو فیداکارییە بۆ جێهێشتووین، ئەوان لە هەرچییەکدا پێویست بووبێت، لانە و خێزان و کار و هەرچییەکیان هەبوو لە پێگەو کیانیان لەیەك ساتدا و بە بێ بیرلێکردنەوە لە پێناوی ئاینەکەیاندا فیداکارانە کردۆتە قوربانی، لە بری هەوڵدان بۆ بەرژەوەندییە کەسییەکانیان، هەوڵ و تەقەلایان بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی ئاسوودە و پڕ ئاساییش بوو بۆ مرۆڤایەتی.

لەنێو هاوەڵاندا یەکێك لەوانەی کە لەم ڕووەوە پێشەنگە، هاوەڵی فیداکار و خەم هەڵگر، ئەبو طەلحەی ئەنصارییە، ئەو یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە بە بەخشندەیی و فیداکاری ناوبانگی دەرکردووە. حەزرەتی ئەبو طەلحە چەندە فیداکاربوو هێندەش پاڵەوان بوو، بە تایبەت لەشەڕی ئوحوددا قارەمانێتییەکی بێ وێنەی نیشاندا و بە بەهای گیانی خۆی بەرگری لە پێغەمبەرمان کرد. ئەم هاوەڵە زۆر بە کارامەیی

تیری هەڵدەدا، لە لایەکەوە لە بەردەم پێغەمبەری خوادا خۆی کردبووە سپەر و لە لایەکیشەوە دوژمنانی تیر باران دەکرد. لە هەمان کاتیشدا دەیفەرموو: "ئەی پێغەمبەری خوا! هەتا من شەهید نەکەن ناتوانن هیچ لە ئێوە بکەن" پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) ستایشی ئەم هەڵوێستەی ئەبو طەلحە ی کرد و دەربارەی ئەو فەرمووی: "یەك نەعرەتەی ئەبوطەلحە لە جەنگدا هێندەی هێزی هەزار کەس کاریگەرە."[1]

حەزرەتی ئەبو طەلحە و خانمەکەی (ام سلیم) لەلای پێغەمبەری خوا شوێنیان زۆر جیاواز بوو. ئەو جار جار سەردانی ئەم خێزانەی دەکرد و بە دیداری دڵخۆشی دەکردن، ئەوانیش هەرچییەکیان هەبووایە لە ماڵدا پێشکەشیان دەکرد، هەرکاتێکیش لەم ماڵەدا خوانێکی خۆش ئامادە بکرایە بەشی پێغەمبەری خواش دادەنرا[2]، ئەم هەڵوێستانەی ئەوان نیشاندەری بیر و هەستی ناسك و تێگەیشتوویی و تامەزرۆییان بۆ هاوبەشی پێکردن و فیترەتی فیداکارانەیان بوو.

سوور بوونی هاوەڵە بەرێزەکان لە سەر جوان تێگەیشتن و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی و لەولایەنەشەوە کە بوونەتە نموونەیەکی زۆر جوان و بێ وێنە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان، زۆر گرنگە و جێی تێڕامانە. لەم ڕوانگەیەشەوە حەزرەتی ئەبو طەلحە نموونەیەکی جوانی بۆ ئەوانەی دوای خۆی نەخشاندووە. چونکە ئەو بە جوانترین شێوە ئەو پەیامانەی خوێندبووەوە کە بانگەوازیان بۆ فیداکاری دەکرد، زۆر بە جوانی تێیان گەیشتبوو و خستبوونییە بواری جێبەجێکردنەوە.

بەپێی ڕیوایەتێکی حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت)، حەزرەتی ئەبو طەلحە یەکێك لە دەوڵەمەندترینەکانی نێو هاوەڵە پشتیوانەکانی

١ ابن الحجر، اصابة،١٠٨١

٢ ابن سعد، طبقات، ٥٠٤/٣

مەدینە بوو، خۆشەویسترین موڵکیشی ئەو باخچەیەی بوو کە بەرامبەر مزگەوتی پێغەمبەر بوو و ناوی (بیروحە) بوو، پێغەمبەری خوا دەچووە نێو ئەم باخچەیەوە و لە ئاوە سازگارو خۆشەکەی دەخواردەوە، ئەو کاتەی کە ئایەتی: "هەتاکو لە خۆشەویسترینی شتەکانتان لە پێناوی خوای گەورەدا نە بەخشن ئەوا ناگەنە پلەی چاکەکاری"(آل عمران ٩٢) هاتە خوارەوە، ئەبو طەلحە هاتە لای پێغەمبەری خوا و پێی فەرموو: "ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: "ئێوە نابنە چاکە کاری تەواو هەتاکو خۆشەویسترینی شتەکانتان نەبەخشن" خۆشەویسترین ماڵ و موڵکی منیش باخچەی (بیروحە) یە، ئەوە دەیبەخشم لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا. ئەی پێغەمبەری خوا تۆ خۆت بە شێوەیەکی شایەن بە ڕەزامەندی خوای گەورە بەشی بکە." پێغەمبەری خواش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْه) فەرمووی: "ئەمە سەروەتێکی زۆر بە قازانجە، گوێبیستی قسەکانت بووم بەڵام من وای بە باش دەزانم کە تۆ ئەوە بۆ کەس و کارت بەجێ بهێڵیت"، ئەبو طەلحەش وتی: "کەوابێ منیش وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا"، و پاشان لەنێوان خزم و ئامۆزاکانیدا بەشی کرد.[1]

وەك لێرەدا دەبینرێت کە سەروەرمان چەندە خۆشحاڵە بەرامبەر گرنگی دانی فیداکارانەی ئەو هاوەڵە بەرێزەمان بە پەیامی ئەو ئایەتە پیرۆزە. بە پێی ڕیوایەتێك کە حەزرەتی ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە: " پیاوێك دێتە لای پێغەمبەرمان و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا برسیمە. پێغەمبەری خواش هەواڵ دەنێرێت بۆ یەکێك لە خێزانەکانی تا هەندێك خواردن بنێرێت، خێزانەکەشی لە وەڵامدا دەڵێت: "سوێند دەخۆم بەو خوایەی کە تۆی وەك پێغەمبەر ناردووە، لە ماڵەکەماندا لە ئاو زیاتری لێ نییە." پێغەمبەری مەزن هەمان داوا لە خێزانێکی دیکەی دەکات، ئەویش هەمان وەڵامی دەداتەوە و بەم شێوەیە تەواوی خێزانەکانی دیکەشی هەمان وەڵامی

١ بخاري، وصايا، ١٧، زكاة، ٤٤

بۆ دەنێرن، ئەویش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) ڕوو دەکاتە هاوەڵانی و دەفەرموێت: "کێ ئەمشەو میوانداری ئەم پیاوە دەکات؟". یەکێك لە پشتیوانان دەڵێت:

-ئەی پێغەمبەری خوا من میوانداری دەکەم. پاشان پیاوە لانەوازەکە دەباتەماڵەوە، کە دەگەنە جێ بە خانمەکەی دەڵێت:

- با پێشوازییەکی جوان بکەین لە میوانەکەی پێغەمبەری خوا

بەپێی ڕیوایەتێکی دی لە خێزانەکەی دەپرسێت:

- هیچ خواردن هەیە لە ماڵەوە پێشکەشی میوانەکەمانی بکەین؟

خێزانەکەی دەڵێت:

- نەوەڵا تەنها ئەوەندە هەیە بەشی منداڵەکان بکات.

- کەواتە منداڵەکان بخافڵێنە، ئەگەر ویستیشیان بێنە سەر سفرە تۆ هەوڵ بدە بیانخەوێنیت، کە میوانەکەش هاتە ژوورەوە تۆ وا نیشان بدە کە بە هەڵە چراکە دەکوژێنیتەوە، پاشان من کاری خۆم دەکەم. کاتێ لەسەر سفرەکە دادەنیشن خاوەن ماڵ بۆ ئەوەی وای نیشان بدات کە ئەویش نان دەخوات، کەوچکەکە بە بەتاڵی دەبات بەرەو چێشتەکە و پاشان دەیبات بەرەو دەمی. بەم شێوەیە میوانەکەیان سکی تێر دەبێت و ئەمانیش بە برسێتی بەڵام لە نێو دڵخۆشی میواندارییکردنی میوانەکەی پێغەمبەری خوادا دەخەون.

بەرەبەیان ئەو هاوەڵە دەچێتە لای پێغەمبەرمان، سەروەریشمان دەفەرموێت: خوای گەورە خۆشحاڵ بوو بەرامبەر ئەو هەڵسوکەوتە جوانەی کە ئێوە لەگەڵ میوانەکەتاندا کردتان.[1]

لەهەندێ گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەوترێت کە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە

---

١ بخاري، مناقب الأنصار، ١٠، تفسير السورة ٦/٥٦

لەسەر ئەو بەسەرهاتە هاتووەتە خوارەوە:" والذين تبوءوا الدار و الإيمان من قبلهم يحبون من هاجر إليهم و لايجدون في صدورهم حاجة مما أوتوا و يؤثرون على أنفسهم ولو كان بهم خصاصة و من يوق نفسه فأولئك هم مفلحون." واتە "گەر تەنانەت خۆشیان پێویستیان بێت، ئەمان فەزڵی کەسانی دیکە دەدەن بەسەر خۆیاندا. ئەو کەسانە ڕزگاریان بووە کە خۆیان لە چاوچنکۆی نەفسیان پاراستووە." (الحشر ٩)[1]

کۆمەڵگە هەمیشە پێویستی بەکەسانی خۆبەخش و فیداکار و خاوەن دڵ دەوڵەمەندە، بۆیە ئەم جۆرە مرۆڤانە دەبێت هەمیشە لە چاوی کۆمەڵگادا بەرز ڕابگیرێن و گرنگییان پێ بدرێت.

## سوهەیب چ قازانجێکی گەورەی دەست خۆی خست!

سوهەیبی کوڕی سینان منداڵی خانەوادەیەکی نیشتەجێی نەینەوا بوو، منداڵ بووە کە لەلایەن ڕۆمەکانەوە بە دیل گیراوە. پاشان خانەوادەی (ابن کلب) دەیکڕن و دەیهێنن بۆ مەککە و زەنگۆڵەی کۆیلایەتی لە مل دەنێن، تا ئەو کاتەی عەبدوڵڵای کوڕی جود دەیکڕێت و ئازادی دەکات. بەڵام تا ئەو کاتەی عەبدوڵڵا کۆچی دوایی دەکات هەر لەلای دەمێنێتەوە. کە بانگەوازی پێغەمبەری خوا دەبیستێت لەگەڵ عەمماری کوڕی یاسردا پێکەوە دێنە ماڵی ئیبن ئەرقەم و موسوڵمان دەبن. لەبەر ئەوەی لاواز و بێ کەس بوو بۆیە ئەویش بووە یەکێك لەو ئیماندارانەی کە دووچاری زۆرترین نارەحەتی و ئەشکەنجەدان بووەتەوە، لە پاشاندا هەلی کۆچ کردنی بۆ ڕەخسا، لەگەڵ کۆچدا ئەویش بەو هیوایەوە بوو لە هەموو ئەم نارەحەتییانە ڕزگاری ببێت. لەیەکێك لە ڕۆژەکاندا دەکەوێتە ڕێ و کۆچ دەکات بەرەو مەدینە،

---

١ مسلم، الأشربة، ١٧٢

قورەیش لەگەڵ ئەوەی کە گوێبیستی ئەمە دەبن، دێن ڕێی پێ دەگرن و دەڵێن: " تۆ کە هاتیتە ناومان شتێکی هیچ و پوچ و داماو بوویت! هەرچیت بەدەست هێناوە، هەمووی لە نێو ئێمەدا دەستت کەوتووە، ئێستاش هەستاویت و دەتەوێ سەروەتەکەت هەڵگریت و بڕۆیت! شتی واچۆن دەبێت؟! سوێندبێت ڕێگەت پێ نەدەین شتی وەها بکەیت."

سوهەیب بۆ ماوەیەك تەماشای کردن و لێیان ڕاما، بە خەیاڵی خۆیان وایان دانابوو گەر دەست بەسەر ماڵەکەیدا بگرن، ئەویش ناڕوات، ئەو مرۆڤانەی بێجگە لە دونیا خاوەنی هیچ بەهایەکی دیکە نین، هیچ شتێك شك نابەن کە دونیای لە پێناودا فیدا بکەن. لە بەر ئەوە ئاوڕی لێدانەوەو پێی وتن: "ئەی قورەیشییەکان! ئەگەر دەتانەوێت بمکوژن، ئەوە خۆشتان باش دەزانن کە من باشترین تیرهاوێژی نێو ئێوەم. سوێند بە خوا هەتا یەکە بە یەکەی تیرەکانم تەواو نەبن هەرگیز کەستان ناتوانن نزیکم بکەون دوای ئەوەش تا شمشێرەکەم پارچە پارچە نەبێت ناهێڵم دەستتان بە گیانم بگات. خۆ گەر ئامانجتان ماڵ وسامانەکەشمە، ئەوە دەتوانم شوێنەکەیتان نیشان بدەم و هەرچییەکتان پێ خۆشە لێی بکەن."

لەوەڵامدا وتیان: "کەواتە شوێنی سامانەکەتمان نیشان بدە با نەبینە بەربەست لەڕێتدا." سوهەیب نەیدەتوانی لە عەقڵی ساویلکە و ساکاری ئەم پیاوانە بگات، ئەمانە کە هەموو جیهانیان لە ماڵ و موڵکی دونیادا قەتیس مابوو، بۆیە دوبارە بە سەرسامییەوە پرسی: "بەڕاست ئەگەر هەموو سامانەکەمتان بۆ جێبهێڵم ئیدی لەسەر ڕێگەکەمدا لادەچن؟"

ئەوانیش بە شێوازێکی گاڵتەجاڕانە دەیانگوت: "بەڵێ وازت لێ دێنین." لە دڵی خۆشیاندا دەیانگوت لەوانەیە شتی وەها ڕوو نەدات! بەڵام سوهەیب زۆر سوور بوو لەسەر ئەمە، پاشان وتی: "باشە، کەواتە من تەواوی سەروەتەکەم بۆ ئێوە

بەجێ دێڵم." پیاوەکان حەپەسابوون! ئاخر چۆن پیاوێك دەست لە هەموو سەروەت و سامانەکەی هەڵدەگرێت بەس بۆ ئەوەی لەگەڵ موحەممەددا بێت؟!

بە ڕاستی دیمەنێکی سەرسامکەر بوو، تێگەیشتنی ئەمە بە لۆژیکی قوڕەیش زۆر مەحاڵ بوو. ئەم جوامێرییەی سوهەیب پێش گەیشتنی خۆی گەیشتە پێغەمبەری خوا. کاتێکیش بیستی فەرمووی: "سوهەیب چ قازانجێکی گەورەی دەست خۆی خست![1]" بەڵێ بەم ناوهێنانەی، پێغەمبەری خوا باسی فیداکاریی و پاداشتی گەورەی سوهەیبی بۆ هەمووان دەکرد". ئەو پەیامەش کە حەزرەتی جوبرەئیلی دەستپاك هێنابووی باسی ئەم جۆرە بازرگانییەی دەکرد و دەیفەرموو: " لەنێو مرۆڤەکاندا هی وایان هەیە کە لە پێناوی ڕەزامەندی پەروەردگاردا ژیانی خۆی دەکڕێت، بێگومان خوای گەورە بەرامبەر بەندەکانی زۆر میهرەبانە" (البقرة ٢٠٧).

## ژیانی خۆی کردە فیدای هاوڕێکەی

زیندووترین دیمەنەکانی برایەتی و وەفا لەنێوان ئیمانداراندا لە سەردەمی بەختەوەریدا نیشان دراون. ئەوان هاتن بەنرخترین ئەو پەڕە ئاڵتوونییانەیان خستە بەرچاو کە جارێکی تر مرۆڤایەتی ناتوانێت پێیان بگاتەوە. ئەم پەسنە کە پێی دەوترێت خەسڵەتی لەخۆبووردەیی (إیثار) لە نێوانیاندا زۆر جوان ڕەنگی دابووەوە، هەربۆیە قورئانی پیرۆزیش لە ستایشیاندا دەفەرموێت: " فەزڵی ئەوانی دی دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەرچەندە کە خۆشیان زۆر لە پێویستیدا بن." (الحشر ٩)

لێکدانەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە تەفسیرەکاندا بەم جۆرەیە: "نەفسی براکانتان لە نەفسی خۆتان و شەرەف و پلە و پایە و ناوبانگ و تەنانەت لە بەرژەوەندییە

[1] ابن الكثير، البداية، ١٧٣/٣

ماددییەکاندا، و لەو شتانەشدا کە نەفس حەزی لێیەتی پێش نەفسی خۆتان بخەن."
جا ئەم ڕاستییە لەهەموو چەرخێکی مێژووماندا ڕوویداوە و چەندین نموونەی زیندوو تۆمارکراوە.

چەرخی بابوریەکان کە تێیدا ئالآی ئیسلام لە قولآییەکانی ئاسیادا دەشەکایەوە، لێوان لێوە لە نموونەی ئەو وەفا و فیداکارییە. بابورییەکان لەسەرەتاکانی چەرخی شازدەهەمدا بە سەرکردایەتی بابورشاه و نەوەکانی لە ناوچەکانی هندستان و پاکستانی ئەمڕۆدا فەرمانڕەوا بوون، و چەندین خزمەتی ناوازەیان پێشکەش بە مێژووی ئیسلام کردووە.

بایرام خان کە یەکێك بوو لە ئەفسەرە بەناوبانگ و گرنگەکانی ئەو سەردەمە، لە چەندین جەنگدا قارەمانێتی بێوێنەی نیشانداوە. لە زۆربەی جەنگەکانیشدا سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە بەڵام لە یەکێك لە جەنگەکاندا بەدیل دەگیرێت. فەرماندەی سەربازەکان لە سەرەتادا بە جوانی مامەڵە لەگەڵ بایرام خان دەکات، تەنانەت بەهۆی قارەمانێتییە بێوێنەکانییەوە بیری لەوەش کردبووەوە ئازادی بکات. بەڵام جارێکیان بایرام خان بێئاگایانە لە دەمی دەردەچێت و باسی پلانێکی نهێنی خۆی دەکات کە پێشتر نەخشەی بۆ کێشابوو. ئیتر لەو ڕووداوە بەدواوە بەتەواوی مامەڵەیان لەگەڵی گۆڕا و لەبری ئەوەی بڕیاری ئازادکردنی بدەن، بڕیاریاندا بە پەتی سێدارەدا هەڵیبواسن.

کاتێك بایرام خان بە حوکمەکەی خۆی زانی، دەرفەتێکی قۆستەوە و لەگەڵ قاسمی هاوڕێیدا پلانێکیان دانا و هەڵهاتن. ئیتر هەر لەگەڵ بیستنی هەواڵی ڕاکردنەکەیاندا سەربازەکان کەوتنە دوایان و بەبێ ئەوەی زۆر دووربکەونەوە دەستبەجێ قۆڵبەستکران. دەبوو ئەو سەربازانەی کە فەرمانی دەستگیرکردنی ئەمانیان پێ سپێردرابوو بایرام خانیان بکوشتایە. بەڵام ئەوەندە هەبوو نەیاندەزانی

کامیان بایرام خانە و کامیشیان قاسمە. جا لەبەر ئەوەی قاسم کەمێك بە خۆوە بوو، وایان زانی بایرام خانە. هەربۆیە کەوتنە ئامادەکاری بۆ هەڵواسینی. کاتێك بایرام خان لە بارودۆخەکە گەیشت، ئەگەر لە پای گیانی خۆیشی بوایە نەیدەهێشت هاوڕێکەی لە بری ئەم بکوژرێ. دونیای هەستەکانی تەواو ئاڵۆز بووبوو، ئیتر خۆی کۆکردەوە و بانگی کردە بەرپرسی یەکەکە و وتی: "ئێوە بەهەڵەدا چوون، ئەوە بایرام خان نییە، من بایرام خانم، ئەو لەبری من مەکوژن!"

دیاربوو کە قاسم بە دۆخەکەی قایل بوو. هەربۆیە بەبێ ئەوەی هیچ ناڕەزایەتییەك دەرببڕێت ئامادە بوو لە سێدارە بدرێت. بەڵام کاتێك بە ناڕەزایەتییەکەی بایرام خانی زانی، ئەمەی پەسەند نەکرد. چونکە نەیدەویست ئەفسەرێکی قارەمانی بابوریی وەك بایرام خان بکوژرێت. بێگومان ئەوی بە پێویستتر لە خۆی دەزانی بۆ نیشتیمانەکەی. قاسم کە خەسڵەتی لەخۆبووردەیی لە سەرجەم گەردیلەکانی جەستەیدا نەخشاندبوو، زۆر لەسەر خۆ و هێمن بوو. پاشان بە دەستی ئاماژەی بۆ بایرام خان کرد و بە سەربازەکانی وت: "تەماشای ئەو خزمەتکارە ڕاستگۆ و بەوەفایەم بکەن، وا دەیەوێت لە پێناو ڕزگارکردنمدا خۆی بخاتە بری من و ژیانی خۆی دووچاری مەترسی بکات." پاشان تەماشای سەرۆکی یەکەکەی کرد و پێی وت: "تکاتان لێدەکەم ئازادی بکەن با بڕوات. دانی پێدادەنێم کە من بایرام خانم نەك ئەو."

سەرۆکی یەکەکە، باوەڕی بە قسەکانی قاسم هێنا کە بەوپەڕی لەسەرخۆیی و هێمنییەوە ئاڕاستەی کردن. دەرەنجام بایرام خانە ڕاستەقینەکەیان ئازاد کرد. پاشان ئەم ئەفسەرە قارەمانەی کە ئەمان زۆر لێی دەترسان، پاش ماوەیەکی کەم دیسان هاتەوە سەریان، لەو شوێنە دوورکەوتەوە و گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی. لەولاشەوە قاسمی فیداکار لە شوێنی ئەو لە سێدارە درا و مێژوویەکی زێڕینی بۆ خۆی تۆمار کرد.

## فیداکاری لەهەستە ماددی و مەعنەوییەکاندا بەواتای چی دێت؟

"فیوضات" کە کۆی وشەی "فیض"ە بە واتای زۆربوون، لەبەررژان و پڕیی بەرەکەت دێت. ڕێژنە یاخود فیض، لە ژیانی دونیادا بریتییە لەو ئیلهامانەی کە قووڵیی بە جیهانی ڕۆح و دڵی مرۆڤ دەبەخشن و مرۆڤ دەگەیەنن بە فراوانییە دەروونییەکانی؛ لە ژیانی دوارۆژیشدا بەو بەخششانە دەوترێت کە مرۆڤ دەگەیەنن بە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا و شەرەفمەندبوون بە بینینی جەمالی پەروەردگار. کەواتە، دەکرێت بەواتای حەز و چێژی مەعنەوی لە وشەی "فیض" بگەین.

ڕێژنەی هەستە ماددییەکان واتە ویستی مرۆڤ بۆ سوود وەرگرتن لە تام و چێژە ڕێپێدراوەکان. واتە سوود وەرگرتن لەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین لە چوارچێوەیەکی ڕێگەپێدراودا، وەك خواردن و خواردنەوە، پشوودان و حەوانەوە، بەڵام ئەمەش دەبێت بەبێ زیادەڕەوی ئەنجام بدرێت و لەو چوارچێوەیەدا بێت کە خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردووین، جا هەستی بەکارهێنانی ئەم شتانەش بەگوێرەی لەبەرچاوگرتنی لایەنی جەستەیی و ژیانی ماددیمانەوە، مافێکە بە مرۆڤ بەخشراوە و لەهەمان کاتیشدا داخوازیی مرۆڤ بوونە.

بەڵام ئەم سوودمەند بوونەش سنووری خۆی هەیە و دروست نییە مرۆڤ سوود لەو شتانە وەربگرێت کە مافی ئەویان بەسەرەوە نییە، یاخود ئاین بە گونجاوی نازانێت. چونکە ڕەزامەندی خوای گەورە لە کارێکی لەو جۆرەدا نابینرێتەوە. پەروەردگار خۆی هەرچییەکی بە باش دانابێت، ئەوا مافی ئەوەشی داوە بە بەندەکانی تا لێی سوودمەند ببن. هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێت ئەو مافانە

بەکاربهێنێت، گەر نەشیەوێت ئەوا بەکاری ناهێنێت و بەجێی دەهێڵێت بۆ نەوەکانی دوای خۆی.

هەرچی ڕێژنەی هەستە مەعنەوییەکانیشە، ئارەزووی مرۆڤە بۆ چێژە مەعنەوییەکان، واتە ژیان بەئومێدی چوونە نێو بەهەشت و ئەندێشەی بەخشش و پاداشتەکانی ئەوێوە. کەواتە ئیمان بە خوای گەورە و گەیشتن بە ناسینی خوای گەورە (معرفة اللهِ)، لە ڕوانگەی ژیانی دڵ و ڕۆحەوە چێژێکی گەلێك قووڵی هەیە. دیارە لە دەمی نزیکیمان لە پەروەردگارەوە هەستگەلێکی زۆر قووڵ بەدی دەکەین، کە هەرگیز بە نیعمەتە دونیاییەکان بەدەست ناهێنرێن. جا هەموو هەنگاوەکانی ئەو ڕێگەیەی کە بە ئیمان هێنان بە پەروەردگار دەست پێدەکات و بەرەو خۆشەویستی ئەو زاتە خۆی بەردەوام دەبێت، پڕیەتی لە چەندین شتی جوان و چاوەڕوان نەکراو.

دەی کەواتە، ئەو چێژ و لەزەتانەی کە مرۆڤێك لەم ڕێگەیەدا دەستیدەکەوێت، ڕێژنەی هەستە مەعنەوییەکانە. دەکرێت هەندێك جار ڕێبواری ئەو ڕێیە بەرەو پێشتریش بچێت، هەروەك چۆن خوای گەورە بە بەخشندەیی خۆی کۆمەڵە شتێکی قووڵی بە وەلیەکانی خۆی بەخشیوە، دەکرێت هەر ئەویش شتانێکی دەراسا"خارق العادة"یان پێشکەش بکات. یاخود چێژێکی وەها لە بەندایەتی و گوێڕایەڵ کردنی پەروەردگار دەبینێت، بەجۆرێك هەموو ئەو شتانەی ئەنجامیان دەدات وەك ئەوە وایە لەنێو چێژێکی قووڵی مەعنەویدا بیان نۆشێت و وای لێدێت هەر لە دونیادا ژیانی بەهەشت بژی.

ئەمانە ئەو چێژانەن کە دەکرێت مرۆڤ لە ڕووی مەعنەوی و ژیانی دڵ و ڕۆحەوە دەستگیری ببێت. هەربۆیە یەك دڵۆپە لەم هەستانە هەموو هەستە ماددی و جەستەییەکانی مرۆڤ دێنێت. لەمەشەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی، یەك دڵۆپ

چێژی مەعنەویی ژیانی دڵ و ڕۆح لە هەزارەها چێژی جەستەیی و ماددی بەهێزتر و سەنگینترە .

بەڵێ، هەرکاتێك باسی فیداکاری لە هەستە ماددی و مەعنەوی‌یەکاندا دەکرێت، ئەوا یەکسەر گیانفیدایانی ڕێی خزمەت و خۆشەویستیمان دێتەوە یاد کە هەردوو جۆرەکەی ئەم چێژ و لەزەتەیان لە پێناوی ئەو ئامانج و هزرەدا بەخت کردووە کە دڵیان پێداوە. کەسێك کە دڵبەستەی هزرێك بوویێت و ڕۆحی گیانفیدای ئەو ڕێیە کردبێت، هەمیشە ئامادەیە لە گشت ڕێژنە ماددی و تەنانەت مەعنەوییەکانیشی بکشێتەوە و دەستبەرداریان ببێت. هەروەها هەرگیز ئەو چێژ و خۆشییانە ناکاتە ئاوات و ئامانجی خۆی. ئەم فیداکارییەی مرۆڤ لە چێژە ماددی و مەعنەوییەکانی لە پێناو ئامانجەکەیدا، بەو واتایە دێت کە نەك تەنها ئەو شتانە ببەخشێت کە پێویستە لەو پێناوەدا بەختیان بکات، بەڵکو تەنانەت دەبێت لەو شتانەش دوور بکەوێتەوە و بەختیان بکات کە ناچار نییە دەستیان لێ هەڵبگرێت؛ دیارە ئەم هەڵسوکەوتە ڕەفتاری ئەو جوامێرانەیە کە خۆیان بۆ حەق تەعالا تەرخان کردووە.

هەروەك ئاشکرایە، مامۆستا نوورسی لە چەندین شوێنی جیاواز لە پەیامەکاندا باسی ئەم بابەتی"تەرك"ە دەکات. کاتێك ڕێبازی (عجز، فقر، شفقة، تفکر)مان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بە واتای کۆڵەواری، هەژاری، شەفەقەت و بیرکردنەوەدێت، ئاماژە بە ڕێبازێکی بنەڕەتی تەریقەتی نەقشبەندیش دەکات کە"تەرك"ە.

لە ڕێبازی محمد بەهائەددین نەقشەبەندیدا پێویستە چوار شت تەرك بکرێت. ئەم بنچینەیە لە بەیتێکی فارسیدا بەم شێوەیەی خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

"در طریق نقشبندی لازم آمد چهار ترك

ترك دنیا، ترك عقبا، ترك هستی، ترك ترك"

دونیا یەکەمینی ئەو چوار شتەیە کە پێویستە بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی

خوای گەورە تەرك بكرێت. لە كتێبی "المثنوي النوري"دا و لە باسی پێوەری تەركی دونیادا مامۆستا ئاماژە بۆ ئەم بنچینەیە دەكات" دڵخۆش نەبوون بە بەدەستهێنانی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ژیانی دونیاوە هەیە و خەمبار نەبوونیش بەو شتانەی لەدەست دەدرێن." واتە گەر كەسێك توانی لە تەرككردنی دونیادا سەركەوتن بەدەست بهێنێت، ئەوا ئەگەر هەموو سەر زەویش ببێت بە هی ئەو و، هێندەی هەموو دونیاش ببێتە خاوەنی ماڵ و موڵك، ئەوا دیسان زۆر دڵخۆش نابێت، بەڵكو لەپاڵ سوپاسگوزاری بەخششە ناكۆتاكانی پەروەردگاریدا دەڵێت: "خوایە گیان ئەم دەستكەوتەم گرنگ نییە؛ چونكە ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بێت، تۆ و ڕەزامەندیی تۆیە." هەروەها ئەگەر هەموو دونیاش لەدەست بدات، ئەوا بە ئارامگرییەوە مامەڵە دەكات و خەمبار و دڵتەنگ نابێت.

لە بابەتی تەركی دونیاشدا یەكێك لە جوانترین نموونەكان حاڵی حەزرەتی ئەییوبە علیه السلام، پێویستە ئارامگری و تەوەككولی حەزرەتی ئەیوب تەنها لە تووشبوونیدا بە دەرد و بیماری و نەخۆشییەكەی نەبینینەوە، بەڵكو لە سەرجەمی ژیان و ئەو تاقیكردنەوانە بڕوانین كە بە درێژایی تەمەنی دووچاریان بووەتەوە. دیارە كە خوای گەورە بە شێوازی جیا جیا ئەو پێغەمبەرە نازدارەی خۆی تاقی كردەوە و كردیە سەرتاجی ئارامگران.

ڕۆژێكیان حەزرەتی ئەیوب (علیه السلام) هەواڵی پێدەگات كە گورگ مەڕەكانی خواردووە، ڕۆژێكی دیكەش پێی ڕادەگەیەنن كە بەهۆی با و زریانەوە خەرمانەكەی لەناوچووە. جا سەرباری ئەوەی كە هیچ ناڕەزاییەك لەبەرامبەر ئەم هەواڵانەدا دەرنابڕێت، بە تەسلیمییەتێكی بێوێنەشەوە بە خێزانەكەی دەڵێت: "خەمبار مەبە! خوای گەورە خۆی ئەو ماڵ و موڵكەی پێ بەخشیبووم، وا ئێستاش هەر خۆی لێی وەرگرتمەوە. سوپاس بۆ ئەو زاتەی ئەم ئەمانەتەی پێدام تا سوودی لێ وەربگرم و دواتریش لێی وەرگرتمەوە."

ڕۆژێکی دیکەش هەواڵی پێدەگات کە بە هۆی بومەلەرزەوە جگەرگۆشەکانی مردوون. جا گەر بەهۆی شەفەقەتی باوکایەتیشیەوە ئەسرینەکانی چاوی ڕیزیان بەستبێت، ئەوا بەهەمان شێوەی تاقیکردنەوەکانی پێشووی، لە ناو ئارامگری و تەوەککول و تەسلیمییەتێکی پێغەمبەرانەدا دەست بەرزدەکاتەوە و ئەم نزایە دەکات: "سوپاسی بێپایان بۆ ئەو خوایەی کە بەئەمانەت منداڵەکانمی پێسپاردم و دواتریش لێی وەرگرتمەوە."

دوابەدوای هەریەك لەو تاقیکردنەوانەی کە بەسەر ئەو پێغەمبەرە ئارامگرەدا دەهاتن، دەمودەست شەیتان دەچووە لای و پێی دەوت: "ئەوەتا تۆ بەردەوام سەرقاڵی خواپەرستیت و بە هەموو جۆرێك خۆت بۆ بەندایەتی خوا یەکلایی کردووەتەوە، کەچی لە بەرامبەردا خوا منداڵەکانی لێ سەندیتەوە و سەروەت و سامانەکەشی لەناوبردیت. لەوانە خراپتریش، وا نەخۆشیەکەت تا دێت بەرەو خراپبوون دەڕوات؛ ئیتر تا کەی هەر باسی پەرستش و گوێڕایەڵی خوا دەکەیت؟" ئامانجی شەیتان ئەوەبوو دەیویست بەم قسانە حەزرەتی ئەیوب پەلکێشی سەرپێچی خوای گەورە بکاتەوە، بەڵام بێگومان هەوڵەکانی بێهودە بوون. لە بەرامبەریشدا حەزرەتی ئەییوب (علیه السلام) زۆر بەهێزانە ڕووبەڕووی گشت ئەو دەرد و بەڵایانە بووەوە و بۆ هەمیشە پارێزگاری لە ئارامگرییەکەی کرد و، هەردەم بە خۆشحاڵی دڵەوە پێشوازی لەو موسیبەتانە دەکرد کە لە لایەن خوای گەورەوە دەهاتن و دەیفەرموو: "سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەر خۆی ئەمانەی پێی بەخشیم و هەرخۆشی لێی وەرگرتمەوە. کاڵای ئارامگری ئەو پێغەمبەرە نازدارە بەجۆرێك بوو کە هەموو جارێك دەیفەرموو: " هەموو بەخشاییشەکانی خوای گەورە لەلای من ئەمانەت بوون، منیش هەڵگری ئەو ئەمانەتانەبووم؛ وا ئێستاش ئەو ئەمانەتەی لێوەرگرتمەوە."

بەڵێ، گەر بێت و مرۆڤ بەمجۆرە تێگەیشتنە لەو شتانە بڕوانێت کە لە ژیانی دونیادا بەدەستی هێناوە و بتوانێت لە کاتی لەدەستدانی بەشێك یاخود

سەرجەمی ئەو شتانەدا هەمان حاڵ و هەڵوێستی هەبێت، ئەوا دەشێت بڵێین ئەو کەسە تەرکی دونیای کردووە.

تەرکی دونیاش بەو مانایە نایەت کە مرۆڤ هیچ دەستکەوتێکی نەبێت و نەتوانێت ببێتە خاوەنی سەروەت و سامان. بێگومان گەر وابوایە، ئەوا هیچ مانایەك بۆ ئەوە نەدەمایەوە کە ئیسلام هەمیشە مرۆڤی باوەڕدار هاندەدات بۆ بنیاتنانی کاری هاوبەش و هەوڵدان بۆ بە دەستهێنانی زیاتر و دەوڵەمەندبوون. نەخێر، بەڵکو دەبێت مرۆڤی باوەڕداریش کاری زۆر بکات و زۆر بەدەست بهێنێت؛ بەڵام نابێت ئەم دەستکەوت و قازانجانە تەنها و تەنها بە حەسانەوەی خۆی و خواردن و خواردنەوە و کڕینی ماڵ و ڤێلا و باخەوە ببەستێتەوە. دەشێت ئیماندار هێندەی قاروون دەوڵەمەند ببێت و سەروەت و سامانی هەبێت؛ هەروەها دەتوانێت لە بازنەی ڕێپێدراوەکاندا سەرجەم ئەو ئامرازانە بەدەست بهێنێت کە بەهۆیانەوە چێژ لە خۆشییەکانی دونیا وەربگرێت، هیچ کام لەمانە کێشەی تێدا نییە. بەڵکو کێشەی سەرەکی لەوەدایە کە ئەم کەسە سەرجەمی ئەو ئامرازانە لە پێناو نەفسی خۆیدا بەکار بهێنێت و هەرکات پێویست بە فیداکاری بوو، ئەم نەبەخشێت و بە تێپەڕبوونی کاتیش لووتبەرز ببێت و لە شیرازە دەربچێت، دواجاریش لە ژێر ئەو سەروەتەدا دەرنەچێت و بپلیشێتەوە.

کاتێکیش دێینە سەر وازهێنان لە ئاخیرەت "تەرکی عوقبا" ؛ کەسی گیانفیدا پێویستە لەبەرامبەر ئەو هەوڵ و کۆششانەدا کە لە پێناو بانگەوازەکەیدا ئەنجامیان دەدات، چاوەڕوانی بەدەستهێنانی قیامەتیش نەبێت. هەربۆیە ئەگەر هات و مرۆڤ سەرجەمی پەرستش و گوێڕایەڵی خوا و ئەوراد و ئەزکار و، تەنانەت ئەو کۆششانەش کە لەپێناو بەرزکردنەوەی ناوی (الله) دا دەیانکات و، مانەوە و ئارامگرتن لەسەر هەموو جۆرە بەڵا و ناخۆشیەکان، ڕاستەوخۆ ببەستێتەوە بە بەدەستهێنانی بەهەشتەوە و سەرجەم ئەمانە بکاتە هۆکارێك بۆ چوونە بەهەشت،

ئەوا مانای وایە ئەم کەسە لە بری بردنەوە هەر زوو لە ڕێگەی سەرکەوتندا دەیدۆڕێنێت. دەکرێت هەموو ئەم شتانەی باسکران بەسەر کەسێکی گیانفیدای ڕێی خزمەت و خۆشەویستیدا بێن؛ بەڵام نابێت هەوڵبدات بەمانە ئاخیرەت بچنێتەوە. بەڵکو پێویستە بڵێت، "خوایە گیان ئەگەر من بەهەموو ئەم شتانەوە لە تۆ نزیک ببمەوە، ئەوا خۆم بە کەسێکی زۆر بەختەوەر دەبینم. من جگە لە خۆت بەدوای شتی ترەوە نیم و تەنها و تەنها ڕەزامەندی تۆم دەوێت."

بەڵێ، دەبێت کەسی گیانفیدا هەموو ئەو کارانەی پێی هەڵدەستێت و گشت ئەو موسیبەتانەش کە دووچاری دەبێت، تەنها ببەستێتەوە بەخەمی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و خۆشنوود بوونیەوە. هەربۆیە دەبێت ئارام لەسەر هەموو ئەو شتانە بگرێت کە لە پێناوی خوادا بەسەری دێت، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز نابێت ئەمانە -حاشا- بکاتە ئامرازێك بۆ پچڕینی شتانێك لە خوای گەورە. لەبەر ئەوە دەبێت هەرگیز ئەم شتانە وەك سەرمایەیەك نەبینێت و پێویستە هەمیشە بەم هەست و بیرەوە هەستێت و دابنیشێت و بڵێت: "من لە ڕێگای حەق دام و خوای گەورەش تاقیمدەکاتەوە." ئەی مەگەر خوای گەورە خۆی نافەرموێت: "بێگومان ئێمە بە کەمێك ترس و کەمێك برسێتی یان لەدەستدانی خۆشەویستان یان ماڵ و سامان تاقیتان دەکەینەوە." (البقرة ٢/١٥٥) واتە خوای گەورە دەیەوێت پێمان بڵێ: "بە ماڵ و گیان و ترس تاقیتان دەکەمەوە و خۆتانتان پیشان دەدەم کە چین، قورسایتان چەندە، چەندە ئارام لەسەر شتێك دەگرن، لە کوێ و بەرامبەر چی ئارامتان لێدەبڕێت؛ ئێوە خۆتان دەبیننەوە. چونکە کاتێك لە قیامەتدا ڕووبەڕووی ویژدانی خۆتان دەکرێنەوە، هەر خۆتان حوکم لەسەر خۆتان دەدەن." هەربۆیە دەبێت هەموو شتێك ببەستینەوە بە بەدەستهێنانی خۆشنوودیی خوای گەورەوە. چونکە کاتێك دەڵێین "تەرکی عوقبا" مەبەستمان پێی ئەم شتانەیە.

یەکێکی تر لەوانەی کە پێویستە وازی لێبهێنریت نەفسی مرۆڤ خۆیەتی.

"ترك هستي" واته وازهێنانی مرۆڤ له "من" یّتی خۆی و بیر نه‌کردنه‌وه له نه‌فسی خۆی. بۆ نموونه له نوێژدا، تۆ له‌و نێوه‌نده‌دا ده‌رده‌چیت و ئیتر خۆت له‌بیر ده‌که‌یت و ته‌نها بیر له "ئه‌و" ده‌که‌یته‌وه و، نوێژه‌که‌ت و "ئه‌و" پێکه‌وه جێدێڵیت. به هه‌ر وشه‌یه‌کیش که له ده‌مت ده‌رده‌چێت، مه‌به‌ستت پێی ته‌نها ڕه‌زامه‌ندی "ئه‌و" (جله جلاله) ده‌بێت. له هه‌ر ساتێکی نوێژه‌که‌شدا ته‌نها زاتی "ئه‌و" بوونی ده‌بێت؛ وه هیچ به‌شێك له خۆت یان هیچ بیرکردنه‌وه‌یه‌ك له نه‌فست له‌وێدا نامێنێته‌وه. محمد بهاءالدین نقشبندیش ئه‌م حاڵه وه‌ك"ترك هستي"واته "ته‌رکی خود" ناوزه‌ند ده‌کات.

له پاش هه‌موو ئه‌م ته‌رکانه‌ش ڕه‌نگه هه‌ستێکی وا لای مرۆڤ دروست ببێت و بێت به‌بیریدا بڵێت: "من وازم له دونیا و ئاخیره‌ت و ته‌نانه‌ت نه‌فسی خۆشم هێنا. ئیتر من که‌سێکم که له پێناوی ئه‌ودا وازم له هه‌موو شتێك هێناوه. "شاهی نه‌قشبه‌ندیش ئا لێره‌دا باس له ته‌رکێکی تر ده‌کات و ده‌ڵێت: "ته‌رکی ته‌رك" یش پێویسته. واته ده‌بێت ته‌رکی ئه‌م ته‌رکانه‌ش بکه‌یت و له‌بیریشی بکه‌یت که ئه‌م ته‌رکانه‌ت کردووه. ئه‌گه‌ر هێشتا هه‌ر بیربکه‌یته‌وه و بڵێیت: "ئه‌مه‌م ته‌رك کرد، ئه‌وه‌شم ته‌رك کرد" ئه‌وا واتای وایه هێشتا ته‌رکی هیچ کامیانت نه‌کردووه.

به‌ڵێ زۆر گرنگه مرۆڤ ده‌ستبه‌رداری ڕێژنه ماددی و مه‌عنه‌ویه‌کانی خۆی ببێت. چونکه به واز هێنان له‌مانه، مرۆڤ قازانجێکی ئێجگار مه‌زنی ده‌ستگیر ده‌بێت. هه‌ربۆیه کاتێك ئه‌وجۆره تێڕوانینه له ده‌رووندا ده‌سڕێته‌وه، مرۆڤ ده‌بێته خاوه‌نی ژیانێکی چوار ڕه‌هه‌ندی. پاشان قووڵیی ته‌رکی دونیا و، فراوانی ته‌رکی چاوه‌ڕوانییه‌کانی ئاخیره‌ت و، ئاسۆی ته‌رکی خودی خۆت، ده‌تگه‌یه‌نن به‌و مه‌قامه‌ی که ته‌رکی ئه‌م ته‌رکانه‌ش بکه‌یت. له‌م مه‌قامه‌شدا و له‌سه‌رو هه‌موو ئه‌وانه‌ی ته‌رك ده‌کرێن، مرۆڤ زاتی "ئه‌و" (جله جلاله) ده‌دۆزێته‌وه.

بێگومان مرۆڤ به ئه‌ندازه‌ی واز هێنان و فیداکاریکردنی له‌و ڕێژنه ماددی

و مەعنەوییانەی کە لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەدا دەستی دەکەوێت، دەتوانێت لە (خوای گەورە) نزیك ببێتەوە.

## چیمان فیدای خوای گەورە کردووە؟

کە بیر دەکەمەوە قایل دەبم بەوەی دەبێت شەرم بمگرێت، بەڵام هەرچییەك دەکەم ئەو هەستەم بۆ دروست نابێت. کەواتە تەنانەت شەرمکردنیش نیشانەی چاکە و فەزڵێکی تایبەتە. وا من لە خۆم دەپرسم: "چیم لەبەر خوای گەورە لەدەستداوە؟ ئایا هیچ شتێکی وەهام هەیە لەدەستم دابێت؟ یاخود دەستهەڵگرتن و فیداکارییەکی وەهام هەیە شایەنی باس بێت؟" بۆ نموونە، ئایا پلە و پایە یاخود سەروەت و سامانەکەم لەدەستداوە؟ لەکارەکەم بووم؟ متمانەم دۆڕاندووە؟ نەخێر! هیچ کام لەمانە ڕوویان نەداوە. ئەمە لەکاتێکدا لەدەستدانی ئەم شتانە بە دەستهەڵگرتن و فیداکارییەکی ئێجگار گەورە دانانرێت. هەروەك چۆن کاتێك ڕیش دەتاشرێت تیژتر و بەگوڕتر دێتەوە، بەهەمان شێوە لە کۆتایی ئەم لەدەست چوونانەشدا، پەروەردگارمان شتی زۆر باشتر و خێردارترمان پێدەبەخشێت. با ئێستاش لە ئاستێکی سەرووتردا پرسیارەکەمان بکەینەوە:

- تۆ بڵێی ئەندامێکی لەشم لە دەست دابێت کە چاکبوونەوە و خستنەوەجێی مەحاڵ بێت؟ جا کاکڵەی مەسەلەکە لێرەدایە. ئەوەتا دەستم، قاچم، قۆڵم، چاوم و گوێیەکانم هەمووی لە جێی خۆیەتی و هیچ کامیانم لە پێناوی خوای گەورەدا لە دەست نەداوە. بەڵام دەبینیت کەسی وا هەیە کە ماڵ و موڵك و پلە و پایە و ئەندامەکانی لەشی لە دەست دەدات و سکاڵایەکیش چییە لێی نابیستیت. تەنانەت خەمباربوونیش بە خەیاڵیدا نایەت. با کەمێك لەم ڕووداوەی خوارەوە بڕوانین:

ئەوەبوو هەندێك پێغەمبەری درۆزن سەریانهەڵدابوو. هەر بۆیە موسوڵمانان

ڕوویەڕوویان بوونەوە و لەو شەڕەدا کە بە "یەمامە" ناسرابوو توفەیل شەهید دەبێت و "عامر" ی کوڕیشی قۆڵی ڕاستی لە بندا دەپەڕێت. ئەوەی دەبینرا ئەوەبوو کە لە پێناوی خوای گەورەدا باوکەکە گیانی خۆی و کوڕەکەشی قۆڵی فیداکردبوو. کەچی عامر خەمبار نەبوو. بەڵکو بەوە دڵتەنگ بوو کە بۆچی بەوێنەی باوکی شەهید نەبووە و گیانی لە پێناوی خوای گەورەدا بەخت نەکردووە. هەر بۆیە خەفەتی دەخوارد و دەیوت:

- وا دیارە ئەو شانازییەم پێ نەدرا لەگەڵ باوکمدا پێکەوە ڕێی بەهەشت بگرینە بەر.

ڕۆژگار تێپەڕی و ڕۆژێکیان عامر لە کۆڕی ئەمیری باوەڕداران حەزرەتی عومەردا (خوا لێی ڕازی بێت) دانیشتبوو، گوێی لە وتە شیرینەکانی حەزرەتی عومەر دەگرت. دواتر خواردن هێنرا و هەمووان دانیشتن، بەڵام عامر هەر لە دوورەوە تەماشای دەکرد.

سەرباری ئەوەی پێداگرییان کرد ئەویش لەگەڵیان بێتە سەرسفرەکە، بەڵام هەر دانەنیشت. لەبەرامبەر ئەمەدا حەزرەتی عومەر پێی فەرموو: "پێم وابێت دەزانم بۆچی نایەیتە پێشەوە بۆ سەر خوانەکە. دەستی ڕاستت نیە و دەبێت دەستی چەپت بەکاربهێنیت."

پاشان حەزرەتی عومەر بەمشێوەیە بەردەوام بوو لە قسەکانی:

- ئەی عامر، ئەوە باش بزانە کە جگە لە تۆ کەسمان لە ناودا نییە ئەندامێکی جەستەی پێش خۆی ڕۆیشتبێتە بەهەشت. جا بۆیە گەلێك ئازاربەخشە لەسەر خوانێك کۆببینەوە و تۆمان لەگەڵدا نەبێت. دانیشتن لەگەڵ تۆدا لەسەر یەك سفرە و خوان گەورەترین شەرەفە بۆمان. دە وەرە پێشەوە و ئەو شەرەفەمان پێببەخشە کە لەگەڵ مرۆڤێکی گەورەی وەك تۆدا لەسەر یەك خوان دابنیشین کە ئەندامێکی

پێش خۆی ناردووەتە بەهەشت. هەر هیچ نەبێت با ئێمەش بتوانین بەم شێوەیە دڵی خۆمان بدەینەوە و بڵێین:

- ئەی پەروەردگار! ئێمە نەمانتوانی لە پێناوی تۆدا ئەندامێکی جەستەمان فیدا بکەین، بەڵام ئەوەتا لەگەڵ برایەکماندا لەسەرهەمان سفرە دانیشتووین کە ئەو فیداکارییەی بۆ تۆ کردووە. جا لێت دەپاڕێینەوە کە لەبەر ڕێزی ئەو لە ئێمەش خۆشبیت.

ئەم ڕووداوە تەواو منی خستووەتە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. هەر لەبەر خۆمەوە دەیڵێمەوە و پاشان دەڵێم، وازیێنە لە فیداکردنی ماڵ و موڵك و پلە و پایە، ئەوەتا ئەوان ژیانیان دەبەخشن، ئەندامەکانی جەستەیان فیدا دەکەن و لەپێش خۆیانەوە دەیاننێرن بۆ بەهەشت. ئەوەتا ئەوانەش کە بینەری ئەمجۆرە فیداکاری و بەخشینە بوون، دانیشتن لەگەڵ ئەمجۆرە کەسانەدا بە شەرەف لە قەڵەم دەدەن. تەنانەت حەزرەتی عومەر ئەمیری باوەڕداران ئەوان دەکاتە شەفاعەتکار لای پەروەردگار.

ئایا ئەم ڕووداوە پەیامێکمان ئاڕاستە ناکات؟ ئایا پێویست نییە ئێمەش وانەیەکی کرداری لەم ڕووداوە پەند ئامێزەوە وەربگرین؟ هەرکەسێك موسوڵمانێك لە ناڕەحەتییەك ڕزگار بکات، خوای گەورەش بەهۆی ئەوەوە ناڕەحەتییەك لە ناڕەحەتییەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەبات، هەرکەسێکیش کەموکورتی موسوڵمانێك داپۆشێت خوای گەورەش کەموکورتییەکانی لەڕۆژی قیامەتدا دادەپۆشێت. هەرکەسێکیش داکۆکی لە ناموسی برایەکی بکات خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی لە ئاگری دۆزەخ وەردەگێڕێت.

## ئەم چەرخە و فیداکاری

ئەم سەدەیەی دوایی سەدەیەك بوو كە تێیدا خەڵكی ئێمە یەك لە دووی یەك دووچاری گومڕایی و لەناوچوون و چەندین بەڵا و دەردیسەری بووەوە. هەربۆیە گەلێك ئەستەمە بتوانین سەردەمێكی دی هاوشێوەی ئەم سەردەمە نیشان بدەین كە تێیدا بەڵا و ئافات بەم ئەندازەیە بەرۆكی بە مرۆڤ و كۆمەڵگە گرتبێت. دیارە كە مرۆڤی ئەمڕۆمان تەژنەی ڕاستییەكانە و پێویستی بە هەناسە قورئانییەكانە. هەربۆیە وا دەخوازێت ئەو كەسانەی كە بەم كارە هەڵدەستن "خزمەتگوزارانی قورئان" زۆر فیداكار بن و بە هەستێكی قووڵی بەندایەتییەوە وەك پزیشكێكی بە شەفەقەت بۆ دەردەكانی مرۆڤی ئەمڕۆمان بچەمێنەوە و تیماری زامیان بكەن.

گەر بیر لە پاپۆڕێكی مەزن بكەینەوە كە كەوتبێتە سەر وشكانی، ئەوا بێگومان پێویست بە هەوڵێكی زۆر و فیداكارییەكی گەورە هەیە بۆ دووبارە كار پێكردنەوە و وەگەڕخستنەوەی. چونكە هەموو تەوژمێكی فیكری بەپێی بەرزی باڵای، داخوازی هیممەتی بەرز و فیداكاریی جددییە. واتە ئەو فیداكارییەی كە ئەو تەوژمە دەیخوازێت بەگوێرەی مەزنی و شان و شكۆی هزرەكە دەبێت. ئەمەش بەو واتایەی كە ئەگەر بێت و ئەو فیداكارییانەی لەم سەردەمەدا ئەنجام دەدرێن لەسەر هەمان ڕێڕەوی فیداكاری سەردەمەكانی دیكە بن، ئەوا ناتوانین ئەو خزمەتە پێشكەش بكەین كە لێمان چاوەڕوان دەكرێت. هەر بۆیە ئەو كاتەی تێكۆشانێكی زۆر لەسەروو ئاستی ئاسایی و بە پێوەری فیداكاریی هاوەڵە بەڕێزەكان ئەنجام درا، ئەوجا دەتوانین بڵێین كە خزمەتێكی قەبووڵكراو پێشكەشكراوە.

ئەوەتا ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەم سەردەمەشماندا داوای هەمان ئەو فیداكارییەمان لێ دەكات كە لە سەردەمەكانی پێشوودا داوای كردووە. جا بۆیە مایەی خۆشحاڵی و سوپاسگوزارییە كاتێك دەبینین لەم سەردەمەی ئێستاشماندا چەندین بەسەرهاتی

فیداکاری هاوشێوەی فیداکاری هاوەڵان ڕوودەدەن، کە وامان لێدەکەن بە ئومێدەوە لە داهاتوو بڕوانین.

دەگێڕنەوە" کەسێکی فیداکار هەبوو کە بە عەرەبانە دەستییەکەی کولێرە بە قیمەی دەفرۆشت. دوو ساڵ پێش ئێستا هاتە لام و وتی:

"ماموستا، دەزانم ئێوە بەدوای شوێنێکدا دەگەڕێن بۆ قوتابییەکان و دەتانەوێت بیانگرنە خۆتان. دەی من توانیومە لە داهاتی کولێرە بە قیمەی ئەم عەرەبانە دەستیەم دوو خانوو دروست بکەم. بۆ خۆم یەکێك لەم دوو خانووەم سەروزیادە. گەر ئێوە قەبووڵ بفەرموون ئەوا دەمەوێت خانووەکەی تریان ببەخشم تا ببێتە شوێنی مانەوەی قوتابییەکان."

بەڵێ، منیش ئەم داوا پڕ دڵسۆزییەم نەدایە دواوە کە لەسەر ڕاستەڕێی ڕەزامەندی خوای گەورە بوو. چونکە وا بیرم کردەوە وتم بەڵکو بەهۆی پەسەندکردنی ئەم داوایەوە ببمە هۆکاری ئەوەی ئەم پیاوە ئەم خزمەتەی دەستگیر ببێت و خوای گەورە لە منیش خۆش بێت. ئەم کەسە بەڕێزەی کە خۆی بەخشیبوو بە خوای گەورە و تینووی خێرکردن بوو، تەنها بەم فیداکارییەوە وازی نەهێنا. ئەوەبوو دوای تێپەڕبوونی شەش حەوت مانگ، دیسان هاتەوە لام و ئەم جارەیان ئەم داوایەی لێکردم و وتی: "ماموستا، لەبەردەم ماڵی خۆماندا باخچەیەك هەیە. دەمەوێت ئەم باخچەیە بکەمە بەشە ناوخۆییەك کە سەد خوێندکار لە خۆ بگرێت."

من سەرەتا بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە کەوتمە تەماشاکردنی ڕووخساری ئەم پیاوە کە بە عەرەبانە دەستییە بچکۆلانەکەی کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕا و کولێرە بەقیمەی دەفرۆشت، پێم وت: "باشە چۆن دەتوانیت بە عەرەبانەیەك و فرۆشتنی کولێرە بەقیمە بەم کارە هەستیت؟"

بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە: "ماموستا خەمتان نەبێت، پشتیوان بە خوا بە

چاکە و بەخشایشی خوای گەورە و پاشان نزاکانی ئێوە بەم عەرەبانەیە ئەم کارە تەواو دەکەم."

ئەوەبوو بەڵێنەکەی بردە سەر و هەر بەو عەرەبانە دەستییە و بە فرۆشتنی کولێرە بە قیمە توانی بینای بەشە ناوخۆییەکە تەواو بکات.

بێگومان ئەم پیاوە لە کاتی بە پایان گەیاندنی ئەم کارەدا بە چەندین فیداکاری هەستابوو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا. یەکێك لە هاورێکانم دەیوت بینیومە پێڵاوەکانی کەڵکی لەپێکردنیان نەمابوو بەدوای پێڵاوێکی کۆنەدا دەگەڕا بۆ ئەوەی لەپێی بکات. بەڵێ دەبێت کەسێکی فیداکار کە دڵی وابەستەی ڕاستی کردبێت هەر بەم جۆرە بێت.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا بەرپرسیارێتی بڵاوکردنەوەی ڕاستیەکانی ئیمان و قورئان و بناغەکانی ئیسلام بە شێوازێکی دروست، ئەرکی سەرشانی ئیمانداران و ئەهلی قورئانە. بەڵی، ئەم فەرمانبەرییەی کە تایبەتە بە ئیمان و قورئان لە هەرە گەورەترین بابەتەکانی سەر زەوی گرنگتر و مەزنترە. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر هەموو ئیماندارێك کە بەوپەڕی حەز و هێز و وریاییەوە کاتەکانی بۆ بابەتەکانی وەك پەرستش، خزمەتی ئیسلام، چاکسازی و بانگەوازی نەفس بە زانست و ڕۆشنکردنەوەی بیری نەوەی نوێ بە پەروەردە و فێرکردن تەرخانبکات. ئەمەش بۆ ئەوەی ئەو شتە زیادانەی کە بە لای ئەهلی دونیاوە جوان و سەرنج ڕاکێشن، لە دیدی ئەمدا شتانێکی بێمانا بن و کاتەکانی بەو شتانەوە بەفیڕۆ نەدات.

چەندە بەختەوەرە ئەو کەسەی خۆی بە ژیانی ئەهلی دونیاوە سەرقاڵ ناکات کە لە ڕواڵەتدا ڕازاوە و، لە ڕاستیشدا پووچ و ناوەڕۆك پیس و بەتاڵە و، دڵی بۆ شتە بێ نرخەکان لێنادات کە سەراپا بریتیین لە ڕابواردن و، بە سەرنجڕاکێشییان ناخەڵەتێت و بەختیاریی هەمیشەیی خۆی نادۆڕێنێت. هەزاران سڵاو لەو کەسانەی کە کاتە

بەنرخەکانیان فیدای ئەو بابەتانە دەکەن کە بەڵێندەری بەختیاریی هەمیشەیین، وەك ڕەخساندنی زەمینەی دروستبوونەوەی چەرخی بەختەوەری بۆ نەوەکانی داهاتوو.

## فیداکاریی ئەنسار ئەسرینی لە چاوی هەمووان هێنابوو

پێغەمبەری خوا بە تەنها دانیشتبوو. پاش ماوەیەك دەرگاکە کرایەوە و هاوەڵە پێشەنگەکانی کۆچبەران هاتنە ژوورەوە. ئەوەبوو کەسیان لە پشتیوانان لەگەڵدا نەبوو وە دیمەنەکەش هەتا بڵێی سەرنج ڕاکێش بوو. دەبوو بۆچی تەنها کۆچبەران هاتبن و کەسیش لە پشتیوانان بانگهێشت نەکرابێت؟

داوای مۆڵەتیان کرد و بەمجۆرە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا عەرزی حاڵی خۆیان کرد:

"ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە لە پێناوی خوای گەورەدا (جل جلاله) کۆچمان کرد و هاتین بۆ ئێرە. هەموو ئاواتیشمان ئەوە بوو کە لە پێناوی خوای گەورەدا پێکەوە لەگەڵ تۆ بین. کەچی برا پشتیوانەکانمان هێندە بایەخمان پێدەدەن و خزمەتمان دەکەن دەترسین لەوەی هەر لێرە پاداشتی ڕۆژی دواییمان دەستبکەوێت. دەمانەوێت براکانمان مۆڵەتمان بدەن و ئیدی خۆمان پێویستییەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین. با ئەو بەشەی بۆ ئێمەیان جیاکردۆتەوە بیگەڕێنینەوە بۆ خۆیان. بەڕاستی ئێمە زۆر منەتبار و شەرمەزارین."

لە کاتی وتنی ئەمانەدا هەموو دەگریان. پێغەمبەری خواش بەری بە ئەسرینەکانی نەگرت، "ڕەنگە ئەم دیمەنە دانیشتووانی ئاسمانیشی هێنابێتە گریان". ئەمەی ڕوویدەدا لە ڕوویەکەوە بریتی بوو لە بەریەککەوتنی هەستی دڵ دەوڵەمەندی و خەمخۆری. بەجۆرێك تا ئەو ڕۆژە لەسەر ڕووی زەویدا بەریەککەوتنی لەوە جوانتر نەبینرابوو چونکە پاش کەمێك کە پێغەمبەری خوا پشتیوانانی بانگکرد

و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش هەموو پێکەوە بەرامبەر بەم هەستی استغنایەی کۆچبەران وەستانەوە، چونکە پەسەندکردنی ئەو داوایەی ئەوان هیچ جیاواز نەبوو لەوەی قایلبن بە دوولەتکردنی جەستەیان. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەوان لەگەڵ براکانیاندا بە شێوەیەکی وەها ئاوێتەی یەکدی ببوون، کە جیابوونەوەیان واتای مردنی دەگەیاند بۆیان، پاش کەمێکیش هەرهەموویان لە حوزوری پێغەمبەری خوادا بوون، بەڵام پشتیوان و کۆچبەر هەموو دەگریان. سەرەڕای ئەوەی لە هەمان شاردا دەژیان و ڕۆژانە پێنج جار -بەلایەنی کەمەوە- لە مزگەوتدا پێکەوە بوون، کەچی هەتا بڵێی بەلایانەوە گران بوو لەو سفرە و ماڵەی لەگەڵیان بەشکردبوون جوودابینەوە.

بەڵێ کۆمەڵێکیان لێوانلێو بوون لە دەوڵەمەندی دڵ و کۆمەڵەکەی تریشیان لە جوامێری و خەمخۆری. کۆچبەران مۆڵەتی قسەکردنیان وەرگرت:

"ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە لەبەرخاتری خوای گەورە (جل جلاله) کۆچمان کرد و هاتینە مەدینە. هەر لەبەر ڕەزامەندی ئەویش ماڵ و نیشتیمانمان بە جێهێشت. دیارە کە بێجگە لە بەرز ڕاگرتنی ئاینی خوای گەورە، بیرمان لە هیچ شتێکی دیکە نەکردەوە، بەڵام برا پشتیوانەکانمان زۆر بەزیادەوە خۆیان کردە خاوەنمان و زۆر بەخشندانە هاتن بەدەممانەوە. ئێمە لەوە دەترسین کە هەموو سودەکانی ڕۆژی دوواییمان لێرەدا تەواو بکەین. ئەی پێغەمبەری خوا تکات لێدەکەین، ئێمە نەمانتوانی براکانمان قایل بکەین، تکایە ئێوە بە ناوی ئێمەوە پێیان بڵێن کە ئیتر وازمان لێبهێنن، با خۆمان لە شوێنێکدا بمێنینەوە و چیتر ئەو داهاتانەی کە دەستیان دەکەوێت بە ئێمەی نەبەخشن و بە ئامادەکراوی خواردن نەخەنە بەردەستمان، با چیدی خەمی خزمەتکردنی ئێمەیان نەبێت، ئەم منەتبارییە ئیدی بەسە."

ئەوەندە هەستیان ناسك ببووەوە دەگریان. پێغەمبەری خواش زۆر دڵی پڕ بوو. بە پشتیوانە بەڕێزەکانی فەرموو:

''برا کۆچەبەرەکانتان دەڵێن: "ئەمان زۆر خزمەتمان دەکەن و شەرمەزاریان کردوین، ئەگەر ئێمە هەموو پاداشتی ئەوەی کردوومانە وەریگرین، ئیتر ڕەزامەندی خوای گەورە چی بەسەر دێت؟!''

بەڵێ، پێغەمبەری خوا بەو شێوەیە هەناسەی برایەتی کردبوو بە ڕۆحیاندا و بەو شێوەیە ئاوێزانی یەکتری کردبوون کە وەك مۆمی هەنگوین شێلابوونی و شێوەی پێبەخشیبوون.[1] ئەوە چەندین سەدەیە ئەم تێگەیشتنە کۆمەڵگەی ئیسلامی بە زیندوویی هێشتووەتەوە، بەڵام بەرژەوەندییە سادە دونیاییەکان، پلە و پایە، سود و قازانج و شەڕی دەستکەوتنی سەروەت و سامان نەیانتوانیوە هەیەجانی بەندایەتی و ڕۆحی خزمەتکردن و هەستەکانی برایەتی لەسەر رۆحی موسوڵمانان هەڵبکۆڵن و ئەو تابلۆیە دووبارە بنەخشێننەوە.

---

١ محمد فەتحوڵلا گولەن، نوری نمر، ١١٧/٢

## بۆچی مامۆستا بەدیعوززەمان دیاری وەرنەدەگرت؟

مامۆستا بەدیعوززەمان، کە هەموو گۆشەیەکی ژیانی بۆ خزمەتکردنی ئاین تەرخان کردبوو، تەواوی ژیانی بە فیداکاری و خەمخۆری و دڵ دەوڵەمەندییەوە بەسەر برد و هیچ کاتێك دەستی لەم هەڵوێستە بەرزە هەڵنەگرت. ئەو هەمیشە دەیگوت ڕێبازەکەمان ڕێبازی هاوەڵانە. برسێتی و زەحمەت و چەرمەسەری تێدایە. "هەربۆیە دیاری لە کەس وەرنەدەگرت. تەنانەت ئەگەر قوتابییەکی زۆر خۆشەویستیشی هێشوویەك ترێی پێشکەش کردبایە، ئەوا بێگومان نرخەکەی دەدا. لەوەڵامی ئەو کەسانەشدا کە پێداگرییان دەکرد پێی دەوتن: " دەستوری ژیانم تێکدەچێ و خراپ دەبێت بۆم."

قووتابییەکانی مامۆستا ئاماژە بەوە دەکەن کە هەرگیز نەیانبینیوە مامۆستاکەیان دیارییەکیان لێوەربگرێت بی ئەوەی نرخەکەی بدات. ئەوانەی کە ئەم حاڵەی مامۆستایان دەبینی بە لایانەوە سەیربوو بۆیە دەیانپرسی: "باشە مادام دیاری لە کەس وەرناگرێت ئەی چۆن ژیانی بەسەردەبات؟" بێگومان حیکمەتی ئەمە لە دەستپیوەگرتنەکەی و بونەجێی درەخشانەوە ئیلاهییەکەیدا بوو. ئێستاش بە نیازی زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە چەند نموونەیەکی ژیانی مامۆستا دەخەینە ڕوو:

مامۆستا لەو ساڵانەدا کە لە بارلا بوو هەندێجار سەردانی باخی دۆستەکانی دەکرد. ئەگەر تەنها دوو دەنکە ترێشی لێکردبایەوە دەیوت : "پارەی ئەمە چەند دەکات، با بیدەم." بێگومان خەڵکی بەخشندەی بارلا خۆیان بە شەرەفمەند دەزانی کاتێك مامۆستا شتێکی لە باخ و بێستانەکەی ئەوان بخواردایە. بەڵام ئەو هەمیشە لەبەرامبەر ئەو شتانەدا کە دەیخوارد هەر دەبوو شتێکی دابنایە. هەمیشە پارەی وردەی پێبوو. هەندێك جاریش لەبری پارە یەکێك لە پەیامەکانی دەدانێ. خۆ ئەگەر

مامۆستا دیاری وەربگرتایە، ئەوا بێگومان لە ناحیەی بارلادا دەبووە خاوەنی موڵك و سامانێکی زۆر.

کاکە جەیلان چاڵشکان لە تەمەنەکانی منداڵییەوە لە لای مامۆستا بووە و لە ڕێگەی ئەو پسوڵە و تێبینییە دەستنوسانەی کە مامۆستا بۆ کاکە جەیلان چاڵشکانی نووسیوە لەوە دەگەین کە مامۆستا هەروەك چۆن ئەو دیارییانەی کە پێشکەشی خۆی دەکران وەری نەدەگرتن، بە هەمان شێوە ئەو چاکە و خزمەتانەشی بێ بەرامبەر نەدەهێڵایەوە کە لەگەڵی دەکران. ئەمە یەکێکە لەو نامانەی کە بۆ کاکە جەیلانی نووسیوە:

"جەیلان! ئەو ڕابیعەیەی کە بۆ ماوەی ساڵێك جلەکانی بۆ دەشتم، کراسێك و پارچە خەڵوزێکی بۆ ناردووم. لەبەر ئەوەی من لە ماوەی ئەم ساڵەدا زۆر قەرزارباری بووم، ناتوانم دیارییەکەی بدەمە دواوە. وەك وەڵامێك بۆ ئەو چاکەیەی ئەو، لە مەککەوە هەندێ خورما و ئاوی زەمزەمم بۆ هاتووە بۆی بنێرن و زۆر سەلامی منیشی پێبگەیەنن."

پێش ئەوەی ئۆتۆمبێل بکرِدرێت مامۆستا لەگەڵ قوتابییەکانیدا بەپێ هاتووچۆیان دەکرد. هەندێجار لە کاتی چوون یان هاتنەوەدا ڕێیان لە شۆفێرەکان دەکەوت. ئەوانیش یەکسەر دەوەستان و زۆر سووردەبوون لەسەر ئەوەی مامۆستا لەگەڵیان سەربکەوێت و دەیانوت: "مامۆستا فەرموون سەرکەون." مامۆستاش دڵی نەدەشکاند. بەڵام وەك هەمیشە پێی دەوتن: "دەبێت حەقەکەی چەندە بیدەم ئەگەر نا دەستوورەکەم تێکدەچێ." بە دڵنیاییەوە هەر دەبوو پارەکەی بدات. پاشان چەند قسەیەکی خێری بۆ شۆفێرەکان دەکرد و دەیوت: "پیشەی شۆفێری خزمەتی مرۆڤایەتی دەکات، ئەگەر ئێوە نوێژە فەرزەکانتان بەجێبهێنن ئەوا کار و کاسپییەکەشتان بە پەرستش و بەندایەتی بۆدەنوسرێت. "کاتێکیش کە بە بەردەم

بێستان و باخەکاندا تێدەپەڕی، خەڵکەکە لە میوە و بەروو بومی باخەکەیان پێشکەش دەکرد و زۆریان لێدەکرد تا لێیان وەربگرێت. ئەویش دڵی نەدەشکاندن و کەمێکی لێهەڵدەگرت. بەڵام بێگومان لە بەرامبەریدا نرخەکەی دادەنا. ئەوانەی کە نەیان دەویست نرخەکەی لێوەربگرن پێی دەوتن: "ئەگەر نەیدەم ئازارم دەدات، دەستوری ژیانم تێکمەدەن." تەنانەت ئەگەر لە نزیکترین قوتابیشی شتی وەرگرتبایە بێگومان پارەکەی دەدا و مامەڵەی لەگەڵ دەکرد و دەیوت: "ئەمەم بەم نرخە پێ دەفرۆشیت؟"

ئەویش دەیوت : "بەڵێ ئەوە فرۆشتم."

یەکێك لە قووتابییەکانی نوور، "کاك موستەفا بیرلیك"، ساڵی ١٩٥٤ لە ئیسپارتە سەردانی مامۆستا دەکات و پاش یەکترناسین لەگەڵ کاك"فەیزی گوڵ"دا بەرەو "ئیزمیر" بەڕێ دەکەون و ڕۆڵێکی چالاك دەبینن لەمەڕ خزمەتی بڵاوکردنەوە و ناساندنی پەیامەکانی نوور لەو سنورەدا. لەو کاتانەشدا کاك "عەبدوڵلا یەهینیش" لە شاری "مانیسا" وەك ئەفسەرێکی یەدەکی فەرمانبەرییەکەی تەواو کردبوو، بە نیازبوو بچێت بۆ ئیسپارتە بۆ سەردانی مامۆستا.

کاك عەبدوڵلا پێش ئەوەی بڕوات بۆ ئیسپارتە، سەردانی کاکە موستەفای کرد. کاك موستەفا بیرلیکیش پێشتر دەیزانی کە ئەو قاپەی مامۆستا خواردنی تێدەکا کۆن بووە، لەبەر ئەوە کۆمەڵێك کەلوپەلی وەك کەوچك و کەوگیر و سەفەرتاسی کڕیبوو و بە کاك عەبدوڵلادا گەیاندبوویە مامۆستا. بەڵام مامۆستا وەڵامەکەی هیچ دوانەخستبوو لەو نامەیەدا کە بۆ کاکە موستەفای ناردبوو نووسیبووی:

"باشە تۆ دەستوور و ئوسوڵی منت نەدەزانی؟ بۆچی ئەمانەت ناردووە؟"

سەرەڕای ئەوەی ئەو شتانەی کە بۆ مامۆستا هاتبوون نرخێکی وەهای نەبوو بەڵام ئەو بە بیست لیرە خەمڵاندبووی. لەگەڵ ئەمەشدا لە نامەکەدا بۆی

نوسیبوو، "کام کتێبەت دەوێ بڵێ با بۆت بنێرین. " کاکە موستەفاش زۆر لەسەر بابەتەکە نەڕۆیشت، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم کە چووە سەردانی مامۆستا، دیسان مامۆستا لێی پرسیەوە: " کتێبە بیست لیرەییەکەت وەرگرت؟"

ئەویش گەر بیوتایە"وەرمگرتووە"دەبووە درۆ. هەربۆیە وتی " نەخێر وەرمنەگرتووە" ئەوەبوو دووبارە مامۆستا پێداگری کرد و وتی: "چ کتێبێکت دەوێ بڵێ،" کاك موستەفاش کتێبێکی بیست لیرەیی هەڵگرت.

## ڕێبازی پەیامەکانی نوور ڕێبازی فیداکاری ماددی و مەعنەوییە

مامۆستا نوورسی بە درێژایی ژیانی، دەستووری دەستپێوەگرتنی کردبووە بنەمایەکی سەرەکی خۆی و هەمیشە ڕێگەی ئاتاج نەبوون بە کەسانی دی هەڵبژاردووە. لە هەموو کایەکانی ژیانیدا پابەند بووە بە یاساکانی دەستپێوەگرتنەوە. هەمیشە کەمی دەخوارد و کەم دەنوست و ژیانێکی سادەی بەسەردەبرد. یەك نان بەشی هەفتەیەکی دەکرد، دەستێك جل بەشی چەندین ساڵی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا شەرمی نەدەکرد جلی پینەکراو لەبەربکات. ئەو دەستوورەی ژیانی کە هیچ شتێکی بێ بەرامبەر لەکەس وەرنەدەگرت "بە دیاریشەوە"، ببووە هێزێکی گەورە بۆ مامۆستا و دەرەنجام گەیاندیە لوتکەی سەرکەوتن لە ڕێبازەکەیدا.

مامۆستا بەم شێوەیە باس لەم راستییە دەکات: "پەیامەکانی نوور لەسەر بنەمای خۆنەویستی ماددی و مەعنەوی دامەزراوە، من بەشبەحاڵی خۆم هەموو دەستکەوتە ماددی و مەعنەوییەکانم لەم پێناوەدا بەختکرد و زیاد لەمەش بەرگەی هەموو ئەو ئازار و موسیبەتانەم گرت کە هاتنە ڕێم. هەر ئەم جۆرە لە بەختکردن بوو حەقیقەتەکانی ئیمانی بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە و شاگردانی عیرفانیی

نوور سەدەها هەزار بەڵکو ملیۆنەها شاگردی دیکەیان پێگەیاند. لەمە بەدواش هەر ئەوانن بەردەوامی دەدەن بە خزمەتی ئیمان و هەرگیز لە دەستووری وازهێنان لە دەستکەوتی ماددی و مەعنەوی دەستهەڵناگرن، چونکە تەنها ئامانجی ئەوان ڕەزامەندی پەروەردگاریانە. هیوادارم هیچ شاگردێکی پەیامەکانی نوور بە ئەندازەی گەردیلەیەك هیوای تۆڵەکردنەوە لە دڵیاندا دروست نەبێت بەرامبەر بەوانەی کە ڕۆژگارێك ناسەزایی و جەفاکارییان بەرامبەر نواندووە، زیاد لەمە ئومێدی دامەزراوی و ڕاستگۆیی زیاتریان بۆ دەکەم لەم کارە پیرۆزەیاندا."[1] مامۆستا نوورسی زۆر گرنگی بەم پێنج خاڵەی لای خوارەوە دەدا:

١. داهێنانی شێوازێکی وانە وتنەوەی تایبەت بەخۆی. ئەمەش واتە پێکەوە گرێدانی زانستە ئاینیەکان و زانستەکانی سەردەم و، چەسپاندنی ڕاستیەکانی ئیمان بە زانستەکانی سەردەم و هەوڵدان بۆ ڕووناك کردنەوەی بیری قوتابییەکانی.

٢. وەرنەگرتنی پارە لەبری دیاری لە هیچ کەسێك و قەبووڵنەکردنی مووچە. بەڵێ، سەرەڕای ئەوەی کە خاوەنی هیچ موڵکێکی ماددی نەبوو وە هەمیشە هەژارانە و بێکەسانە ژیاوە و، زیندان بە زیندان گواستراوەتەوە و دووچاری چەندەها ناڕەحەتی سەخت هاتووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەبووە کە پارە و دیاری بێ بەرامبەر لە هیچ کەسێك وەربگرێت.

٣. پرسیار نەکردن لە هیچ زانایەك. لە ماوەی بیستساڵدا هەردەم وەڵامی ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە لێی کراوە. خۆی سەبارەت بەمە دەیوت: "من ئینکاری زانستی زانایان ناکەم؛ لەگەڵ ئەوەشدا پرسیارکردن لێیان بەزیاد دەزانم. کێ گومانی لە زانستەکەی من هەیە با بپرسێت و منیش وەڵامی بدەمەوە."

٤. ڕێگرتن لە قوتابییەکانی تا هاوشێوەی خۆی زەکات و دیاری وەرنەگرن.

---

١ سەعیدی نورسی، پاشبەندی ئەمیرداغ، ٨٠

هانی دەدان کە تەنها و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە کار بکەن. تەنانەت زۆربەی کاتەکانیش خۆی دەرماڵەی قوتابییەکانی دەدا.

٥. نەبەستنی پەیوەندی لەگەڵ هیچ شتێکی دونیادا و دڵنەدان بە چێژە کاتییەکانی. ئەوەتا وتوویەتی: "دەبێت بتوانم هەموو ماڵەکەم بە دەستێك هەڵبگرم و بیگوازمەوە." کاتێك هۆکاری ئەمەشیان لێ دەپرسی دەیوت: "سەردەمێك دێت هەرچی کەسە ئاوات بەحاڵم دەخوازێت. دواتر، نە ماڵ و نە سەروەت چێژم پێ نابەخشن، ئەوەتا بە چاوی میوانخانەیەکەوە لە ژیانی دونیا دەڕوانم."[١]

## ئایا هەرگیز بووە خەلیفە حەماڵی بکات؟

شەوێکیان حەزرەتی عومەر بەنێو شاردا دەگەڕا، لەو کاتەدا گوێی لە هاواری دایکێك بوو کە دوو ڕۆژ بوو منداڵەکانی برسیبوون:

- ڕۆڵەکانم، خوای گەورە مافتان لە عومەر بستێنێت!

کاتێك حەزرەتی عومەر گوێی لەم وتانە دەبێت لەبەر دەرگای ماڵەکەدا هەموو گیانی دێتە لەرزین.

هەر بۆیە بانگ لە ژنەکە دەکات:

- بڵێ چیت لە عومەر دەوێت؟

- جا تۆ بۆ دەپرسیت؟ دۆستیت یان دوژمن؟

- لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار، وەك دۆستێك دەپرسم.

---

١ ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی، ٤٥-٤٦

- عومەر باوکی منداڵەکانمی ناردووە بۆ سەربازی. وا دوو ڕۆژە منداڵەکانم برسین و هەر مەنجەڵە ئاو دەخەمە سەر ئاگر و تێکی دەدەم، بەمەش هەڵیان دەخەڵەتێنم و وایان نیشاندەدەم کە سەرقاڵی نان ئامادەکردنم بۆیان. دوێنێ شەو توانیم بەم چاوەڕوانییەوە بیانخەوێنم، بەڵام وا ئەمشەو خەویان لێناکەوێت و لە تاو برسێتی باوەشیان بەیەکدا کردووە و هەر دەلالێنەوە.

- باشە، ئەی هەواڵت داوە بە عومەر ؟

- هەواڵی چی بدەمێ؟ ئەو خۆ هەر دەزانێت پیاوەکانمان بنێرێتە سەربازی، بەڵام بۆ هیچ بیر لەو ماڵ و منداڵەیان ناکاتەوە کە جێیان دێڵن؟ ئایا سەرۆك بوون، بوونە بەڵای سەرە؟ پاشان حەزرەتی عومەر بەدەم گریانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و بەپەلە تورەکەیەك ئارد و قاپێك ڕۆن هەڵدەگرێت و دەڕوات بەرەو ماڵی ئافرەتەکە. لە ڕێگادا چاوی دەکەوێت بە یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان و ئەویش دەپرسێت:

- ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە خێرە بۆ وا بەپەلەیت؟ ئەو کۆڵەتم بدەرێ با هەڵیبگرم.

- نەخێر ناتدەمێ، ئەمانە باری گوناهەکانی عومەرن. وا ئەمڕۆ بارەکەمت هەڵگرت، بەڵام سبەی ناتوانیت لە بەردەم خوای گەورەدا گوناهەکانم هەڵبگریت. وازبێنە با خۆم هەڵیبگرم. حەزرەتی عومەر دەچێتە ماڵەکە و کەمێك ئارد دەردەکات و دەیکاتە ناو مەنجەڵەکەوە. پاشان فوییەك لە ئاگرەکە دەکات کە خەریکە بکوژێتەوە و بەم هۆیەوە کەمێك لە ڕیشی دەسوتێت. ئیتر شۆربایەکی ئاردیان بۆ دروست دەکات و برسێتی منداڵەکان دەڕەوێنێتەوە و سکییان تێر دەکات، دواتر بە دایکی منداڵەکانیش دەڵێت:

- بێگومان دەبێت سبەی بچیتە لای عومەر.

ژنەکە لە بەرامبەر چاکەکانی ئەم پیاوە نەناسەوە گەلێك سوپاسگوزار و خۆشحاڵ بوو. بۆیە کاتێك پیاوەکە ماڵەکەی جێهێشت، ژنەکە لە دوایەوە وتی:

- دەك خوای گەورە لەبری عومەر تۆ بکاتە سەرکردەمان.

ئیتر حەزرەتی عومەر بێ ئەوەی هیچ بڵێت لەوێ دووردەکەوێتەوە. بۆ ڕۆژی دواتر کاتێك ژنەکە دەچێتە لای ئەمیری باوەڕداران، دەبینێ وا هەمان ئەو پیاوەی کە دوێنێ شۆرباکەی بۆ لێنابوون وا ئێستا لە پێگەی سەرکردەدا دانیشتووە! پاشان ژنەکە داوای لێبووردنی کرد و وتی:

- ئەی ئەمیری باوەڕداران بمبوورە. دوێنێ لە تاو ناڕەحەتی گیانم بوو قسەی ڕەقم پێ وتی و ئازارم دایت. حەزرەتی عومەریش فەرمووی: نەخێر، تۆ بە ئەرکی سەرشانت هەستاویت. عومەر تاوانبارە. لە ڕاستیدا دەبێت ئێوە گەردنی من ئازاد بکەن.

بەڵێ ئەوان بەم جۆرە بوون. . .

# ٥. ڕاوێژ

”هاوشێوەی یەکەم میراتگرەکان، شورا بۆ قودسییەکانی ئەمڕۆشمان یەکێکە لە هەرە گرنگترین پەسنەکانی ژین و یاسایەکی بنچینەییە“[1]

## ڕاوێژ بە واتای چی دێت؟

ڕاوێژ بە واتای گۆڕینەوەی بیروڕا دێت لە نێوان چەند کەسێکدا بە مەبەستی ئەنجامدانی کارێك و کۆمەك وەرگرتن لە دیدی کەسانی دی لە پێناو گەیشتن بە ئەنجامێکی دروست. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: "تۆ داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە و لە کاروبارەکانتدا ڕاوێژیان پێبکە و بە ڕەچاوکردنی بۆچوونی ئەوان بڕیار بدە." ( آل عومەران٣/١٥٩) لە ئایەتێکی تریشدا خوای گەورە ڕاوێژ وەك بنەمایەکی زۆر گرنگ باس دەکات کە موسوڵمانان پێش بڕیاردان لەسەر هەر کاروبارێك دەیگرنەبەر و دەفەرموێت: ”کاروبارەکانیان بە ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن“ (الشوری٤٢/٣٨)

پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) ڕادەی گرنگیدانی خۆیمان

١ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن

لەمەڕ ئەم بابەتە بۆ دەخاتە ڕوو و بە هەردوو هاوەڵی خۆشەویستی خۆی حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر دەفەرموێت: "ئەگەر ئێوە ڕاوێژ لەسەر بابەتێك بکەن و بگەنە دەرەنجامێك، ئەوا من هەرگیز پێچەوانەی ڕاوێژەکەتان ناجولێمەوە."[1] هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: "ئەوەی ڕاوێژ بکات پەنجەی پەشیمانی ناگەزێت"[2] بەم جۆرە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) لە هەموو ساتێکدا هانی ئومەتەکەی داوە بۆ ڕاوێژکردن. سەروەرمان خۆیشی، کاتێك هەواڵی هاتنی ئەبو سوفیانی پێ ڕادەگەیەنن، ڕاوێژ لەگەڵ پشتیوانان دەکات لەسەر ئەوەی کە دەبێت چۆن ڕەفتار لەگەڵ ئەبوسوفیان بکەن. جگە لەمانەش، لەسەر هەریەك لە بابەتی دیلەکانی بەدر، لەپێش جەنگی ئوحود و خەندەق و ڕووداوی ئیفك، هەروەها لە بابەتی بانگ و زۆربەی بابەتەکانی تریشدا ڕاوێژی بە هاوەڵان کردووە.[3]

پێغەمبەری نازدار بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە دەگونجێت کەسێك لە بیرو بۆچوونە کەسیەکانیدا هەڵە بکات، بەڵام دەرئەنجامی ڕاوێژی بەکۆمەڵ هەمیشە پێکانە، بۆیە دەفەرموێت: "میللەتان تا ئەوکاتەی ڕاوێژ بنەمای کاروبارەکانی ژیانیان بێت، زەلیل و ڕیسوا نابن."

دەبێت وەك فەرمانێکی خوای گەورە و سوننەتێکی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) گرنگی بە ڕاوێژ بدرێت. پێشینانیشمان وتوویانە: " گوێڕایەڵی قسەی گەورەکان بکە و. . . شاخە سەختەکان تەی بکە "هەروەها وتراوە"بڕیاری دوو ژیری پێکەوە لە ژیرییەك پەسەند ترە." ئیدی بەمشێوەیە ئەوانیش گرنگی ڕاوێژیان بە کورتی و پوختی باس کردووە.

---

١ احمد بن حنبل، مسند، ٢٢٧/٥
٢ هيثمي، نورالدين، مجمع الزوائد، ٢٨٠/٢
٣ ابن سعد، الطبقات، ٢/٣٥٠-٣٥٢

## ڕاوێژ فەرمانێکی قورئانییە!

لوقمانی حەکیم دەڵێت: ”لەو کارەی دەیکەیت، سەرەتا ڕاوێژ بە کەسانێك بکە کە تێیدا بەئەزموونن، چونکە ئەوان ئەو بۆچونانەی بە گران دەستیان کەوتووە بە خۆڕایی بە تۆی دەبەخشن.“ مرۆڤ هەرچەندە خاوەن ئەزموون و زیرەکییش بێت، گەر لە کاتی چارەسەرکردنی کێشەکاندا ڕاوێژ بە کەسانی دیکە نەکات ئەوا لەسەر ڕێگەیەکی هەڵەیە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) سەرەڕای ئەوەی لە ڕووی ئەقڵ و ژیرییەوە پێشەنگی هەموو مرۆڤایەتییە، کەچی هەردەم بابەت و گرفتەکانی بە ڕاوێژ چارەسەرکردووە. لە چەرخی بەختەوەریشدا چەندین بەسەرهاتی لەم جۆرە بەدی دەکرێت، ئەمەش نموونەیەك:

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) پێش جەنگی بەدر ویستی کەناری نزیکترین بیر لە خۆیانەوە بکاتە پەناگە. لەم کاتەدا یەکێك لە هاوەڵان کە حەزرەتی (حوباب الجموح)ە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد:

”ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا هەڵبژاردنی ئەم شوێنە فەرمانێکی جێگیری خوای گەورەیە و کە ئێمە نەتوانین لێی لا بدەین؟ یاخود ئەمە بۆچوون و تاکتیکێکی جەنگیە؟“

سەروەرمان لەوەڵامدا دەفەرموێت: ”نەخێر، ئەمە تەنها بۆچوونێك و تاکتیکێکی جەنگە.“ هاوەڵەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: ”کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا، ئێرە شوێنێکی گونجاو نی یە. با سوپاکە لێرە بجوڵێنین و بچینە نزیکترین بیر لە دوژمنەوە و لەوێدا چاڵێك دروست بکەین و پڕی بکەن لە ئاو، هەرچی بیرەکانی دیکەش هەیە هەر هەمووی بشێوێنین بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێت سوودیان لێوەربگرێت.“ پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) دەفەرموێت: ”تۆ ئاماژەت بۆ پێشنیارێکی جوان کرد.“ ئیدی لەسەر پێشنیاری ئەم هاوەڵە کەوتنە جووڵە و

ئامادەکاری.[1] بەڵێ، ڕاوێژ فەرمانێکی قورئانە، بۆیە جۆرێکیشە لە پەرستش. هەروەها مەرجێکی گرنگیشە بۆ ئەوانەی ڕاستییەکانی قورئانیان کردووەتە پێشەنگ بۆ خۆیان، ئەم فەرمانە قورئانییە بەجێ بهێنن و هەوڵبدەن بە ڕێگەی ڕاوێژ کێشەکان چارەسەر بکەن.

مرۆڤەکان لە ڕێگای ڕاوێژەوە، لەوە دەگەن کە چەندە ئاتاجییان بە هاوکاری یەکدی هەیە. بە واتایەکی دی، ئەوانەی ڕاوێژ بە بنەمایەکی گرنگ دەبینن لەنێو خۆیاندا و بە پێی ڕاوێژ هەڵسوکەوت دەکەن، کەسانێکن کە یەکدییان خۆشدەوێت و هەست بە ئاتاجی یەك دەکەن و ڕێز لە بیر و بۆچوونی یەکدی دەگرن. بە پێچەوانەشەوە ئەوانەی سەربەخۆ و بەبێ ڕاوێژ بە کەسانی بەئەزموون هەڵسوکەوت دەکەن، کەسانێکن هاوکارەکانیان خۆشناوێت و هەست بە پێویستی و ئاتاجیان ناکەن، بۆیە هەمیشە ڕوانینەکانی خۆیان بڵندتر دەبینن لەوان و گرنگی بە بۆچوونەکانیان نادەن.

وەك ئەوەی گونجاو نییە کەسێك بێ نیاز بێت بەرامبەر خەڵکی، بەهەمان شێوەش ئەو کەسەی ڕاوێژ بە کەسانی دیکە ناکات مانای وایە لەو ماهییەتەی خۆی نەگەیشتووە کە لێوان لێوە لە کۆڵەواری و هەژاری و هەستکردن بە کەم وکوڕی. ئەمەش گرفتێکی گەورەیە کە مرۆڤ تووشی دەبێت. گرنگیدان بە ڕاوێژ لە کەمی مرۆڤەوە نییە، بەڵکو لە پێگەیشتوویی و کامڵیەوەیەتی و نیشاندەری ئەوەیە کە دەیەوێت خزمەتێکی چاکتر و فراوانتر پێشکەش بکات.

---

[1] ابن هاشم، سیرة، ۲۷۷/۲

## نابێت هیچ کارێك بەبێ ڕاوێژ ئەنجام بدرێت

ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: ''ئەوەی ڕاوێژ بکات، بێبەش نابێت لە گەیشتن بە حەقیقەت و ڕاستی''. بۆ ئەوەی تووشی پەشیمانی نەبین، پێویستە پێش ئەوەی بڕیارێك بدەین ڕاوێژ بە کەسانی دیکە بکەین.

مرۆڤی باوەڕدار دەبێت هەردەم گوێ بە ڕاوێژ بدات، چ لە کاروبارە کەسیەکانی خۆیدا بێت و چ لەو کاروبارە هاوبەشانەشدا بێت کە لەگەڵ هاوکارانیدا پێکەوە ڕای دەپەڕێنن.

بێگومان ڕادەی تەندروستی ئەو بڕیارەی کە تاکە ژیرییەك بەشدارە تێیدا هاوتا نییە لەگەڵ ئەو بڕیارەی کە دە ژیریی لەسەری ڕێك دەکەون، کەواتە نابێت هیچ کارێك بەبێ ڕاوێژ ئەنجام بدرێت. ئەوانەی بەبێ ڕاوێژ کاردەکەن و بڕیار دەدەن مانای وایە بە پێی بۆچوونی تاکە کەسیی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن، بێگومان هەڵەکردنی ئەمجۆرە کەسانە زۆر ئاسانترە. بەپێی بنەما سەرەکییەکانی ئاین، باوەڕداری ڕاستەقینە لەجیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە بۆ ڕا و بۆچوونە کەسییە تایبەتییەکانی خۆی دەربارەی بابەتێك، ڕەچاوی ڕای کۆمەڵانێکی تایبەت و شعوری دەستە جەمعی دەکات.

ڕاوێژ کردنی پێغەمبەری سەرورمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) بە هاوەڵان لەپاش هاتنی سرووش، زیاد لەوەی تەنها بۆ وەرگرتنی بیروبۆچوونی هاوەڵان بێت، گرنگیدانی سەروەرمان بووە بە شعووری دەستەجەمعی. پێغەمبەری پێشەوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) هەندێ جار بیروبۆچوونی یەکە یەکەی خاوەن ڕاکانی وەردەگرت و هەندێ جاریش خاوەن ڕاکانی کۆ دەکردەوە و بەمە زەمینەیەکی تەندروستی دەڕەخساند بۆ بەرجەستەکردنی پلان و پڕۆژەکانی و کۆمەڵگەی دەکردە خاوەنی ئەم بۆچوون و پڕۆژانە.

ئەوەش ڕاستیەکە کە هەموو ئەو کەسانەی بە بۆچوونەکانیان بەشدارن لە ڕاوێژێکدا، بەرپرسیارن بەرامبەر ئەو بڕیارەی کە لە کۆتاییدا دێتە ئەنجام. خاوەن بۆچوونان، لەبەرئەوەی خۆیان بە بەرپرس دەزانن لە هەمبەر ئەو بابەتەی کە ڕاوێژی لەسەر دەکەن، هەموو تواناى خۆیان دەخەنە گەڕ لەو کارەدا بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی دروست، ئەگەری ئەو بڕیارەی بە ڕاوێژ دەردەچێت ئەنجامێکی ئەرێنی بدات بەدەستەوە. لەبەر ئەوەی هەستی بەرپرسیارێتی بناغەی کەسایەتی تاکەکانە بۆیە ئەم پرەنسیپی ڕاوێژکردنەش تایبەتمەندییەکی پەروەردەکاری هەیە.

سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) زۆر جوان هێز و کاریگەری ڕاوێژی خستووەتەڕوو، تا هەمووان هەستی خاوەندارێتییان بۆ ئەم بابەتانە تێدا جێگیر بێت. ئاشکرایە وەك چۆن مرۆڤ شەرەفمەند دەبێت و شانازی دەکات کاتێك ڕاو بۆچوونی وەردەگیرێت، بەهەمان شێوەش مرۆڤ زیاتر خۆی دەکاتە خاوەنی ئەو بابەتانە کە بۆچوونی تێدا وەرگیراوە. ئەمەش کاریگەری ئەرێنی لەسەر کارەکە دروست دەکات.

## ڕاوێژی حەزرەتی سولەیمان لەگەڵ پەپوسلێمانە

حەزرەتی سولەیمان (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) پێغەمبەرێکی گەورەیە کە هەم دەسەڵاتی دونیایی و هەم سەرفرازی دواڕۆژیشی پێبەخشراوە. ڕۆژێکیان فریشتەیەك بە پەرداخێك ئاوەوە دێتە لای حەزرەت و دەڵێت:

"ئەی پاشای مرۆڤ و زیندەوەران، ئەم ئاوەی دەستم پێی دەوترێت ئاوی حەیات. ئەگەر ئەم ئاوە بخۆیتەوە ئەوا تەمەن درێژ دەبیت و ژیانت بۆ چەندین چەرخ و سەدە بەردەوام دەبێت. چەندەها هۆز و تیرە دێن و دەمرن و شوێنیان بە تازەکان دەگیرێتەوە بەڵام تۆ لەسەردەمی هەموو ئەمانەدا هەر لەسەر تەختی پادشاییەکەت

دەمێنیتەوە و هەر پایەدار دەبیت. ئەمەش تەنها بەوە دەبێت کە لەم ئاوە بخۆیتەوە. "

حەزرەتی سولەیمان (عَلَيهِالسَّلَام) دەست دەکات بە بیرکردنەوە و لە پاشاندا دەڵێت:

"من باڵندەکان کۆ دەکەمەوە و ڕاوێژێکیان پێ دەکەم لەسەر ئەو بابەتەی کە پێت ڕاگەیاندم، پاشان تۆ لە بڕیارەکەم ئاگاداردەکەمەوە."

ئیدی ڕۆژێك لە بیابانێکدا و بە ئامادەبوونی هەموو باڵندەکان باسەکە بۆ هەمووان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "فریشتەیەك ئاوی حەیاتی بۆ هێنام ئەگەر بیخۆمەوە، بۆ ماوەی چەندەها سەدە تەمەنم درێژ دەبێت و چەندەها چەرخ دەسەڵاتەکەم بەردەوام دەبێت. ئێوە دەڵێن چی؟ لەو ئاوە بخۆمەوە یان نا؟"، هەموو زۆر بە خۆشحاڵییەوە وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن: "بەڵێ گەورەم، لێی بخۆنەوە، تاکو چەندەها سەدە بژین."

لەو کاتەدا پەپوسلێمانە لەوێ نەبوو. لەدەمی تەواو بوونی ڕاوێژ و بڵاوبوونەوەدا، خۆی خزاندە نێو ئاپۆرای باڵندەکان. کاتێ حەزرەتی سولەیمان زانی ئەو هاتووە، فەرمووی: "بڕوانن برایەکتان لە نێو ڕاوێژەکەدا نەبوو، با ڕای ئەویش وەربگرین. ڕەنگە بۆچوونەکانی ئەو ئاسۆی ڕووانینمان فراوانتر کات."

حەزرەتی سولەیمان بارودۆخەکەی بۆ پەپوسلێمانەش باس کرد. بەڵام ئەم بە پێچەوانەی هاوڕێیانییەوە وەڵامی دایەوە و وتی:

- مەیخۆنەوە گەورەم، لەو ئاوی حەیاتە مەخۆنەوە.

- بۆچی نەیخۆمەوە؟ دەتوانی هۆکارەکەیم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟.

- هۆکارەکەی چی بێت گەورەم، ئەگەر جەنابتان لەو ئاوە بخۆنەوە، تەمەنتان زۆر درێژ دەبێت و چەندەها سەدە دەژین، بەڵام دۆست و کەسوکار و هاودەمانی ئێوە دەمرن و کۆچ دەکەن لەم ژینە. ئێوەش ئازاری نەمانی هەموویان دەچێژن

و خەمی جوداییشیان دڵتەنگتان دەکات. پاشان دیسان خزم و کەس و دۆستتان بۆ پەیدا دەبێتەوە و ئەوانیش پاش ماوەیەك کۆچی دوایی دەکەن و ئێوەش بۆ جارێکی دی خەمبار دەبنەوە. ئەمە چ جۆرە ژیانێکە کە هەمیشە خۆشەویست و دۆستەکانتان لەبەرچاوی خۆتان بمرن و ئێوەش بەردەوام هەست بە ئازاری مردن و جودایی ئەوان بکەن؟!!

پاش بیرکردنەوە و تاوتوێکردنی بابەتەکە لە مێشکیدا، حەزرەتی سولەیمان لە باڵندەکان دەپرسێت: "ئێوە دەڵێن چی سەبارەت بە قسەی پەپوسلێمانەی براتان؟"هەموو پێکەوە وەڵامیان دایەوە و وتیان: " ئێمەش هاوڕاین لەگەڵ ئەو. پەپوسلێمانەی برامان لە ئێمە باشتر بیری کردووەتەوە و ژیرانەتر ڕووانیویەتی. ئێمەش پشتگیریی قسەکانی ئەو دەکەین."

حەزرەتی سولەیمان بانگی لەو فریشتەیە کرد کە "ئاوی حەیات" ی بۆ هێنابوو و دوا بڕیاری خۆی پێ ڕاگەیاند: "پاشگەزبوومەوە لە خواردنەوەی ئاوەکە، مردنێکی ئاسایی و لە کاتی خۆیدا باشترە بەلامەوە لە تەمەنێکی درێژ و پڕ جودایی. زۆر بژیت یان کەم، سەرئەنجام هەر مردنە. ئەی فریشتەی بەڕێز ئاوی حەیاتەکەت ببەوە. منیش وەك هەمووان تەمەنێکی سنووردارم دەوێت."

## دیلەکانی بەدر لە ئەنجامی ڕاوێژدا ئازاد کران

جەنگی بەدر لە سەرەتاوە تا کۆتا بە ڕاوێژ بەڕێوەچوو، لە کۆتایی جەنگەکەدا چەند دیلێکی بێباوەڕان کەوتە دەست موسوڵمانان. ئەمەش دۆخێکی نوێ بوو بۆ موسوڵمانان. وەك چۆن یەکەم جەنگی موسوڵمانان بوو، ئاواش یەکەم جار بوو دیل بکەوێتە دەستیان، لەم ڕووەشەوە هیچ نمونەیەکی پێشینەیان نەبوو بۆیە نەیاندەزانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، تا ئەو کاتیش هیچ فەرمانێکی خوایی

بۆ چۆنیەتی مامالەکردن لەگەڵ دیلەکاندا نەهاتبووە خوارەوە. هەروەها نەشیان دەتوانی دیلەکان سەربەست بکەن و وازیان لێبێنن لەبەر نەبوونی یاسایەکی خوایی. چونکە شتێکی ئاشکرا بوو لەگەڵ ناردنەوە و سەربەست کردنی دیلەکاندا سەر لە نوێ بێباوەڕان خۆیان بۆ جەنگێکی دی دژ بە موسوڵمانان ئامادە دەکردەوە. بەمەش ڕێیان بۆ بێباوەڕان خۆش دەکرد بۆ هێرشێکی جەرگبڕی دیکە.

هەر بۆیە سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) هاوەڵانی کۆ کردەوە، پاشان دەستی کرد بە ڕاوێژ لەسەر ئەوەی چی لەگەڵ دیلەکاندا بکرێت. هەموو شتێك یەکەمجار بوو، ئەو هەنگاوانەش کە ئەو کاتە دەنران دەبوونە ڕێچکە بۆ داهاتوو.

ئیدی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) پرسیاری لە هاوەڵان کرد: "ڕا و بۆچوونتان چییە دەربارەی ئەم دیلانە؟ گەرچی ئەوان زۆربەیان تا دوێنێش لە کەسە نزیکەکانتان بوون، بەڵام ئێستا خوای گەورە ئاتاجی بڕیاری ئێوەی کردوون." حەزرەتی ئەبوبەکر هاتە دەنگ و فەرمووی:

"ئەی پێغەمبەری خوا، هەرچەندە خوای گەورە کۆمەکی پێبەخشیت و سەریخستی بەسەر ئەواندا، بەڵام دیسانەوە ئەوان هەر خزم و کەسانی نزیکی تۆن! ئەمانە هەندێکیان کوڕە مام و هەندێکی تریان نەوەی هەمان خێڵ و هەندێکیشیان برامانن، باشترین ڕێگەچارە ئەوەیە کە تۆ فیدیەیان لێ وەربگریت و ئازادیان بکەیت. ئەو فیدیەیەش کە وەردەگیرێت هێز و توانامان دەداتێ بەرامبەر بێباوەڕان. سا بەڵکو بەم هۆیەوە خوای گەورە ڕۆژێك دڵی ئەوان نەرم بکات بەرامبەر بە تۆ و ئەوانیش بێنە لات و ببنە پشتیوانت."

دوای وەرگرتنی بۆچوونی هاودەمە ڕاستگۆکەی، ئەمجارە ڕووی کردە هاوڕێکەی دیکەی و پرسی: "ئەی کوڕی خەطاب تۆ دەڵێی چی دەربارەی ئەم دیلانە؟"

حەزرەتی عومەر فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە کەسانێکن تۆیان لە نیشتیمانی خۆت دەرکردووە و ئازاریان داویت، تۆیان بە درۆزن لەقەڵەم داوە و بە مەبەستی کوشتنی تۆ کەوتوونەتە ڕێ و جەنگاون! من وەك ئەبوبەکر بیر ناکەمەوە؛ ئەگەر لە من دەپرسیت، من دەڵێم فلانە کەسی خزمم بدەرە دەست خۆم با لە ملی بدەم، پاشان هەرکەس لە نزیکەکانی خۆیەوە دەست پێبکات و دیلەکان بکوژرێن هەروەها من دڵم هیچ کات ئاسوودە نابێت گەر ئەم دیلانە بمێننەوە."

لەم کاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هاتە پێشەوە و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەندەی من بزانم لەم دۆڵەدا دار و دەوەن و پوشێکی ئێجگار زۆر هەیە؛ تا ئەوانی تێدان ئاگری تێبەردە!"

کاتێك عەباسی مامی سەروەرمان وتەکانی ئیبن ڕەواحەی بەر گوێ کەوت، بە ناڕەزاییەوە وتی: "خزمایەتیت لە ڕەگەوە بڕی!"

ڕاوێژ بەم شێوەیە درێژەی کێشا، لە کۆتاییدا بۆچوونی هاوەڵان بەگشتی یەکلابووەوە، بۆچوونی سەروەریشمان هەر بەهەمان ئاڕاستە بوو. خۆ هەموو ئەو ئایەتانەش کەتا ئەو کات هاتبوونە خوارەوە هەر باسی لێبووردەیی و دانایی و وتەی شیرینیان دەکرد لە بانگەوازدا. جا چونکە ڕۆحی سەروەرمان ئاوێتە ببوو لەگەڵ قورئاندا بۆیە لێبوردەیی و لێخۆشبوون ببووە تایبەتمەندییەکی جودانەبووەوەی کەسایەتی سەروەرمان. ئەوەبوو ئەویش ڕای خۆی خستە پاڵ ڕای گشتی هاوەڵان و لەگەڵ ئازادکردنی دیلەکان بوو لە بەرامبەر پێدانی فیدیەدا.

دیسان لەمەشدا پەیڕەوێکی ئاسانکارییان پیادە کرد، ئەویش ئەوە بوو ئەوانەی توانای پێدانی ئەو بڕە دیاریکراوەی فیدیەیان نەبوو، بەچاوی بەزەییەوە لێیان دەڕوانرا و تا دەکرا بڕی فیدیەکەیان بۆ کەم دەکرایەوە. جا لەناو ئەمانەشدا کەسانێك هەبوون کە هەژار بوون و هیچ شتێکیان نەبوو؛ بەڵام دڵ داخوازی ئازادکردنی ئەمانیش

بوو، بۆیە هەر زوو ڕێگەچارەیەکیش بۆ ئەمانە دۆزرایەوە. ئەوانەی کە توانای پێدانی ئەو بڕە دیاریکراوەی فیدیەکەیان نییە، دەبێت ١٠ منداڵی باوەڕداران فێری نووسین و خوێندنەوە بکەن و لەبەرامبەردا ئەمانیش ئازاد دەکران.

سەرەڕای ئەمەش کەسانێك مابوون کە نە سەروەت و سامانیان هەبوو و نە خوێندەواریش بوون تا کەسانی تر فێری خوێندەواری بکەن، سەروەرمان ئەمانەیشی لە دۆخێکی ناڕەحەتدا جێ نەهێشت و بەمەرجی ئەوەی کە لەمەودوا دژ بە موسوڵمانان قسە نەکەن و یارمەتی ئەوانەش نەدەن کە دژی موسوڵمانانن، ئازادی کردن.

هەروەها، لە پێش جەنگی ئوحوددا و لە ئەنجامی ڕاوێژی هاوەڵان و سەروەرمان، دوو بۆچوون هاتنە ئاراوە. یەکێکیان بریتی بوو لەوەی کە جەنگەکە لە دەرەوەی مەدینە بکرێت، ئەوی تریان بریتی بوو لەوەی کە تەنها بەرگری لە شارەکە بکرێت، لە کۆتاییدا یەکەم بۆچوون قەبووڵ کرا هەرچەندە سەروەرمان ڕای لەگەڵ بۆچوونی دووەمدا بوو بەڵام پابەندی بڕیاری ڕاوێژکردنەکە بوو و بۆچوونی دووەمی پەسەندکرد. لە جەنگی خەندەقیشدا ڕاوێژ کرا و پێشنیارەکەی سەلمانی فارسی قەبووڵ کرا کە فەرمووی؛ با خەندەق لێبدرێت بە دەوری ئەو شوێنانەی مەدینەدا کە لاواز و کراوەن بەڕووی دەرەوەدا. بێگومان سەروەرمان لە ژیانیدا گرنگی زۆری بە ڕاوێژ داوە و هەر بابەتێك کەوتبێتە دەرەوەی سنوری سرووش، ئەم ڕاستەوخۆ لەگەڵ هاوەڵانیدا ڕاوێژی لەسەر کردووە. ئەم ڕێچکەیەی ئەو بووە هۆی ئەوەی هاوەڵان بە شێوازێکی خێراتر و ئاسانتر ببنە بەشێك لە چارەسەر. ئاشکرایە ئەوەی نەبێتە بەشێك لە چارەسەر دەگونجێت ببێتە بەشێك لە گرفتەکان. پێغەمبەری نازداریش بە شێوازێکی دانایانە و نموونە ئامێز گرنگی بە دید و تێڕوانینی هاوەڵان داوە و دەیکردن بە بەشێك لە چارەسەری گرفتەکان. بەمشێوەیەش وزەی ئەوانی بەکاردەهێنا و زیادی دەکردن.

## گەر خاوەنی ژیریت هاودەمی ژیران بە

مەولانا دەفەرموێت: "گەر خاوەن ژیریت هاودەمی ژیران بە و کارەکانت بە ڕاوێژ لەگەڵیاندا ئەنجام بدە." مەئمون کە یەکێك بووە لە خەلیفەی عەبباسیەکان ئەم وتەیەی کردبووە دروشم بۆ خۆی و لە کاتی ئامۆژگاری کوڕەکەیدا دەیوت: "لەو کاروبارانەتدا کە دوودڵیت لێی، ڕاوێژ بە پیرێکی بە ئەزموون و بە سۆز و هیممەت بەرز بکە. لەبەرئەوەی ئەوان زۆر شتیان بەسەرداهاتووە، بەرزی و نزمیەکانی ژیانیان زۆر دیوە، ئەگەر وتەی ئەوان توند و ڕەقیش بێت تۆ بەرگەی بگرە و پەسەندی بکە. بۆ لیژنەی ڕاوێژ هەرگیز کەسانی ترسنۆك و هەڵپەکار و تەماعکار و درۆزن و خۆپەرست وەرمەگرە."

بەڵێ، ئەوانەی کە لە خۆیان ڕازین هەرگیز بۆچوونی کەسانی دیکەیان بەلاوە پەسەند نیە و بایەخی پێنادەن، پرس و ڕاوێژیش بە کەس ناکەن. هەوڵدەدەن کاروبارەکان بەئاڕاستەی بیر و بۆچوونەکانی خۆیان چارەسەربکەن. ئەمجۆرە هەڵسوکەوتەش زۆربەی کات دەبێتە هۆی هەڵەکردن و لە جیاتی سوود زیان بەرهەم دەێنێت.

دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین کە ڕاوێژ لەڕووی واتاوە بەمانای هەنگوین وەرگرتن لە هەنگ دێت. هەنگوینیش هەمان واتای شیفای هەیە. کەواتە ڕاوێژ دەبێتە شیفا بۆ هەموو دەردەکانی تاك و خێزان و کۆمەڵگە. مێژووش بە هەموو ڕووداوەکانییەوە شایەتحاڵی ئەمەیە.

## ئەوانەی ڕاوێژ بەکەسانی دی دەکەن، لە بلیمەتەکان سەرکەوتووتر دەبن

باشترین هۆکار بۆ ئەوەی بڕیاری هەڵە نەدرێت و هەڵەکان بۆ کەمترین ڕێژە دابەزێنرێت، گەڕانەوەیە بۆ ڕاوێژ لە هەموو بابەتەکاندا. ئەوانەی دەڵێن: "من خۆم بڕیاری خۆم دەدەم و پێویستم بە ڕاوێژی کەس نیە" بەرەو کەندەڵانی خەسارەتمەندی هەنگاو دەنێن. چونکە دوو ژیری لە تەنها ژیرییەك باشترە. ئەو بڕیارانەی کە دەدرێن زۆربەی جار بە شکست کۆتایی دێن ئەگەر لە پلەی باشەوە بەرەو باشتر نەبرێن و تیایاندا بۆچوون و ڕەخنەی کەسانی دیکە بەهەند وەرنەگیرێت. ئەو کەسەی تەنها وابەستەی بۆچوونەکانی خۆیەتی و ڕێز لە بۆچوونی کەسانی دی ناگرێت، ئەگەر خاوەنی ڕەفتارێکی ناوازە بێت و بلیمەتییەکی بێوێنەشی هەبێت، زۆر زیاتر هەڵە لە کاروبارەکانیدا دەکات بەبەراورد لەگەڵ کەسێك کە هەموو کارەکانی بە ڕاوێژ ئەنجام دەدات.

ژیرترین مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە کە زۆر ڕێز لە ڕاوێژ دەگرێت و لە هەموو کەس زیاتر سوود لە بۆچوونی کەسانی دیکە وەردەگرێت. بەڵام ئەو کاڵفام و ڕۆح پێنەگەیشتووانەی کە تەنها وابەستەی بیر و بۆچوونی خۆیانن و هەوڵدەدەن بۆچوونەکانیان بەسەر کەسانی تریشدا بسەپێنن، هەمیشە کەسانێکی بێزراو و نەخوازراون لە لایەن دەوروبەریانەوە.

کەواتە پێش جێبەجێکردنی هەر کارێك پێویستە ڕاوێژی تەواو ئەنجام بدرێت و هەموو جۆرە پێویستییەکی ڕەچاوبکرێت، بۆئەوەی لە پاشاندا پەنا نەبرێتە بەر چەند ڕێگەیەکی هەڵەی وەك تاوانبارکردنی کەسانی دەوروبەر و ڕەخنەگرتن لە قەدەر، کە ناڕەحەتییەکان دووهێندە دەکەنەوە. گەر پێش ئەنجامدانی هەر کارێك بەباشی بیر لە دەرئەنجامەکانی نەکرێتەوە و لە کەسانی بە ئەزموون پرسیار نەکرێت،

خۆ قوتارکردن لە خەسارەتمەندی و پەشیمانی و دڵتەنگی شتێکی مەحاڵ دەبێت.

چەندین کەس هەن خۆیان بە مرۆڤێکی ئێجگار ژیر لەقەڵەم دەدەن و ڕاوێژ بە کەسانی تر ناکەن و گیرۆدەی کۆمەڵێك سەودای جۆاوجۆرن، ئەوانە لە لایەن ئەو مارە کویرایانەی کە پێشتر ژەهراوی کردوون هەم گەستراون و هەم لەڕاستەڕێ دوورخراونەتەوە. جا خۆزگە هەر بە تەنها خۆشیان لە راستە ڕێ لایان بدایە.[1]

شعوری دەستەجەمعی و ڕاوێژ بۆ هەموو بزاوتێك بنەمایەکی زۆر گرنگە و نابێت پشتگوێ بخرێت. شعوری دەستەجەمعی بەرهەمی ژیریی هاوبەشی ئەو مرۆڤە نموونەییانەیە کە لەجیاتی هەوڵدان بۆ قازانجە کەسییەکان بیر لە سوود گەیاندن بە کۆمەڵگە دەکەنەوە، ئەوانەی ئاوێتە بوون لەگەڵ ئەمڕۆ و سبەینێیی کۆمەڵگەکەیاندا و لێی جودا نابنەوە؛ ئومێد و وەفا و ئیخلاس و دڵسۆزییان کردووەتە کارنامەی ژیانیان، ئەوانەی لەبری ناوبانگ بیر لە خاکێتی دەکەنەوە و هەردەم شەرمەندەن (هەمیشە شەرمەزارن سەبارەت بەو کارانەی دەرفەتی ڕاپەڕاندنیانیان نەبووە) و لە جیاتی بیرکردنەوە لە خۆیان بیر لەکەسانی دی دەکەنەوە.[2]

## ڕاوێژ لەگەڵ کێدا دەکرێت؟

یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگەکان کە پێویستە لە ڕاوێژدا ڕەچاو بکرێت ئەوەیە کە ئایا دەبێت ڕاوێژ لەگەڵ کێدا بکرێت. ئەم تایبەتمەندییە کاریگەریەکی زۆر گرنگی هەیە لەسەر بەخێر کۆتایی هاتنی کارەکانمان. ئەو کەسەی کە ڕاوێژی پێدەکرێت دەبێت مرۆڤێکی ژیر و بەئەزموون بێت، خاوەن فەزیلەت و ئایندار بێت، دڵسۆز و بیرتیژ و خاوەن هزری دروست بێت، بتوانێت لە هەست و دەروونی کەسانی

---

١ محمد فەتحوڵلا گولەن، پێوەر یان تیشکەکانی سەر ڕێ، ٢١٥
٢ محمد فەتحوڵلا گولەن ، هزرە چەکەرەکردووەکان

دی بگات، هەروەها مرۆڤێکی سەرڕاست و متمانەدار بێت. بە پێچەوانەوە ڕاوێژ کردن لەگەڵ کەسێکدا کە ئەقڵی بە هیچ شتێك نەشکێت و لە ڕووی ڕەوشتەوە کەمتەرخەم بێت و لوت بەرز بێت، کارێکی نابەجێ و بێسوودە.

نابێت شتێکی نامۆ بێت و بەلامانەوە سەیر بێت گەر کەسانێکی زانا و بیر دروست، کە هەردەم لە بۆچوونەکانیاندا پێکاویانە، پەنا بەرنە بەر ڕاوێژ لەکاتی ڕاپەڕاندنی کارەکانیاندا. لەبەرئەوەی ئەم کەسانە بەو هۆیەوە بۆچوونەکانی خۆیان لە بێژنگ دەدەن و زیرەکی و تێگەیشتنی خۆیان تاقی دەکەنەوە. بەمشێوەیە بیر و بۆچوونەکانیان بە زیندوویی ڕادەگرن. لەهەر بابەتێکدا ڕاوێژ پێویست بێت، دەکرێت بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە بابەتەکە چارەسەر بکرێت:

یەکەمیان، لەگەڵ چەند کەسێکدا بە جیاجیا ڕاوێژ بکرێت، بۆچوونەکانیان وەربگیرێت، بیرۆکەکان بە گشتی لە چیدا یەکیان گرتەوە، ئەو ڕایەیان هەڵببژێردرێت.

دووەمیان، چەند کەسێك کۆ دەکرێنەوە و ڕا و بۆچوونیان وەردەگیرێت، هەرکەس بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت، پاشان هەریەك لە ئەمان لە بۆچوونەکانی دی ورد دەبێتەوە و لێکدانەوەی بۆ دەکات، دواتر لەسەر باشترینیان ڕێکدەکەون. بەم شێوەیە دەگەنە بڕیارێکی دروست.

## بۆچی ڕاوێژ لەو بڕیارانەدا زۆر پێویستە کە پەیوەندیان بە کۆمەڵێکەوە هەیە؟

زاناکانی تەفسیر بەپێی ئەو ئاماژانەی کە لە قورئان و سووننەتەوە وەریانگرتووە وەڵامی ئەم پرسیارەمان بە سێ خاڵ بۆ دەخەنەڕوو:

یەکەم: ڕاوێژ پێویستە، چونکە گەر بابەتێك پەیوەندی بە دوو کەس یان زیاتر، یاخود پەیوەندی بە کۆمەڵ یان کۆمەڵگەیەکەوە هەبێت و، تەنها کەسێك

بەبیری خۆی بڕیاری تێدا بدات ئەوا ناحەقی بەرامبەر ئەوانی دی کردووە. هەروەها دروستیی ئەو بڕیارەی کە تاکە کەسێك بەشدارە تێیدا هەمیشە جێی پرسیارە!

دووەم: ئەگەر لەو بڕیارانەدا کە پەیوەندی بە کۆمەڵێکەوە هەیە کەسێك ویستی بەتەنها بڕیاربدات، ئەوا ئەو کەسە یان بیر لە بەرژەوەندی خۆی دەکاتەوە یاخود خۆی لە کەسانی دی بە گەورەتر دەبینێت. لەکاتێکدا هیچکام لەم دوو بارە ڕاست نین و ئەمەش دەرئەنجامەکەی هەڵەی کوشندە دەبێت بۆ هەمووان.

سێیەم: بڕیاردان لەسەر ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندی بە دوو کەس یاخود زیاترەوە هەیە بەرپرسیارێتیەکی گەورەیە. ئەو کەسەی باوەڕی بە لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە، دەبێت لە بەتەنها هەڵگرتنی ئەم بەرپرسیارێتیە هەڵبێت.

ئەوەتا، هاوەڵە بەرێزەکانیش (ڕەزای خوایان لێبێت) بەوێنەی سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) هەردەم پەنایان بردووەتە بەر ڕاوێژ لە کاتی ئەنجامدانی کاروبارەکانیاندا. بۆ نموونە حەزرەتی عومەر، هەر کە دەبێتە خەلیفەی موسوڵمانان یەکسەر دەستەی ڕاوێژ لەسەر ئاستی وڵات پێك دێنێت و، ئەو کەسانە وەك ئەندامی دەستەی ڕاوێژ دادەنێت کە ڕێز لە دید و بۆچوونی کەسانی دی دەگرن. ئەندامانی هەمیشەیی ئەو دەستەیەی کە پێکی هێنابوو لە کۆچکەران و پشتیوانان، بریتی بوون لە :حەزرەتی (عوسمان، علی، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف، موعازی کوڕی جەبەل، زەیدی کوڕی سابت و ئوبەی کوڕی کەعب) (خوا لێیان ڕازی بێت). دەستەکە لە ڕۆژانی دیاریکراودا کۆ دەبوونەوە و لێکدانەوەی وردیان بۆ ئەو بابەتانە دەکرد کە پەیوەندی بە وڵات و میللەتەوە هەبووە، پاشان بڕیاریان لەسەر بابەتەکان دەدا. لەم دەستەیەدا هەموو کەسێك بەوپەڕی ئازادیی و بەشێوەیەکی کراوە بیر و بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕی. هەر حەزرەتی عومەر بوو کە دەیفەرموو: "بەڕێوەبردنی وڵات بەبێ ڕاوێژ نابێت"

حەزرەتی عوسمان و حەزرەتی عەلیش زۆر گرنگیان بە ڕاوێژ دەدا، بابەتە گرنگەکانیان بە ڕاوێژ چارەسەردەکرد. دەستەی ڕاوێژ بەوپەڕی سەربەستیەوە بۆچوونەکانی خۆیان دەربڕی. پاش ئەوەی هەریەکەیان بۆچوونی خۆی نیشان دەدا، ئینجا بەپێی ڕای زۆرینە بڕیار دەدرا. لە بابەتە گشتییەکاندا بڕیاری ئەم دەستەیە یەکلاکەرەوە بوو.

## چەند پێوەرێکی گرنگ سەبارەت بە ڕاوێژ

ئەو بۆچوونانەی دەری دەبڕین، ئەگەر پەسەندکرا ئەوا خۆشحاڵ دەبین، خۆ ئەگەر پەسەند نەکرا ئەوا دەڵێین: ”واتای ئەوەیە کاتی نەبووە“ و چاوەڕێ دەکەین، توخنی هیچ جۆرە مشتومڕو دەمەقاڵێیەك ناکەوینەوە.

هەندێ جار دەگونجێت کاردانەوە و ڕەتکردنەوە هەبێت بەرامبەر بیرۆکەیەکی باش کە لەلایەن کەسێکی دیاریکراوەوە پێشکەش کراوە. لە وەها بارێکدا باشتر وایە بوار بدرێ بە کەسانی دی بۆ ئەوەی ئەو پێشنیارە پێشکەش بکەن. چونکە گرنگ پەسەند بوونی پێشنیارەکەیە.

دەبێت لە دەستەی ڕاوێژدا هەموو کەسێك بیر و ڕای خۆی بە شێوەیەکی جوان پێشنیار بکات، گەر پەسەندیش نەکرا ئەوا نابێت بڕەنجێت.

جگە لەمەش، ئەگەر ئەو بڕیارانەی لە ڕاوێژدا دەدرێن ڕوون نەبن یاخود وا دەربکەون کە دوورن لە ژیرییەوە ئەوا دەبێت یەکسەر لەوێدا ئاماژەی پێ بدرێت. لە پاش تەواوبوونی ڕاوێژ نابێت بەهیچ جۆرێك قسە لەسەر بڕیارەکان بکرێت. بنەمایەکی گرنگی ڕاوێژ ئەوەیە کە هەم ئەوانەی ئامادەییان نەبووە لە ڕاوێژدا و هەم ئەوانەش کە پێشنیاری پێچەوانەی بڕیارەکەیان هەبووە لەکاتی ڕاوێژدا، دەبێت پەیوەست بن بە کۆتا بڕیارەوە. ئەو کەس و لایەنانەش کە ڕایان بە پێچەوانەی

بڕیارەکەوە بووە، مادەم متمانەیان بەوە هەیە کە دەستەی ڕاوێژ بڕیاری ڕاست دەدات، دەبێت بەبێ زویر بوون پەیڕەوی کۆتا بڕیاری دەستەی ڕاوێژ بکەن.[1]

---

١ محمد فەتحوڵڵا گولەن ، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر، ٨٩/١

# ٦- برایەتی

"تکا لە براکانم دەکەم با ئەو وتە ناشیرین و خراپانەی کە بەهۆی ناڕەحەتی و بەرتەسکیی ڕۆحیی، هەستیاری، یاخود گوێڕایەڵی کردنی دەسیسەکانی شەیتان و نەفسی بێناگاییانەوە لەزاری هاوڕێکانیانەوە دەردەچن، لە یەکدی زویریان نەکات و نەڵێن "ئابڕووم لەکەدارکراوە"، من ئەو وشە خراپانە ئاڕاستەی خۆم دەکەم. نەکەن بهێڵن دەمارتان بگرێ، بە هەزارەها ئابڕووم هەبێت دەیکەم بە قوربانی خۆشەویستی و گەرموگوڕی و بەدەم یەکەوەبوونی نێوان براکانم."[١]

## برایەتی واتای چییە؟

کاتێك کە وشەی برا بەکار دەهێنرێت ئەوەی یەکەمجار دێتە بیرمان ئەوەیە کە (کەسانێکن لە هەمان دایك و باوك لە دایك بووبن). جگە لەم برایەتییە پشتییە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا (برای ئاین) یش بوونی هەیە، پەروەردگارمان لە قورئانی کەریمدا ئەم ڕاستییەمان بەم شێوەیە بۆ باس دەکات"بێگومان تەنها باوەڕداران بران کەواتە گەر لە نێوان دوو براتاندا (ئاژاوە هەبوو) ئاشتەوایی بکەن و لەخوا بترسن تا ڕەحمتان پێ بکات. "(الحجرات، ١٠) ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە ئیمانداران

---

[١] سەعیدی نورسی

له هەر شوێنێکی جیهاندابن ئەوا پەیوەندیی ئیمان پەیوەستی یەکدیان دەکات و ڕایدەگەیەنێت کە هەموو ئیماندارانی جیهان بران.

هەر ئیماندارێك کە باوەڕی بە خوای گەورە و پێغەمبەری سەرورمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) و قورئانی کەریم هەبێت و ڕوو لە هەمان قیبلەی ئیمانداران بکات و نوێژ و نزا بکات، لەگەڵ ئیماندارانی دیدا برایە. هەمووان دۆست و هاوڕێ و هاوسەفەر و هاو سۆزی یەکترن. ئاینی ئیسلام برایەتی ئیمانی پێش برایەتی خێزانی و هاوخوێنی و هاونیشتیمانی خستووە و ئەم برایەتییەشی لە پلەی یەکەمدا داناوە. بەمەش بە واتایەکی گشتی دەوترێ برایەتی ئاینی. برایەتیەکی لەم جۆرە هەموو دڵە پڕ لەباوەڕەکان بە پەیوەندییەکی توند و تۆڵەوە بەستووەتەوە کە لە ئیمان و پارێزکارییەوە سەرچاوەی گرتووە.

قورئانی پیرۆز ئەم حاڵەتە بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە: "هەوڵبدەن هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن، یادی ناز و نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، چونکە کاتی خۆی دوژمنی یەکدی بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلام)ەوە پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر. هەروەها ئەو کاتە ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستابوون و خەریك بوو بکەونە ناوی، بەڵام خوا بە ڕەحم و میهرەبانی خۆی لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن. "(آل عمران، ١٠٣)

خوای گەورە لەم ئایەتەدا دروستبوونی ئەو پەیوەندییە برایەتییە جوانەمان یاد دەخاتەوە کە لەنێوان ئەوس و خەزرەجدا بەدیهێنابوو لەپاش موسوڵمان بوونیان لە کاتێکدا لە سەردەمی جاهلیدا لە دوژمنایەتی یەکدیدا گەیشتبوونە لووتکە، بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان دووژمنایەتیی ئەوس و خەزرەج لە دەمی موسوڵمانبونیاندا

١٢٠ساڵی تێپەڕاندبوو، بەهۆی موسوڵمان بوونیانەوە بوونە برای یەکتر و کۆتاییان بە شەڕی نێوانیان هێنا.

ئەو برایەتیەی کە قورئان ئاماژەی پێ کردووە داخوازی ئەوەیە کە لە خۆشی و ناخۆشیدا پشتی یەك بگرین و هەروەها متمانەو بەزەیی و گیانی هاوکاری و پشت بەستن بە یەکدی لە خۆماندا ڕەنگ پێبدەینەوە. هەروەها یەکێك لەو هۆکارانەی وا دەکات ئیمانداران چێژی ئیمان بکەن ئەوەیە لەبەر خاتری خوای گەورە یەکدیان خۆشبوێت. ئەو کەسانەی کە لەدونیادا لەبەر خاتری خوای گەورە یەکتریان خۆشدەوێت، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدا فێنکیان دەبێتەوە و دەحەسێنەوە لە کاتێکدا هیچ سێبەرێکی تر بوونی نی یە. ئەوانەی کە لەبەر خاتری خوای گەورە کۆ دەبنەوە و لە حاڵ و گوزەرانی یەکدی دەپرسن و سەردانی یەکتری دەکەن و یارمەتی یەکدی دەدەن، ئەمانە شایەنی ئەوەن کە خوای گەورە خۆشی بوێن.[1]

پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریمان دەکات کە هەمیشە یەکگرتووبین و بە توندی ئاگادارمان دەکاتەوە کە دوور بکەوینەوە لە جودایی و پەرتەوازەیی، هەروەها لە فەرموودەیەکیشدا ئاماژە بەوە دەکات و دەفەرموێ: دەستی هاوکاری خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، بەزەیی خوا بەسەر کۆمەڵدا دەڕژێت و لەپەرتەوازەییشدا سزای خوایی هەیە.[2]

## برایەتیەکی ڕاستەقینە داخوازی چییە؟

لە نێوان برایانی ئیمانداردا کۆمەڵێك بەرپرسیارێتی و ماف هەیە کە دەبێت باش ئاگاداری بن. ئیماندار برای ئیماندارە بەڵکو برای ڕاستەقینەیەتی، چاویەتی،

---

١ بخاري، إيمان،٩،١٤،ادب،٤٢؛احمد بن حنبل، مسند، ٢٣٣،٢٤٧؛ترمذي، إيمان،١٠
٢ ترمذي، فتن، ٧

ڕێنیشاندەریەتی. هەرگیز سوکایەتی پێناکات، ستەمی لێناکات، نایخەڵەتێنێت، چاویش نابڕێتە گیان و ماڵ و نامووسی بەڵکو هەر یەکە لەمانە وەکو گیان و ماڵ و نامووسی خۆی تەماشا دەکات و دەیپارێزێت. برایەتیی ئیمانی گرنگترین هۆکارە بۆ نەهێشتنی هەموو ئەو ناکۆکی و دووبەرەکیانەی کە لە نێوان ئیمانداراندا هەیە. ڕق و کینەی ئیماندار بەرامبەر ئیماندار وەك بڵێی نیشانەیەکی دووڕوویيە. ئیماندار لە ئیماندار زویر نابێت. ئیماندار دەبێت ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ برا ئیماندارەکەشی پێی خۆش بێت، ئەگەر وا نەبێت و ئیرەیی پێببات و بە هۆی چەند هۆکارێکی بێ ئەرزشەوە دوژمنایەتی لەگەڵدا بکات، ئەوە نیشانی دەدات کە ئیمانەکەی دڵی لەقە و ڕاستەقینە نیە.

پێغەمبەری نازدارمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە فەرموودەیەکدا سەبارەت بە پەیوەندی و برایەتی نێوان ئیمانداران دەفەرموێت: "ئیمانداران وەکو خشتی بینایەك وەهان کە هەموو پاڵیان بەیەکەوە داوە و یەکدی تەواو دەکەن" . بەپێچەوانەشەوە ئەگەر ئیمانداران دەست لەیەکبوونی نێوانیان بەربدەن، ئەو هێزەی بەهۆی یەکبوونیانەوە دەستیانکەوتووە لە دەستی دەدەن و ئەمەش ڕێگە بۆ لاوازبونیان خۆش دەکات. لە دەرەنجامیشدا بەهۆی نەبوونی کۆمەڵگایەك کە چاکەخوازیی باڵا دەست بخات و خراپەکاری نەهێڵێت،خراپە و ئاشوبێکی ترسناك بەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوە.[1]

کاتێك (جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب) لە غەزای موئتەدا شەهیدکرا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) زۆر پێی ناڕەحەت بوو ڕەنگە ئەسرینیشی ڕشتبێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆڕاگرانە ڕووبەڕووی ئەم هەواڵە دڵتەزێنە بوویەوە و ئەم وتانە لە زاری موبارەکییەوە دەرچوون: "ئیماندار پەرۆشی براکەیەتی."سەروەرمان زۆر پەرۆش و خەمخۆری هەموو کەسێك بوو، مرۆڤێکی ئاوازەی وەهابوو کە بەدەم پەژارە و دەردی هەموو کەسێکەوە دەڕۆیشت. کاتێك

١ بخاري، صلاة، ٨٨؛ مسلم، البر، ٦٥، ترمذي، البر، ١٨؛ نسائي،زكاة،٦٧

سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلَ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) هەواڵی شەهید بوونی حەزرەتی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبی بیست زۆر خەمبار بوو، هۆکاری خەمباربوونەکەی بۆ هاوەڵانی دەوری ڕوون کردەوە، وەك بڵێی دەیویست ئەو خەملێخواردنەی کە پێویستە لە مرۆڤێکی نموونەی ئیمانداردا هەبێت ڕوون بکاتەوە و لە ئەنجامیشدا ڕووی ئەو وتانەی لە هەموو ئومەتەکەی بوو.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بە هەستیاریی هاوەڵان بکەین لە جێ پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری سەروەرمان و لە دڵسۆزی و خەمخۆری هاوەڵان بۆ یەکدی بدوێین، ئیسلام لەم سەر زەویەدا لەلایەن هاوەڵە بەڕێزەکانەوە بە جوانترین شێوە خراوەتە نێو ژیانی کرداریەوە. ئەو بزوێنەرانەی کە وایلێکردبوون ببنە هاوەڵ، لە ڕاستیدا هەر لەو ناوەدا دیاربوو کە پێیان بەخشرا. ئەو مرۆڤانە بوون کە بووبوونە دۆستی گیانی بە گیانی یەکدی و بە جوانترین شێواز برایەتییان بەرجەستە دەکرد، ئەوان لە سەرکەشیی نەفس خۆیان بەدووردەگرت و باوەڕیان بە توانای سەرسوڕهێنەری گوێڕایەڵیکردن لە بەرامبەر برا گەورەکانیان هەبوو، گەلێ پەرۆشی یەکتر بوون و بەم جۆرە مێژوویەکیان تۆمارکرد.

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کۆمەڵگەیەك بەرچاو ناکەوێت کە بەهێندەی ئەوان خۆشەویستیان لە نێواندا بێت و برایەتی ئیمانی پەیوەستی یەکدی کردبێتن، بەو شێوەیە داستانێکی بێوێنەیان تۆمارکرد. پاڵەوانێتی ئەم برا ئیمانیانە ئەوندە زۆرە کە لە چەندەها بەرگ کتێبدا تەواو نابێت، ئەوان کەسانێك بوون کە تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا ئەو قومە ئاوەی کە بۆیان دەهێنان نەیان دەخواردەوە و دەیاندا بە براکەیان بەو هیوایەی ئەو گیان بچێتەوە بەبەریدا، قارەمانێتییەکەیان هێندە مەزن بوو بە جۆرێك ئەوەی لە دارای دونیا شکیان دەبرد، نیوەیان بەو برایانەیان بەخشیبوو کە لە پێناو ئاینەکەیاندا کۆچیانکردبوو بۆ شاری ئەمان.

پێغەمبەری نازدارمان (عَلَيهِ أَلفُ صَلاةٍ وَسَلَام) لە فەرموودەیەکدا پێویستیەکانی برایەتیمان بەم شێوەیە بۆ ڕوون دەکاتەوە. موسوڵمان برای موسوڵمانە، کاتێك موسوڵمانێك سەلام لە براکەی دەکات ئەوەی سەلامی لێ کراوە بە هەمان شێوە یان جوانتر وەڵامی براکەی دەداتەوە، کاتێك داوای ئامۆژگاری لێکرد ئامۆژگاری دەکات، کاتێك لەبەرامبەر دوژمندا داوای یارمەتی لێکرد یارمەتی دەدات، ئەگەر داوای ڕوونکردنەوەی شتێك یان ڕێنوێنیکردنی لێبکات ئەوا ئاسانکاری بۆ دەکات و ڕێنوێنی دەکات، کاتێك داوای قەرزی لێ دەکات دەیداتێ بەڵام ئەگەر ئەم قەرزە بۆ مەبەستی دژایەتیکردنی موسوڵمان وەربگرێت نایداتێ، مرۆڤی موسوڵمان لە قەرز بەخشیندا بە برای موسوڵمان سینە فراوانە و تەنانەت بەهەشتیش بە قەرز بە براکەی دەدات.[1]

ئیمامی غەزالیش لە ژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی سەروەرماندا لەمەڕ ڕەچاوکردنی ماف و بەرپرسیارێتی نێوان برایان و هاوسۆزان و دۆستان و خۆشەویستانەوە بەرامبەر یەکدی ئەم چەند یاسایەی دارشتووە.

١. پێویستە برایان لەڕووی ماددیەوە هاوکاری یەکتری بکەن و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەرەو هاوکاری یەکدی بڕۆن.

٢. برا بە جەستەش یارمەتی براکەی دەدات

٣. برا لە پاشەملە لەسەر براکەی دەکاتەوە و هەڵە و کەموکورتیەکانی دەپۆشێت.

٤. برا هەوڵدەدات هەڵەو کەموکوڕیی براکەی نەبینێ و لێی دەبورێت.

٥. برا، ئەو کاتەی کە لە ژیاندایە و لە پاش مردنیشی هەمیشە نزای خێر بۆ براکەی دەکات و هەردەم بە خێر یادی دەکاتەوە.

---

١ علي المتقي، كنز الأعمال، ١٥١/١-١٥٢

٦. برا بەرامبەر براکەی بە وەفایەو سەر ڕاست و ڕاستگۆیە لە گەڵیدا.

٧. برا لە بەرامبەر براکەیدا ساردو سڕ مامەڵە ناکات، لە هەموو هەڵسوکەوتێك خۆی بە دووردەگرێت کە ئازاری براکەی بدات، ئەو دەزانێت کە پێویستە لەپێناو ئولفەتدا واز لە کولفەت بهێنێرێت.[1]

## ئیمانداران، وەك ئەندامانی یەك لاشەن

ڕۆژێك ئەندامەکانی جەستە لە نێوان خۆیاندا کۆبوونەوە، تێکڕا سکاڵایان لەوە دەکرد کە ئیشوکاریان هەمووی بۆ خزمەتی گەدەیە، ئەمە لەکاتێکدا بە ڕوکەش گەدە هیچ ناکات و ئەگەر هاریکاری ئەوان نەبێت ئەوە لە پەل و پۆ دەکەویت، هەتا بڵێی تووڕەبوون، لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا ئیدی ئەندامەکان هەموو گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە چیدی داواکاریەکانی گەدە جێبەجێنەکەن، بەڵێ بەمشێوەیە بڕیاردرا ئیدی کەس خۆی بۆ گەدە ماندوو نەکات .

چاو وتی: "من ئیدی هیچ هەڵنابژێرم. دەستەکان وتیان، من هیچ ناگرم، دەم وتی من هیچ خواردنێك وەرناگرم ددانەکان هاواریان کرد و وتیان ئێمە چیدی خواردن ناجووین، قاچەکانیش بڕیاریان دا چیدی لە پێناوی گەدەدا یەك هەنگاویش هەڵنەنێن، هەموو بڕیارەکانیان بەجێهێنا و گەدەییان پشتگوێخست. بەڵام ماوەیەکی زۆر کەم تێپەڕیبوو چاوەکان هەستیان بە تەڵخی کردوو دەستەکان بە لەرزین و ددانەکان کلۆر بوون و دەم ووشکبوویەوە و قاچەکان بێ هێزبوون، ئەوەی کە بۆیان ڕوون بوویەوە ئەوەبوو." ڕاستە گەدە بەبێ ئەوان هیچی پێ نەدەکرا بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانیش بەبێ گەدە نەیان دەتوانی ژیانیان بەڕێوە ببەن."

بەم شێوەیە تێگەیشتن کە دەبێت هەموو ئەو ئەندامانەی کە جەستەیەك پێك دێنن کار بۆ یەکتری بکەن، درکیشیان بەوەکرد کە ئەگەر

---

١ ابو حامد الغزالي، إحياء العلوم دين، ١٧٠/٢

یەکێتییەکی لەو جۆرە پێك نەهێندرێت بەردەوامبوونی ژیانیش مەحاڵ دەبێت، چونکە ئەوان هەموو لەپێناوی یەکدیدا هەوڵیان دەدا و نەبوونی هەر کامێکیشیان یەکسەر کاریگەری بەسەر هەموانەوە جێدەهێشت. وەکو پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئاماژەی پێ دەکات ئیمانداران لە بەرامبەر یەکدیدا ڕێك وەکو ئەندامان و خانەکانی یەك جەستەن.[1]

هەروەك چۆن کاتێك یەکێك لە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ ئازار دەچێژێت، هەموو جەستە هەست بە هەمان ئازار دەکات، هەروەك چۆن بۆ لاچوونی ئازاری ئەندامێکی جەستەی مرۆڤ هەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستە دەکەونە جوڵە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو ئازارە، بەهەمان شێوە لەکاتی ناڕەحەتی ئیمانداریکدا هەموو ئیماندارانی دی بەرپرسیارن لە هەست پێ کردن و هەوڵدان بۆ چارەسەر کردنی ئەو ناڕەحەتییە. دەبێت ئەنجامدانی خراپەیەك بەرامبەر یەك ئیماندار هەموو ئیمانداران بخاتە بزاوتنەوە، بەمشێوە ئیمانداران لە هەموو ڕوویەکەوە هاریکارو هاوکاری یەکترین.

## ئەو ڤایرۆسانە کامانەن کە هەڕەشە لە برایەتی دەکەن

سەروەرمان لە فەرمودەیەکدا ئاماژە بەو مەترسیانە دەکات کە هەڕەشە لە هەستی برایەتی و سۆز و خۆشەویستی نێو ئیمانداران دەکەن و دەفەرموێت:

”وریابن خۆتان لە گومان بە دوور بگرن چونکە گومان لە خراپترینی درۆکان هەژمار دەکرێت، فزولی مەکەن، ململانێ مەکەن، ئیرەیی بە یەکدی مەبەن، لە بەرامبەر یەکتردا ڕق لە سینەتاندا هەڵ مەگرن، پشت لەیەکتر مەکەن، ئەی بەندەکانی خوا! برایەتیتان بپارێزن بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوون. موسوڵمان برای موسوڵمانە و سوکایەتی پێ ناکات، ستەمی لێ

---

١ بخاري، الأدب، ٢٧؛موسلم، البر،٦٦

ناکات، بێبەشی ناکات لە خێروبێرەکانی ژێردەستی، تەنها سووکایەتییەك بەبرا موسوڵمانەکەت بەسە بۆ ئەوەی بکەویتە نێو خراپەیەکی گەورەوە، ماڵ و موڵك و خوێن و ناموسی هەموو موسوڵمانمانێك لە موسوڵمانمان حەرامە." خوای گەورە تەماشای ڕوخساری دەرەوەتان ناکات بەڵکو تەماشای نیەتی دڵەکانتان دەکات، پارێزکاریی (تەقوا) ئالێرەدایە (بە دەستی موبارەکی ئیشارەتی بۆ سەر سنگی کرد)، ئامەمان دەخیلتان بم! لە کڕین و فرۆشتندا زەمی یەکتر مەکەن، نرخ بەسەر نرخی یەکدیدا مەدەن، ئەی بەندەکانی خوا ببنە برای یەکتری، هیچ موسوڵمانمانێك نابێت لە سێ ڕۆژ زیاتر لە برا موسوڵمانمانەکەی دەنگ دابڕێت.[1]

فەرموودەکە سەرنجمان بۆ لای ئەو خاڵانە ڕادەکێشێت کە زیان بە برایەتی نێوان موسوڵمانمانان دەگەیەنن. ئێستاش با یەك یەك باس لە بڕگەکانی نێو فەرموودەکە بکەین.

کاتێك لە هۆکاری ناکۆکیەکان و جەنگە گەورەکان دەکۆڵیتەوە، دەبینیت لەو بۆچوونانەوە سەرچاوەیان گرتووە کە گومانی خراپ بناغەکەی بووە، بەڵام گومانی باش هەمیشە سوودبەخشە، ئەگەر گومانە باشەکە ڕاست دەرچوو ئەوا ئامانجی پێکاوە. ئەگەر واش دەرنەچوو ئەوا هیچی لەدەست نەچووە و توشی غەیبەت نەبووە و ڕێگریش بووە لەبەردەم دروستبوونی شەڕو دەمەقاڵەدا . یەکێکی دی لەوشتانەی کە مرۆڤەکان زۆر پێی بێزار دەبن بریتیە لە سیخوڕی کردن، گوێگرتن لێرەو لەوێ، قسە هێنان و بردن نەخۆشییە، ئەمە بێجگە لەوەی ڕەوشتێکی ناشرینە و هەروەها هۆکارێکی کاریگەریشە بۆ تێکدانی برایەتی نێوان براکان.

لە ڕاستیدا گوێگرتن بۆ نهێنی خەڵکی و سیخوڕی کردن بەسەریانەوە پێشێلکردنی مافی مرۆڤایەتییە. هەم لەچوارچێوەی پلانی تاکە کەسی و دەوڵەتیشدا،

---

١ بخاري، نکاح، ٤٥،ادب،٥٧،٥٨؛مسلم،البر، ٢٨-٣٤

(سیخوڕی کردن) واتا بەدواداچوون بۆ بارودۆخی نهێنی خەڵکی کارێکی قێزەون و نەخۆشییەکی زیانبەخشە . بەهۆی ئەو شەڕانەی کە لە جیهاندا هەیە لە حاڵی حازردا هەوڵەکانی سیخوڕی کردن بەرێژەیەکی زۆر زیاد بووە و هەڕەشە لە ئاسودەیی مرۆڤەکان دەکات.

پێشبڕکێ و ململانێ ئەگەر لە کاری خێرو جواندا بێت و کاولکاری جێنەهێڵێت، کارێکی بە جێیە و قورئانی پیرۆزیش هانی ئەم کارە دەدات ، بەڵام ئەگەر هەندێك هەڵسوکەوتی دوور لە ڕەوشتی بەرز بەدوای خۆیدا بهێنێت، ئەوا هەندێ گوناهی دیکە بە خەیاڵی مرۆڤدا دێنێت کە لەژێر پەردەی پێشبڕکێ و ململانێدا حەشاردراوە.

بەواتایەکی دی ئیرەیی و حەسودی بردن بریتیە لەوەی کە مرۆڤ حەز بکات خەسڵەتێکی جوان کە لە براکەییدا هەیە نەمێنێ و خۆی ئەو خەسڵەتە جوانە بەدەست بهێنێت، یان دەکرێت بگوترێت (حەسوودی ئەو دڵتەنگییەیە کە لای مرۆڤ دروست دەبێت کاتێك دەبینێت ئەو خەسڵەت و بەهرانەی ئەم حەزیان پێدەکات لە خۆیدا نییە و لە کەسێکی تردا هەیە)، کەواتە ئیماندار ناتوانێت ئیرەیی و حەسودی ببات، حەسودی چاکە و پاداشتەکانی مرۆڤ لەناودەبات، هەروەك چۆن ئاگر دارو دەوەن دەسووتێنێت، بەهەمان شێوەش حەسوودی کردەوە و چاکەکانی مرۆڤ دەسووتێنێت ، هەروەها ڕۆحیش دەمرێنێت. لە فەرموودەیەکی تریشدا پێغەمبەری خوا (عَلَیْهِ اَلْصَّلَاةِ وَسَلَام) دەفەرموێت "حەسوودی و ئیمان لە دڵێکدا کۆنابنەوە"[1] ، ئیماندار تەنها دەکرێت لە کاتێکدا خۆزگە بخوازێت کە سیفەتێکی جوان لە براکەیدا ببینێت و ئاوات بخوازێت ئەو خەسڵەتە جوانە لە ئەویشدا هەبێت، ئەگەر ئارەزووی ئەوەی نەکرد ئەو خەسڵەتە جوانە لەبراکەیدا نەمێنێت ئەوە پێی ناوترێ حەسودی، بەڵکو ئەوە ئاوات خواستنە.

---

١ ابو داود، الأدب، ٤٤؛ ابن ماجه، زهد، ٢٢

یەکێکی دی لەو مەترسی و ڤایرۆسانەی کە هەڕەشە لە پێکهێنانی برایەتی نێوان موسوڵمانمانان دەکات بریتیە لە خۆپەرستی و خۆ بەگەورەزانین، ئەو هەڵسوکەوت و وتانەی کە بۆنی خۆپەرستی و خۆبەگەورەزانیان لێدێت هەم بۆ ئەو کەسەی کە خۆپەرستییەکەی لە ناخدایە و هەم بۆ ئەو کۆمەڵەش کە تێیدایە مەترسییەکی زۆر گەورەیە، چونکە ئەوانەی کە خاکی نین و وازیان لە خۆپەرستییەکەیان نەهێناوە، وەکو پارچە سەهۆڵێك وان کە لە دەریای کۆمەڵدا نەتوواونەتەوە، بۆیە چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکرێت کە لە پێکهاتەی ئەو کۆمەڵەدا بۆ ماوەیەکی زۆر بمێننەوە و خزمەت بکەن.

## وا لەوبەرەوە برایەکم دێت!

ڕۆژێکیان چەند قوتابییەك لەگەڵ فەیلەسوفێکدا خەریکی پیاسەی ئێواران دەبن، لەم کاتەدا یەکێك لە قوتابیەکان دەپرسێت:

بەڕێزم پاش کەمێکی تر خۆرئاوا دەبێت، کەی ڕووناکی تەواو دەبێ و تاریکی دەستپێدەکات؟

فەیلەسوفەکەش باڵندەکانی سەر درەختێکی دووریان نیشاندەدات و دەڵێت "ئەوانە چ جۆرە باڵندەیەکن؟."

ئەوانیش دەڵێن: "باڵندەی ئاردیچ."

پاش کەمێك دونیا تۆزێك تاریك دەبێت و فەیلەسووفەکە درەختێکیان نیشان دەدات و دەپرسێت: "ئەوە درەختی چییە؟"

قوتابییەکان بۆ ئەمەیان کەمێك دادەمێنن و پاشان دەڵێن: "داربەڕووە."

پاشان دونیا بە تەواوی تاریك دەبێت؛ فەیلەسووفەکەش پرسیارێکی دیکەیان

لێدەکات و دەڵێت "ئەی ئەو ئاژەڵەی لە دوورەوە دیارە چییە ؟

یەکێ دەڵێ مەڕ، یەکێ دەڵێ مانگا، یەکێ دەڵێ سەگ.

فەیلەسوفەکەش دەڵێ: "کەواتە هەر کاتێك ئێوە بەشوێنێکدا تێدەپەڕین و لەوبەرەوە یەکێك دەهات و ئێوەش بێ ئەوەی بزانن ڕەنگ و ڕووی یاخود جۆری جل و بەرگەکەی چییە و چۆنە، بەڵام توانیتان بڵێن "وا برایەکمان لەوبەرەوە دێت" مانای وایە ئیدی تاریکی تەواو بووە و ڕوناکی سەرهەڵدەدات.

## ئیماندار ناچارە برای ئیمانداری خۆش بوێت

بۆچی؟ ڕەنگە هەموو شتێکی براکەمان بە دڵ نەبێت، ڕەنگە هەڵسوکەوتی هەڵەی هەبێت بەڵام خۆشویستنی ئیماندار فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە، خۆ ئەگەر هاتوو هەڵەشی هەبوو ئەوا نابێت پشتی تێ بکەین، بەڵکو دەبێت خۆمان بە خاوەنی بزانین و ناچارین بەهەر شێوەیەك بێت ئەو لە ئامێز بگرین.

پێغەمبەر (عَلَيهِ ألَفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) فەرمانمان پێ دەکات "ئەی بەندەکانی خوا ببنە برای یەکتر"، بەڵێ ئەمە فەرمانە و فەرمانی کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو فەرمانی سەروەرمان و نێردراوی خوایە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تێڕوانینی ئێمە لەبەرامبەر ئەو هەڵانەی کە دەدرێتە پاڵ موسوڵمانمانانی وڵاتی خۆمان یاخود هی وڵاتانی دیکە هەڵوێستی ئێمە لەمەڕ ئەوان دەخاتە ژێر پرسیارەوە .

بەڵام ئەگەر بەڕاستی براکەمان هەڵەی هەبێت ئەوا پۆشینی ئەو هەڵانە بۆی بەناوی ئەوەی کە ئیماندارە واتای ئەوەیە چارەسەری هەڵەیەك بە هەڵەیەکی دی کراوە، بەڵام لەبەرامبەریشدا ئەگەر بەهۆی ئەو هەڵانەوە کە ئەنجامی داون ئیماندار بە بێباوەڕ لە قەڵەمبدرێت و لەبەرامبەریدا کۆمەڵە وتەیەك بەکاربهێنرێت کە زیان بە خودی ئیمان و ئیسلام بگەیەنن و بکەوینە داوی ئەوانەی کە لەدژی ئیسلامدا لە

هەوڵ و تەقەلادان، ئەوا ئەو کارە خۆی لە خۆیدا نەبینینی جوانییەکانی ئیسلامە و کوێربوونە لە ئاست بینینی ڕاستییەکان.

ئیمان برایەتیەکی وەها بنیات دەنێت کە بەهێزترە لەو برایەتییەی لە ڕێگەی دایك و باوکەوە دروست دەبێت. ڕەنگە هەندێك جار برا متمانەی بە برای خۆی نەبێت، بەڵام برایەتی ئیمانی لە هەموو ڕوویەکەوە دڵنیایی و پارێزراوی فەراهەم دەکات و متمانەیەکی بێ شومار لە نێوان باوەڕداران بنیات دەنێت. لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە ئەم ڕاستیە بەم جۆرە دەچەسپێنێت "بێ گومان ئیمانداران برای یەکترین" (حجرات، ١٠). بەڵێ ئیمانی ڕاستەقینە هۆکاری دڵنیاییە لە ژیاندا، بە ئیمانی ڕاستەقینە هەموو مرۆڤەکان لە دڵنیاییدا دەژین و ژیانیان پارێزراو دەبێت. چونکە ماڵ و ناموس و خوێنی موسوڵمانمانان لە موسوڵمانمان حەرامە و لە ژێر پاراستندایە.

دەشێت مەرجەکانی برایەتی لەبەر ڕۆشنایی فەرمودە پیرۆزەکەی پێشتردا کە ڤایرۆسە مەترسیدارەکانی سەر برایەتی دەستنیشانکردبوو، بەم جۆرە ڕوونبکەینەوە:

برا نابێت پشت لە برای هەڵبکات، خیانەت یان زوڵمی لێبکات. نابێت لە خێروبێرەکانی ژێردەستی مەحرومی بکات، یان هەستی بریندار بکات، یاخود سووکایەتی پێبکات و بەکەمی بزانێت.

چونکە خراپترین شت ڕووبەڕووی موسوڵمانان ببێتەوە ئەوەیە بە کەم لە برا موسوڵمانەکەی بڕوانێت، بەڵێ ئیمانی ڕاستەقینە بیمەی ژیانە. بە ئیمانی ڕاستەقینە هەموو خاوەن ژیانەکان بیمە دەکرێن. چونکە ماڵ و نامووس و خوێنی موسوڵمان لە موسوڵمان حەرامە و لە دەستی پارێزراوە. ''خوای گەورە تەماشای ڕوخساری دەرەوەتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵتان دەکات لە ڕیوایەتێکی

دیکەدا هاتووە"تەماشای کردەوەکانتان دەکات ."[١٠٤] مرۆڤ لەدەمی مامەڵەدا دەردەکەوێت. کەواتە ئەوانەی هەڵگری ئەو سیفەتانە بوون کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا ئیدی ئەوە ئیمانی ڕاستەقینەیان دەستکەوتووە، ئەگەر هاتوو ئیمانداران یەکتریان خۆش نەوێت، هەمیشە لە دژی یەکتری بدوێن و حەسودی بە یەکدی ببەن و یەکتریان پێ قەبووڵ نەکرێت و دەهۆڵ بۆ هەڵەکانی یەکدی لێبدەن و گومانی خراپ بە یەك بەرن و سینەیان بەرامبەر یەکدی فراوان نەبێت و ئەو چاکانەی دەیکەن تەنها ڕووکەش بێت و دانەبەزێتە قوڵاییەکانی دڵ، ئەوە مانای وایە ئیمان بەتەواوەتی لە دڵیاندا جێگیرنەبووە. لەبەرئەوە بێگومان دەبێت ئەو ئایەتە پیرۆزەیان وەبیر بهێنرێتەوە کە دەفەرموێت "ئەی ئیمانداران! (جارێکی تر) ئیمان بە خواو پێغەمبەری خوا بهێننەوە" (النساء، ١٣٦).

پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دەفەرموێت (نابێت موسوڵمان زیاد لە سێ ڕۆژ قسە لەگەڵ برا موسوڵمانەکەی نەکات)، ئەم فەرمودە جوانە کە لێوان لێوە لە ئامۆژگاریی لە هەموو وێستگەیەکی ژیاندا ڕێنیشاندەرمانە هەروەك بڵێی بریتیە لە نەخشە ڕێگای ژیانی ئیماندار، نەخشەکان هۆکارێکی زۆر گرنگن بۆ گەیاندنی ئێمە بەو ئامانجەی کە دەمانەوێت پێی بگەین، ئامۆژگارییەکانی سەرەوەرمان باشترین ڕێگان بۆ ئەو ئیماندارانەی کە بەهەشتیان کردووەتە ئامانجیان و بەبێ لادان بە لای ڕاست و چەپدا هەوڵ دەدەن لەسەر ڕێگای ئیستیقامەت بمێننەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت "پێغەمبەر خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) چووە سەر مینبەر و بەدەنگێکی بەرز فەرمووی (ئەی ئەو کەسانەی بەزمان موسوڵمانێتی خۆتان ڕاگەیاندووە و هێشتا ئیمان دانەبەزیوەتە نێو دڵەکانتانەوە، ئازاری موسوڵمانان مەدەن، عەیبیان دەرمەخەن و بەدوای

١ مسلم، البر، ٣٣؛ ابن ماجە، زهد،٩

مەگەڕێن لەبەر ئەوەی هەر کەسێك لە عەورەتی (لایەنی شاراوەی) برایەکی بکۆڵێتەوە و بە دوایدا بگەڕێت ئەوا خوای گەورەش لەو دەپێچێتەوە، خوای گەورەش لە نهێنی هەر کەسێك بکۆڵێتەوە و لێی بپێچێتەوە، جا لە هەر جێیەك خۆی حەشاردابێت نهێنییەکانی دەردەخات و سەرشۆڕی دەکات.

ڕۆژێکیان عەبدوڵلای کوڕی عومەر تەماشای کەعبەی کرد و پێی فەرموو: "تۆ چەندە بەڕێز و مەزنیت! بەڵام ئەوەش هەیە کە ئیماندار لەڕوانگەی ڕێزەوە لە تۆ مەزنتر و پایەدارترە."[1] با بابەتەکە بە دوو فەرموودەی سەروەرمان کۆتایی پێبێنین:

"موسوڵمان برای موسوڵمانمانە. زوڵمی لێ ناکات، لە مەترسیدا بەتەنها جێیناهێڵێت. هەرکەسێك پێویستی برایەکی جێ بە جێ بکات خوای گەورەش پێویستییەکی ئەو جێبەجێ دەکات. ئەوەی موسوڵمانێك لە ناڕەحەتییەك ڕزگار بکات خوای گەورەش بەو هۆیەوە یەکێك لەناڕەحەتییەکانی قیامەتی لەسەر لادەبات. ئەوەی کەموکوڕییەکانی موسوڵمانێك داپۆشێت خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا کەموکورتییەکانی ئەو دادەپۆشێت."[2]، "هەرکەسێك بەرگری لە شەرەفی براکەی بکات خوای گەورە لە قیامەتدا ئاگر لە ڕووخساری دووردەخاتەوە."[3]

## برایەتییەکی لەم شێوەیە!!

عاکیف و عەلی دوو هاوڕێی نزیکی یەکتر بوون، بەهێندەی دوو برای ڕاستەقینە یەکتریان خۆشدەویست. تا ئەو ڕادەیەی هەمووکەس ئاواتی بەم دۆستایەتیەی نێوانیان دەخواست.

١ ترمذي، البر، ١١٩
٢ ابو داود، ادب، ٤٦؛ ترمذي، حدود، ٣؛مسلم، البر، ٥٨
٣ ترمذي، البر، ٢٠

لە هەمان کاتدا ئەم دوو هاوڕێیە لەنێوان خۆیاندا پەیماننامەیەکیان مۆرکردبوو، بێگومان پەیماننامەیەکی مەعنەویی، عاکیف ناوی پەیماننامەکەی نابوو (پەیماننامەی چاکەکاری)، بەجۆرێك هەریەکەیان هەمیشە هاوڕێکەی بۆ ڕێگەی ڕاست و چاکە بانگ بکات، ئەو کەموکورپیانەی لە براکەیدا دەیبینێت، بەشێوەیەکی جوان و بێ ئەوەی دڵی براکەی بشکێنێت پێی ڕابگەیەنێت، لە هەمان کاتیشدا هەوڵی چارەسەرکردنی بدات و هەموو هەوڵێك بۆ یارمەتیدانی بخاتە گەڕ.

ئەوان باوەڕیان وابوو کە بوونی هاوڕێ و دۆستێکی ڕێنیشاندەر چارەسەرێکی گرنگە بۆ ئەوەی هەموو کەسێك کەم و کورپییەکانی خۆی ببینێت و هەوڵی چارەسەرکردنیان بدات، وە ئەمەیان بە چارەسەرێکی زۆر کاریگەر دەبینی. لەبەرئەمە، بوونی هاوڕێیەکی ڕێنیشاندەری لەم شێوەیە کە حەقیقەت بیری مرۆڤ بخاتەوە و بەردەوام بانگی بکات بۆ چاکە، هاوکارێکی زۆر گرنگ دەبێت بۆ پارێزراوی و بەردەوام بوون لەسەر ڕاستەڕێی ئیستیقامەت. بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆژێکیان عاکیف، عەلی هاوڕێیی بانگ کرد و پێی وت:

- براکەم، دەمەوێت ئەم پەیماننامەیەت لەگەڵدا واژۆ بکەم.

- پەیماننامەی چی؟ خێرە؟!

- من مافی ئەوەت دەدەمێ کە هەر کەموکوڕی و هەڵەیەکت لە مندا بینی ڕووبەڕووی خۆم پێم بیڵێیت.

- ئەمە بەمەرجێك قەبووڵ دەکەم کەتۆش هەر کەمتەرخەمیەکت لەمندا بینی ئاگادارم بکەیتەوە.

- زۆر باشە، کەواتە ڕێککەوتین.

بەم جۆرە هەردوو هاورێکە پەیمان نامەکەیان ئیمزا کرد. ئیدی ئەوان بووبونە ڕێنیشاندەری یەکتری. پاش تێپەڕبوونی چەندین ساڵ گەردیلەیەك لە برایەتیان کەمی نەکردبوو، ئەوەبوو لەو ساڵەدا شتێك ڕوویدا کە هەردوکیانی دڵتەنگ کرد، عاکیف بۆ دۆزینەوەی کار ناچاربوو بەرەو شارێکی تر ماڵ بگوازێتەوە. لەناو خۆیاندا دڵی یەکتریان دەدایەوە، بەڵێنیان بە یەکدی دا کە "زوو زوو سەردانی یەکتر بکەن"، چونکە ئەم دۆستایەتیەی ئەوان بۆ هەمیشە بوو. ئیدی ئەوان لە دوو شاری جیاوازدا دەژیان، مانگێك بەسەر جیابوونەوەیان تێپەڕیبوو، عەلی بڕیاری دا سەردانی عاکیفی هاوڕێی بکات چونکە گەلێك بیری دۆستەکەی دەکرد، هەر کە باسی دۆستەکەی دەکرد موچورکە بە هەموو جەستەیدا دەهات، نەیتوانی لەوە زیاتر ئارام لەسەر ئەم دوورییە بگرێت، بۆیە بەرەو لای هاوڕێکەی بەڕێ کەوت. لەڕێگادا توشی پیاوێکی پڕنهێنی و سەیر هات، پیاوەکە لەکەناری ڕێگەدا دانیشتبوو، هەروەك بڵێی دەیویست شتێك بە عەلی بڵێت. عەلی سەلامی کرد و وخۆی بە پیاوەکە ناساند، لەڕاستیدا ئەم پیاوە فریشتیەکی خوا بوو لەسەر شێوەی مرۆڤ، بەڵام عەلی بەمەی نەدەزانی، پیاوەکە پرسی:

- بۆ کوێ دەڕۆیت کوڕم ؟

- سەردانی هاوڕێکەم دەکەم.

- پێدەچێت هاوڕێکەت چاکەیەکی گەورەی لەگەڵتدا کردبێت و تۆش بتەوێت پاداشتی بدەیتەوە، بۆیە دەڕۆیت بۆلای.

- نەخێر، بەم شێوەیە نییە، ناچم تا پاداشتی چاکەی بدەمەوە. هۆکاری سەردانەکەم تەنها ئەوەیە کە ئەوم لەبەر خاتری خوا خۆش دەوێت و هەر لەبەر خاتری خوا سەردانی دەکەم.

- چەند جوانە! کەوابێ منیش نهێنیەکت لا دەدرکێنم، باش گوێم لێ ڕابگرە،

من نێردراوێکی پەروەردگارم، هەروەك چۆن تۆ دۆستەکەتت لەبەر خاتری خوای گەورە خۆشدەوێت، باش بزانە کە خوای گەورەش تۆی زۆر خۆش دەوێت.[1]

## پاش کۆچکردن، سەروەرمان کۆچبەران و پشتیوانانی کردە برا

زۆرێك لە موسوڵمانانی مەککە لە پێش پێغەمبەرەوە و هەندێکیان لەدوای پێغەمبەرەوە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) کۆچیان بۆ مەدینە کرد. ئەو کۆمەڵگە موسوڵمانە نوێیەی کە لە مەدینەدا دروست بووبوو، لە کۆچبەرانی مەککە و پشتیوانانی مەدینە پێکهاتبوو کە پاڵپشتی کۆچبەران بوون. کۆچبەران و موسوڵمانانی مەدینە، کە پێیان دەگوترا پشتیوانان، برای ئاینی یەکدی بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بۆ زیاتر پتەوکردنی پەیوەندی و برایەتی لە نێوانیاندا، برایەتییەکی دی دامەزراند کە لە چییەتیدا تایبەتتر بوو.

حەزرەتی ئەبوبەکر لەگەڵ خاریجەی کوڕی زید، حەزرەتی عومەر لەگەڵ عەتبانی کوڕی مالیك، حەزرەتی عوسمان لەگەڵ ئەوسی کوڕی سابت، ئەبو عوبەیدە لەگەڵ سەعدی کوڕی موعازدا، موصعەبی کوڕی عومەیر لەگەڵ ئەبو ئەیوبی ئەنساری، عبدالرحمنی کوڕی عەوف لەگەڵ سەعدی کوڕی ڕەبیعدا، وە سەلمانی فارسی لەگەڵ ئەبو دەردادا (ڕەزای خوایان لێبێ) بوونە برای یەکتری.

ئەم برایەتیە زۆر ناوازە و تایبەت بوو، ئامانج لەمە بریتی بوو لەوەی کە موسوڵمانانی مەدینە هاریکاری موسوڵمانە کۆچبەرەکان بکەن و زیاتریش ئاوێتە و وابەستەی یەکدی ببن. کاتێك مەدینەییەکان لە هەوڵی پڕکردنەوەی پێداویستییە مادییەکانی کۆچبەراندا بوون، کۆچبەران لە فێرکردنی ئاینەکەیاندا

١ مسلم، البر،٣٨؛احمد بن حنبل، مسند،٢٩٢/٢

یارمەتی پشتیوانانیان دەدا. لەنێوانیاندا بەردەوام سەردان و بانگهێشت کردن وکۆبوونەوەی ئیمانی و دەردەدڵ کردن هەبوو. لە ڕاستە شەقامی دیاریکراوی پەروەردگار(صراط المستقیم) دا پێکەوە دەڕۆیشتن و لەم ڕێیەدا یارمەتی یەکتریان دەدا و خۆیان بە خاوەنی یەکدی دەزانی، بە هەمان ژینگە و بارودۆخدا تێدەپەڕین و خاوەنی هەمان دیدگا و باوەڕ و ئامانج بوون، لەو ڕاستەڕێیەدا بووبوونە هاوگەشتی دڵسۆز و ڕاستگۆ و دۆستی بەوەفا بۆ یەکدی.

ئەو کاتەی کۆچبەران لە پێناوی خوای گەورەدا هەموو سەروەت و سامانیان لە مەککە جێهێشت و ڕوویان لە مەدینە کرد، لە مەدینە پشتیوانان بەوپەڕی سنگ فراوانییەوە ئامێزی خۆشەویستییان بۆ کردنەوەو هەمووجۆرە هاوکارییەکیان پێشکەش کردن. تابلۆیەکی برایەتی وایان نەخشاند کەدەبووە وانە و پەند بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

بۆ نموونە سەعدی کوڕی ڕەبیعە کە پێشتر پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەگەڵ عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفدا کردبوونییە برا، هەموو سەروەتەکەیی هێنا و لەبەردەم عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفدا داینا و وتی "نیوەی ئەمە هی تۆیە"، لەبەرامبەریشدا عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کە یەکێکە لەو دە هاوەڵە بەڕێزانەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، هاوشێوەی داواکەی سەعدی کوڕی ڕەبیعە وەڵامێکی ناوازەی دایەوە و فەرمووی "خوای گەورە ماڵەکەت هەروا بەخێر بۆ بهێڵێتەوە، من پێویستم پێیان نییە، گەورەترین چاکە کە بەرامبەرم بیکەیت ئەوەیە ڕێگای ئەو بازاڕەم پیشانبدەیت کە کڕین و فرۆشتنی تێدا دەکرێت."[١٤٤]

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم برایەتییە بەم شێوەیە باس دەکات: (دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی ئیسلامەوە پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە

١ بخاري، مناقب الأنصار، ٢

برای یەکتر). (آل عمران، ١٠٣)، (گەر هەرچی لەزەویدا هەیە لە ماڵ و سامان هەمووپتان بەکاربهێنایە بۆ ئەوەی دڵەکانیان پەیوەستی یەکدی بکەن ئەوا نەتاندەتوانی، بەڵام خوای گەورە بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە خۆشی و یەکێتی و برایەتی لەنێوانیاندا بەرپا کرد چونکە بە ڕاستی ئەو زاتە باڵا دەست و پڕحیکمەتە). (الانفال، ٦٣)ئەم برایەتییە مەعنەویەی دامەزرێندرابوو، تابلۆیەکی هێندە مەزن بوو کە وێنەی لە مێژوودا نەبووە، لە ئەنجامی ئەم برایەتیەدا لە ئاستە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا پەیوەندی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر دروست بوو، دەماری دوژمنایەتی و لوت بەرزی خێڵایەتی بنبڕ بووبوو، بەڕاستی چەرخێکی بەختەوەری وەهایان دروستکرد کە بوویە سەرمەشقی گشت سەردەمەکان.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی تابلۆی ئەم برایەتیە بێ وێنەیەی نێوان پشتیوانان و کۆچبەران دەکات و دەفەرموێت "هەروەها بۆ ئەوانەش کە لە ماڵ و مەنزڵی خۆیان جێگیر بوون و لەگەڵ باوەڕ بە خوا و پێغەمبەری خوادا ڕاهاتوون، بەر لەوەی کۆچبەران کۆچ بکەن ئیمانیان هێناوە و خۆشیان دێ لەوانەی کۆچیان بۆلایان کردووە، هیچ دڵگرانییەك لە خۆیاندا شك نابەن بەرامبەر بەوەی دراوە بە کۆچبەران، ئەگەرچی خۆشیان موحتاج بن، بەڵام هەر کۆچبەران دەخەنە پێش خۆیانەوە، هەر کەسێکیش پارێزرابێ لە پیسکەیی دڵ و دەروونی خۆی، ئەوە لەو کەسانەیە کە ڕزگار بوون. "(الحشر، ٩).

موسوڵمانانی ئەمڕۆشمان دەتوانن هاوەڵان بکەنە سەرمەشق و تەنها لەبەر بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بێ چاوەڕوانیی هیچ پاداشتێك یەکدییان خۆشبوێت، بەچاوی سووك تەماشای یەکتر نەکەن و وابەستەی یەکدی بن و لێبوردە بن، هەرگیز وەفا پشتگوێ نەخەن و هەتا دەتوانن لە غەیبەت بەدوور بن، ئەو شتانەی بۆ خۆیان پێیان خۆشە بۆ براکانیشیان پێیان خۆش بێت، بەوەشەوە نەوەستن و هەردەم براکەیان پێش نەفسی خۆیان بخەن.

بەگشتی ئەم برایەتی و دۆستایەتی و هاوڕێیەتیە تایبەتییەی لەنێوان دوو موسوڵماندا هەیە، بەمەرجێك زیان بەموسوڵمانانی دیکە نەگەیەنێت، برایەتی ئیسلام پتەوتر دەکات و موسوڵمانان باشتر پێکەوە گرێدەدات. بەڵام گەر هاتوو ئەو برایەتیە شێوازێکی وەهای وەرگرت دژی موسوڵمانانی تر بێت یاخود ببێتە مایەی فەرامۆشکردن و لەبیرکردن یان بەکەم تەماشا کردنی موسوڵمانانی دی، ئەوکات لە ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی لایداوە و بووەتە پەیوەندییەکی تایبەتی. ئەمەش هیچ گرنگییەکی ئاینی نییە. لەو ڕوانگەیەش کە دەبێتە هۆکاری فیتنە و جوداکاری، زیانبەخش و مەترسیدارە.

## نموونەیەکی برایەتی لەچەرخی بەختەوەریەوە

لە بنچینەدا ئامانجی ئاینەکەمان بریتیە لە بەدیهێنانی کۆمەڵگەیەك کە لێوانلێو بێت لە هەستی یەکێتی و یەکگرتن و پێکەوە ژیان. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: " لە خوا بترسن و لەناو خۆتاندا ناکۆك مەبن و پەیوەندیتان باش بکەن و بەگوێی خوا و پێغەمبەری خوا بکەن ئەگەر خاوەن ئیمانن. "(الأنفال، ١) پێغەمبەری سەروەریشمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) دەفەرمووێت"ئامۆژگاریتان دەکەم کە یەکگرتوو بن لەناو یەکدا و هەتا دەتوانن دوور بکەونەوە لە دووبەرەکی" وە هەروەها دەفەرمووێت"یارمەتی خوای گەورە لەگەڵ کۆمەڵدایە، هەروەك چۆن لە بەیەکەوەیی و یەکگرتنتدا ڕەحمەت هەیە بەهەمان شێوە لە جیابوونەوەش سزا وتووڕەیی خوا هەیە. "

ڕەوشتی چەرخی بەختەوەری بریتیە لە برایەتی و یەکگرتن و ئیحسان و ئیسار (لەخۆبووردەیی). هەر لەم ڕووەوە دەبینین کە پێغەمبەر(عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام)هەمیشە هەستیار و وریا بووە سەبارەت بە ڕێگرتن لە سەرهەڵدان و فراوانبوونی دووبەرەکی

لە نێوان موسوڵمانماناندا، ئەوەتا لە چەندین ڕووداوی جیاوازدا دەبینین لە ڕێگەی چەند هەنگاوێکی حەکیمانەوە ڕێی لە فراوان بوونی تێنەگەیشتنی نێوان موسوڵمانمانان گرتووە.

چونکە بڵاوبوونەوەی ڕەوشتی جوان لە کۆمەڵگەدا، بەڕادەیەك کە بگاتە ئەوەی هەستی پێبکرێت و بەرهەمی هەبێت پەیوەستە بە بڵاوبوونەوەی متمانە و پشت بەیەك بەستن لەکۆمەڵگەدا، ئێستاش با بچینە خزمەت هەندێك نموونە کە نیشانمان دەدەن پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) چۆن لەبەرامبەر دووبەرەکی و دەمەقاڵێی نێوان موسوڵمانمانان بە هەنگاوی حەکیمانەی خۆی کێشەکانی چارەسەرکردووە:

لە غەزای بەنی موستەلیقدا لەنێوان دوو کەسی نێو سوپای ئیسلامدا کە ئاویان بۆ کۆچبەران و پشتیوانان دەهێنا لە نزیك بیرەکەی مورەیسی دەمەقاڵێیەك دروست بوو . نوێنەری پشتیوانان بانگی لە خەڵکی مەدینە کرد و نوێنەری کۆچبەرانیش بانگی لە کۆچبەران کرد بۆ وەرگرتنی یارمەتی، لە ئەنجامدا بارودۆخەکە ئاڵۆز بوو، کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە بارودۆخەکە ئاگادار بوو یەکسەر چارەسەری بۆ ئەو ناکۆکیەی کە دروست بوو بوو دۆزیەوە، چونکە شەرکردن و پەنابردن بۆ دەمارگیری لە شەڕدا ڕەفتارێکی سەردەمی نەزانیە، ئاینی ئیسلام لەبری ئەمە لێکتێگەیشتن و دۆستایاتی و پێکەوە ژیانی هێناوەتە کایەوە، موسوڵمانمانان لەو شوێنەی کە لێی دەژین بەرپرسیارێتی ئەوەیان لەسەر شانە کە یەکێتی و پشت بەیەك بەستن فەراهەم بکەن لە کۆمەڵگادا، چونکە موسوڵمانان برای ئاینی یەکترن.

لەنێو برای ئایندا دەمەقاڵێکردن بەبێ هۆ و بەناڕەوایی شتێکی گونجاو نی یە. هەربۆیە لە هەر شوێنێکدا دەقاڵێیەك یاخود شەڕێك ڕووی بدایە، هەر لەگەڵ

بیستنی ئەمەدا سەروەرمان یەکسەر خۆی دەگەیاندە ئەو شوێنە و ئەوپەڕی هەوڵی دەدا کە چاکسازی لە نێوان هەردوولا دا دروست بکا.

پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە پێناوی ئەوەی ببێتە بەربەست لەبەردەم ئەو ناکۆکیە توندانەی کە لە نێوان هەندێك لە هاوەڵاندا ڕووی دەدا، زۆر هەستیارانە مامەڵەی دەکرد. ڕووداوی دەمەقاڵەکەی خەڵکی قوبا یەکێکە لەو نموونانەی کە نیشاندەری هەوڵدانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) ە بۆ ڕێگریکردن لە هەڵگیرسانی شەڕ. ئەو لە پێناو ڕێگری کردن لە فراوان بوونی ئەو دەمە قاڵێیەی کەوتبووە نێوان خەڵکی قوباوە و ڕوونەدانی شەڕ لە نێوانیاندا هەوڵی زۆریدا.

لە کاتێکدا ئەو زۆر گرنگی بە کاتی نوێژ دەدا بە لام لە پێناو چارەسەر کردنی ئەو کێشەیەدا هەندێك نوێژەکەی دوا خست و هەتا ئاشتی نێوانیان پێکنەهات ئەوێی جێنەهێشت. ڕووداوەکە بەم شێوەیە بوو:

وادیارە ڕۆژێکیان نزیك بە نوێژی عەسر ناکۆکیەك دەکەوێتە نێوان کوڕەکانی عومەری کوڕی عەوفی خەڵکی قوبا و زۆر بە خێرایش ناکۆکییەکەیان دەبێتە شەڕ، تەنانەت لەم شەڕەدا بەردیشیان گرتبووە یەکتری، سەروەرمان هەر کە گوێی لەم هەواڵە دەبێت دەمودەست چەند هاوەڵێك لەگەڵ خۆیدا دەبات و بەرەو قوبا بەڕێ دەکەوێت، هەوڵدەدات بارودۆخەکە هێور بکاتەوە.

کاتی بانگی عەسر هاتبوو و بانگ بێژی مەدینەش (بیلالی حەبەشی) بانگی فەرموو، ئەهلی مزگەوت ماوەیەکی زۆر چاوەڕێیان کرد بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) هێشتا لە قوبا نەگەڕابوویەوە ئەمەش واتای ئەوەبوو کە شەڕی نێوان خەڵکی قوبا هێشتا هێور نەبوبووەوە و ئاشتەوایی لەنێوانیاندا دروستنەبووبوو .

پێغەمبەری خوا زۆر حەزی دەکرد کە هەردوولا ئاشت بکاتەوە سەرقاڵبوونیشی بەم کارەوە لە کاتێکدا بانگی عەسری فەرموو بوو ئەوەی نیشاندەدا کە نایەوێت ئەویَ جێبهێڵێت تا ئەو ئاشتەواییە فەراهەم نەبێت.

لەلایەکی دیکەوە پاش چاوەڕوانیەکی زۆر حەزرەتی بیلال بە هەستیارییەوە بە حەزرەتی ئەبوبەکری فەرموو: پێغەمبەری خوا خەریکی چاکسازی نێوان مرۆڤەکانە ئەگەر پێت باش بێت تۆ پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکەیت ، حەزرەتی ئەبوبەکریش نوێژی دابەست، پاشان پێغەمبەری سەروەریشمان هات (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ)و چووە ڕیزی یەکەم، حەزرەتی ئەبوبەکریش کە زانی پێغەمبەری خوا هاتووە لەمیحرابەکە دوور کەوتەوە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) بەردەوامی بەپێشنوێژیەکەیدا. "

## حەزرەتی ئەبوزەری غەفاریی بۆچی داوای لێبووردنی لەحەزرەتی بیلال کرد؟

وەکو هەر بابەتێکی تر هەڵە کردن و ئەنجامدانی هەڵسوکەوتی نەرێنی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا کارێکی دروست نییە. بەڵام سووربوون لەسەر ئەو هەڵانە کارێکی خراپترە. کاری دروست ئەوەیە کە هەر کات هەستمان بە هەڵەیەکی خۆمان کرد لێی پاشگەز ببینەوە و، لەسەر هەڵەکە سوور نەبین و بە هەڵسوکەوتێکی جوان و گونجاو قەرەبووی هەلەکەمان بکەینەوە. یەکەم هەنگاویش لەوەوە دەستپێدەکات کە هەر هەستمان کرد هەڵەیەکمان بەرامبەر کەسێك کردووە یەکسەر داوای لێبوردن و گەردن ئازایی لیَ بکەین.

جارێکیان هەرچۆنێك بوو بێت حەزرەتی ئەبوزەری غەفاریی لە بێئاگاییدا بە حەزرەتی بیلال دەڵێت :کوڕی ژنە ڕەشەکە ! کاتیَ کە ئەمە دەگاتە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيهِ) دەفەرموێت: ئەی ئەبوزەر ئەوە لەبەر خەسڵەتێکی دایکی

گاڵتەی پێ دەکەیت؟

کەوابێ تۆ هێشتا دەماری نەزانیت تێدا ماوە !

حەزرەتی ئەبوزەر ئەوندە پەشیمان بوو لەو قسەیەی کردبووی ڕوومەتی خستبووە سەر زەویەکەو دەیوت هەتا حەزرەتی بیلال قاچی نەنێت بەڕوومەتمدا من سەرم هەڵنابڕم لبەڵێ بەم شێوەیە داوای لێبووردنی لێکرد.

هەرچەندە حەزرەتی بیلال چەند جار فەرمووی پۆزشەکەشت پەسەند دەکەم، ئەگەر دەم و چاویشت نەخەیتە سەر زەویەکە، بەڵام حەزرەتی ئەبوزەر زۆر سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی و حەزرەتی بیلالیش ناچار پێینا بە دەمووچاودا.[1]

لەم ڕوداوەوە قوڵی هەستی پەشیمانی هاوەڵێکمان بۆ دەردەکەوێت، گرنگتین خاڵ کە لێرەوە بۆمان دەر دەکەوێت سوور نەبوونە لەسەر گوناە، سوورنەبوون لەسەر گوناە و تەوبەکردن و داوای لێبووردن و گەردن ئازادی کردن لە بەرامبەر و پۆزش هێنانەوە بۆ ئەوانەی کە ئازارمان داون بریتین لە تایبەتمەندی مرۆڤە پارێزکارەکان.[2]

## برایەتی نێوان حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر

حەزرەتی ئەبودەردا ڕووداوێکمان بۆ دەگەڕێتەوە کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتووە و خۆی بینەری بووە:

ڕۆژێکیان هاوەڵان لەخزمەتی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْه)دا دانیشتبوون حەزرەتی ئەبوبەکر بە شڵەژاویی هاتە ژوورەوە، دامێنی جلەکانی هەتاکو لای ئەژنۆی هەڵکردبوو، کاتێك پێغەمبەری نازدار (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) چاوی بەم دیمەنە

---

١ موختەسەری سەحیحی بوخاری، ١/٤٢-٤٤

٢ بڕوانە سورەتی آل عمران (١٣٤-١٣٥

کەوت فەرمووی: ڕەنگە ئەو برایەتان لەگەڵ یەکێکدا توشی ناکۆکییەك بوویێت؟

حەزرەتی ئەبوبەکر سەلامی کردوو دەستی کرد بەگێڕانەوەی ئەو شتانەی کە بەسەری هاتبوون. وەك لە قسەکانییەوە دەرکەوت توشی مشتومڕێك بووبوو لەگەڵ حەزرەتی عومەر، ئەمیش هەندێك بە توندی مامەڵەی لەگەڵ کردووە هەرچەندە دوای ڕووداوەکە ڕاستەوخۆ داوای لێبوردنی لە حەزرەتی عومەر کردووە بەڵام حەزرەتی عومەر گوێی لێنەگرتووە. . لەبەرامبەردا پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) سێ جار داوای لێخۆش بوون بۆ حەزرەتی ئەبوبەکر دەکات لە پەروەردگار. لەڕاستیدا حەزرەتی عومەریش لەم ڕووداوە پەشیمان بووبوویەوە، بۆیە چووبووە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکر، کە ئەوی لە ماڵ نەبینیبوو یەکسەر بەرەو لای پێغەمبەری سەروەرمان کەوتبووە ڕێ و هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) و سەلامی کرد و پاشان دانیشت.

حەزرەتی عومەر خەریك بوو دەست بکات بە قسە کردن کە لە سیمای پێغەمبەری خوا ئەوەی بەدی دەکرد کە خەریکە ڕەنگی دەم و چاوی دەگۆڕێت، حەزرەتی ئەبوبەکر لەخەمی ئەوەی نەوەك پێغەمبەر شتێك بڵێت و حەزرەتی عومەر ئازار بچێژێت لەسەر هەردوو ئەژنۆی دانیشت و بە سوێند خواردنەوە فەرمووی کە لەم ئیشەدا ئەو لە حەزرەتی عومەر زیاتر زیادەڕۆیی کردووە .

حەزرەتی ئەبو دەردا کە خۆی شاهیدی ڕووداوەکە بووە، بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) ڕووی کردە هەموو ئەوانەی کە لە مەجلیسەکەدا ئامادەییان هەبوو وە پێی فەرموون کە لە ڕۆژانی سەرەتای پێغەمبەرایەتیەکەمدا هەرکەسێکم بانگهێشت دەکرد هەرچۆنێك بێت هەر گومانێك یان نارەزایەتییەکی هەر هەبووە لە قەبووڵ کردنی ئیسلامدا، تاکە کەسێك کە بە بێ هیچ گومانێك پێغەمبەرایەتی یەکەی قبووڵ کردبێت تەنها حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، پاشان دووجار

بە هاوەڵانیی فەرموو، ئێستاش ئەی یارانم ! ئێوە ئەو پەیوەندی و تایبەتمەندییەی ئەم دۆستە ئازیزەم بە خاتری من دەپارێزن، وانیە؟

حەزرەتی ئەبو دەردا دەفەرمویٚ لە دوای ئەو ستایشەی حەزرەتی ئەبوبەکر هیچ کاتێك خاتری ئەو نەشکێدنرا.[1]

پێویستە برایەتی ودۆستایەتی بەم شێوەیە بێت ! ئەو ئاکار و ڕەفتارەی کە حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر نواندیان لە ساتێکدا کە ناکۆکییەك کەوتە نێوانیانەوە چەندە نموونەیەکی جوانە بۆ ئێمە، کە لەوانەیە لە ژیانی ڕۆژانەدا چەند جارێك لەگەڵ دەوروبەرماندا بکەوینە مشتومڕەوە. با بیرێك بکەینەوە، لێپرسینەوەیەك لەگەڵ خۆماندا بکەین! داخۆ چەند جار لەگەڵ برا موسوڵمانەکانمان دەمەقاڵیمان کردووە، کەوتووینەتە حاڵەتی لێك تێنەگەیشتنەوە، بەتوندی مامەڵەمانکردووە لە کاتێکدا کە پێویست نەبووە و دۆستەکانمان دڵتەنگ کردووە؟ پاشان ئایا تەوبە و پەشیمانیمان بەرامبەر پەروەردگار و داوای لێبوردنمان لە دۆستەکانمان کردووە؟!

تۆ بڵێی هۆکاری زیاد بوونی دڵ شکاویەکانمان لەبەرئەوە نەبێت کە لە ڕەفتارەی ئەبوبەکرانە و عومەرانە دوورکەوتووینەتەوە . . . . هەموو ئەم دڵشکاندنانە لەسەر یەکدی کەڵەکە بوون و بوونەتە هۆی نەمانی مەحەببەت و برایەتی نێوانمان؟!

ئایا تۆ بڵێی ئێمە خەریکی ڕیاکاریی بین کە پۆزش بۆ یەکدی ناهێنینەوە بەهۆی ئەوەی بە ڕووکەش بە دۆست و برای یەکدی دەبینرێین؟ بۆچی ناتوانین لە دڵەوە لە کاتی خۆیدا داوای لێبووردن بکەین؟

ئایا ئێمە ئەگەر ئەم شکۆمەندیە لە ژیانماندا ڕەنگ پێنەدەینەوە و نەیکەینە بەشێك لە هەڵسوکەوتەکانمان، ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئێمە لە ئاکاری یارانی چەرخی بەختەوەری دوا کەوتووین ؟

---

[1] بخاري، فضائل اصحاب النبي،١٣/٥

پێویستە هەموو تاکێك وەکو پێشەوایانمان حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر بە مەبەستی تێکنەدانی دۆستایەتی و مەحەببەت و درێژەدان بە برایەتی لە هەوڵ و تەقەلادابن و ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەن.

## ئێمە بە یەکدی تاقیدەکرێینەوە

دەبێ ئەوە لە یاد نەکرێت کە خوای پەروەردگار هەروەك چۆن بە ڕووبەڕووبونەوەمان لەگەڵ ڕووداوە جۆراوجۆرەکان تاقیمان دەکاتەوە بەهەمان شێوەش بە یەکتری تاقیمان دەکاتەوە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: "وە بەو جۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە. "(الأنعام ٥٣)

لەبەر ئەم یاسایە پێویستە هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لە نێوانماندا ڕوو دەدەن بە دیوێکی تری تاقیکردنەوە ببینین و هەموو ئەو هەست و ڕەفتار و بیرۆکانەی مەترسی لەسەر برایەتی و دۆستایەتی نێوانمان دروست دەکەن وەکو کەرەستەی ئەم تاقیکردنەوەیە تەماشا بکەین.

ئەگەر مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە ئەوە قەبووڵ نەکات کە لە تاقیکردنەوەدایە، ئەوا وای دەبینێت کە کەسانی دی هەر لەنزیکترین بازنەوە هەتا بازنەی کوفر هەموو لە هەوڵدان تا زیانێك بەم بگەیەنن هەروەها ئەو کاتەی دەست بۆ هەر شتێك دەبات و بۆی ئەنجام نادرێت وا دادەنێت کە هەموو کەس دوژمنایەتی ئەم دەکەن. بەڵام ئەگەر هاتوو هەریەکە لەمانە وەك تاقیکردنەوەیەك ببینێ، ئەوا هەموو ئەو جۆرە بیرۆکانەی دەتوێنەوە و نامێنن.

ئێمە هەموو مرۆڤین لەبەرئەوە زۆر ئاساییە ئەگەر هەریەك لە ئێمە چەند کەموکوڕییەکمان هەبێت، ئەگەر بێت و مرۆڤەکان هەریەکەیان بهێنیت و کەمێك بیانهێنیتە قسە کردن و توێژینەیەوەکی دەروونیان بۆ ئەنجام بدەیت دەبینیت زۆربەی

خەڵکی بەرامبەر دوست و برادەرانیان زۆر دڵپڕن . ئەمە لە سروشتی مرۆڤدا هەیە لەبەر ئەوە دەبێت لێبوردەبین و هەوڵبدەین مرۆڤێکی دڵفراوان بین، هەروەك چۆن سەردەکەوین بەسەر چیا و تەپۆڵکەکاندا بەهەمان شێوە کەم و کوڕی دۆست و برادەرەکانیشمان وەکو تەپۆلکەیەکی ڕێی بەندایەتی ببینین وهەوڵ بدەین بە باڵی ئارامگری و چاوپۆشی و لەسەر خۆیی بەسەر ئەو تەپۆڵکانەدا سەربکەوین .

ئەو مرۆڤەی کە داخوازی بەختەوەریی هەمیشەییە، دەبێت سەرەتا بیر لەوە بکاتەوە کە ئێمە داخوازی شتێکی بچوك و هەرزان نین، بەڵکو داخواز و داواکاری بەختەوەریی هەمیشەین . بەپێی ئەو پێوەرانەی کە حەزرەتی بەدیعوززەمان لە مەکتوبی بیستەمدا ئاماژەی پێداوە"ئێمە داواکاری ژیانی ئەو بەهەشتەین کە هەزار ساڵ ژیانی بەختەوەرانەی ئەم دونیا هێندەی یەك کاتژمێری ئەوێ خۆشی نییە و لە بەهەشتیشتدا داواکاری دیدار و مەرتەبەی ئەو جەمیلی زولجەلالەین کە ساتێك شادبوون بە جەماڵی لە هەزار ساڵ ژیانی ناو بەهەشت چێژی زیاترە!"

کەواتە، لەبەر ئەوەی ئەو ئامانجەی کەئێمە دەمانەوێت پێی بگەین زۆر مەزنە . دەبێت بەپێی قەبارەی ئامانجەکەشمان بەرگەی ناڕەحەتی و تاقیکردنەوەکان بگرین. هەر ڕەفتار و گوفتارێکی ناخۆش کە تووشمان دەبێت، هەر لە سەرەتاوە لەبەر خاتری ئەو ئامانجە بەرزو پیرۆزەمان، قەبووڵی بکەین و بەبەشێکی ئەو تاقیکردنەوەیەی بزانین و بە ئاکاری جوانمان سەربکەوین بەسەر ئەو ناڕەحەتیانەدا و پاشان بەردەوام بین لە ڕێکردن. لەبری ئەوەی لەلایەنە نەرێنییەکانی براکانمان وردبینەوە باشتر وایە لایەنە جوانەکانیان ببینین و ستایشی ئەو کارە جوانانەیان بکەین لەبەرامبەر هەڵەکانیشیاندا بێ چاو و بێ گوێ و بێ زمان بین، کەمو کوڕیەکانیان نەبینین و لێبوردەبین بەرامبەریان ، کە خۆی لەخۆیدا ئەمانە هەمووی ئەرك و داخوازی ئیمانداریتیە . هەروەها ئاینەکەشمان داوای ئەوەمان لێ دەکات کە بە شوێن دەرخستنی کەمو کوڕیەکانی مرۆڤەکاندا نەرۆین و ئەگەر هاتوو بەبێ

ویستی خۆمان بەرچاومان کەوت ئەوا ئەو کاتە چاو پۆشی لێ بکەین ، چونکە ئاینەکەمان لێبوردەییشی بە چاکە هەژمار کردووە .

پەروەردگارمان پەسنی ئەم جۆرە ئیماندارانە دەکات لە قورئانی پیرۆزدا و دەفەرموێت: "ئەوانەی لەکاتی هەبوون و کەم دەستیاندا لەرێگای خوا سەروەت و سامانی خۆیان دەبەخشن و لەکاتی هەڵچون و تورەبوندا خۆیان دەگرن تورەیی خۆیان دەخۆنەوە لەخراپەی خەڵکی خۆش دەبن و چاکە دەکەن، خوا چاکە کارانی خۆش دەوێت و دەیانخاتە بەر رەحمەتی خۆی ."(آل عمران ١٣٤).

ئێمە تەنانەت بە براکانیشمان تاقیدەکرێینەوە، ئەمە هەر دەبێت لەسەرەتاوە قەبووڵ بکەین و ئەوەش بزانین کە ئەگەر هاتوو لەم تاقیکردنەوەدا سەرکەوتووبین ئەوا خوای گەورە پردی خۆشەویستیی لەنێوان دڵەکانماندا دروست دەکات . . . ئەگەر هاتوو ئێمە بە خۆڕاگری و ئارامگری وگیانی لێبوردەییەوە بڕوانین ئەوا ئەنجامەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە لە قازانجی ئێمە دەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا رەنگە خوای پەروەردگار ئەو شتە بەدی بهێنێت کە ئێمە ئاواتی پێ دەخوازین، دروستکردنی دڵپەویستی لە نێوانماندا. لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی بەم ئەنجامە بگەین پێویستە هەموو تاکێك لە لایەن خۆیەوە ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆی بەجێی بهێنێت، کەسانی دیکەی پەسەند بێت و ستایشیان بکات، پاشان ئەم جێی پەسەندیی و ستایشکردنە لە رووبەڕوو یاخود لە نەبونیدا باس بکات بە شێوەیەك کە بگاتەوە بە براکەی و بەم شێوەیەش خۆیان لای یەکتر خۆشەویست بکەن و پێویستە بۆ ئەم مەبەستە باوەڕ بە نەفسی خۆیان بهێنن.

لایەنێکی ئەرێنی ئەم بابەتە، لێپرسینەوە یە لە هاوڕێکانمان. ئەگەر هاتوو خاترمان هەبوو لەلایان وە وتەکانمانیان بە ئاسایی وەرگرت، ئەو کات لەکاتی یەکتر بینیندا دەتوانین ڕووبەڕوو هەڵە و کەمتەرخەمیەکانیان لەگەڵدا باس بکەین.

وه له كاتی ئه‌نجامدانی ئه‌مه‌شدا ده‌بێت دووربكه‌وینه‌وه له خۆ به گه‌وره‌زانین و به‌كارهێنانی هه‌ندێ زمانی جه‌سته‌یی نه‌شیاو. وه‌ك جوڵاندنی ده‌ست و قاچ كه خوای گه‌وره پێی خۆش نییه. كه‌وابێ له كاتی باسكردنی بابه‌تێكدا ده‌بێت به‌شێوه‌یه‌ك نه‌بێت كه دڵیان بریندار بكات، ئه‌گه‌ر هاتوو زانیمان كه ناتوانین ڕووبه‌ڕوو پێیان بڵێین ئه‌و كاته له نێو كۆمه‌ڵدا باسی ئه‌و كه‌موكوڕیه ده‌كه‌ین و به‌بێ ناوهێنان و ده‌ست نیشان كردنی كه‌سی مه‌به‌ست، ئومێدی ئه‌وه‌ش ده‌خوازین كه ئه‌ویش له‌و هه‌ڵه‌یه‌ی خۆی تێ بگات. به‌ڵام به دڵنیایی یه‌وه نابێت هه‌ڵه‌ی هیچ كه‌سێك له ئاماده‌نه‌بونی خۆیدا باس بكه‌ین وه‌ك ئه‌وه‌ی له‌كاتی باس كردنی كه‌سێك به ڕه‌خنه‌و گاڵته پێكردنه‌وه هه‌ڵه‌كانیان ئاشكرا بكه‌ین به لا چاوه‌وه ئاماژه‌كردن و باسكردنی براكانمان كارێكی ئیماندارانه نی یه.

قورئانی پیرۆز ته‌نانه‌ت ئاماژه‌یه‌كی گاڵته ئامێزیش به غه‌یبه‌ت هه‌ژمار ده‌كات: " ماڵ وێرانی بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه خه‌ڵكی عه‌یبدار ده‌كه‌ن و تانه‌و ته‌شه‌ریان لێده‌ده‌ن ." هه‌روه‌ها ئه‌م ئایه‌ته ڕووی له‌و كه‌سانه‌یه كه به ئاماژه‌دان به‌سه‌ر یان به چاویان باسی عه‌یبه‌ی خه‌ڵكی ده‌كه‌ن و به‌كه‌سانی كه‌م و سوك ده‌یانخه‌نه پێش چاو .

به‌ڵێ ته‌نانه‌ت تانه‌دان له‌وه‌ی كه پاڵتۆی كه‌سێك كورته یان درێژه، له‌ئایندا به غه‌یبه‌ت هه‌ژمار كراوه. غه‌یبه‌ت كردنیش هێنده تاوانێكی گه‌وره‌یه كه له فه‌رمووده‌یه‌كی پیرۆزدا وه‌كو زیناكردن له‌گه‌ڵ نزیكترین مه‌حره‌مدا ئاماژه‌ی بۆ كراوه.

كێ ده‌توانێت ئه‌وه‌نده نزم ببێته‌وه و خۆی سوك بكات؟ تۆ له‌لایه‌كه‌وه ئه‌ڵێی برامه و له لایه‌كی دیكه‌شه‌وه به‌هۆی ساده‌ترین و بچوكترین بیانووه‌وه ڕه‌خنه‌ی لێ ده‌گیریت و غه‌یبه‌تی ده‌كه‌یت. ئه‌و مرۆڤه هه‌روه‌كو چۆن به هۆی ئه‌و وته جوانانه‌ی

که بە خۆشەویستیەوە لە تۆوە دەبیستێت پەیوەندی لەگەڵتدا بەتین دەکات، هەرواش کە ئەو وتە و هەڵسوکەوتە ناشرینانە دەبینێت بە هێندەی خۆشەویستیەکەی ڕق و کین لە دڵیدا دروست دەبێت، لە پاشان هەرچەندە شتی باشیشی لەسەر بڵێیت، ئەو یەکسەر وابیر دەکاتەوە دەڵێت: داخۆ مەبەستی چی بێت لەمە؟ وە هەمیشە بەگومانەوە لە وتەکانت دەڕوانێت.

مرۆڤ دەبێت هەر لەسەرەتاوە کلیل لە زمانی بدات، سەبارەت بە هیچ برایەکی لە پاشەملە نابێت قسە بکات. تانە و تەشەر لێدان و غەیبەت کردنی خەڵکی کارێکی زۆر خراپە. مرۆڤ دەبێت هەر لە سەرەتاوە دووربێت لە کارێکەوە کە پێویست دەکات لە داهاتوودا پۆزشی بۆ بهێنێتەوە. بەڵام ئەگەر کەسێك هەر کەوتە ناو ئەم گوناهەوە وەکو ئەوەی بوهتان بۆ کەسێك بکات یان تانە و تەشەر لە کەسێك بدات یان وتەیەك بە کەسێك بلێت کە لە کاتی گوێبیستبوونیدا پێی دڵتەنگ ببێت، ئەوا بۆ ئەوەی جارێکی تر ئەم کارە ناپەسەندە دووبارە نەکاتەوە پێویستە لە یەکەم چاوپێکەوتنی هاوڕێکەیدا چۆن باسی کردووە بەرامبەر خۆشی دووبارە باسی بکاتەوە بۆ ئەوەی چێژی خەجاڵەتی و ڕوو زەرد بوون و پەشیمانی بکات و عەزمی ئەوە بکات کە جارێکی تر توخنی ئەم جۆرە کارانە نەکەوێتەوە. جاری وا هەیە دەستەواژەی" دەرهەق بە تۆ فلان شتم وت" لای بەرامبەر گرێیەك دروست دەکات، لەبەر ئەوە دەبێت هەر لە سەرەتاوە لە بەرامبەر ئەو کارانەی کە لە ئەنجامدا وامان لێ دەکەن داوای لێ بووردن لە دەوروبەرمان بکەین دووربکەوینەوە و لە بەرامبەر غەیبەتتدا زنجیر لە دەممان بدەین.[1]

---

١ موحەممەد فەتحوڵلا گولەن، ڕیشەی شکاو

## مامۆستا سەعیدی نوورسی چۆن باسی برایەتی دەکات

مامۆستا سەعیدی نوورسی، گرنگترین بابەتی نێو کتێبەکانی لە دوای بابەتی ئیمان بریتیە لە بابەتی یەکێتی و برایەتی نێوان ئیمانداران. ئەو هەمیشە بە جدیەت و گەرم و گوڕیەوە لەسەر بابەتی یەکێتی موسوڵمانان و برایەتی ئاینی وەستاوەتەوە. وە هەروەها فەراهەم بوونی ئەو یەکێتییەش بە ئەنجامی بوونی پەیوەندییەکی بەتین بە پەروەدگارەوە و ئیمانێکی بێ ڕیا دەبەستێتەوە، لە کاتێکدا ئەو هەستیاریەی لەمەڕ ئەم بابەتەوە دەردەبڕێت کە دەفەرموێت لە فەرزەکاندا ڕیا کردن نیە، پاشان دەفەرموێت گەورەترین بەرپرسیارێتی لەم سەردەمەدا بریتیە لە پاراستنی یەکێتی موسوڵمانان.[1]

لە هەمان شوێندا دەفەرموێت مەشرەبی ئەم یەکێتییە خۆشەویستییە، دوژمنەکانی ئەم یەکێتییەش نەزانی و هەژاری و دوو ڕوویە.[2] لێرەدا بەم دەربڕینانە بە کەسانی خاوەن ویژدان دەڵێت کە یەکێتی و برایەتی تەنها بە خۆشەویستی پێك دێت، لەبەر ئەوەی ئیمان داخوازی خۆشەویستیە و ئیسلامیش داخوازی برایەتیە، مامۆستا بەدیعوززەمان برایەتی ئاینی و برایەتی نەتەوەیی و کەسیی بەم شێوەیە بەراورد دەکات و دەفەرموێت کە یەکەمیان هێندە فراوانە هەموو ئومەتی ئیسلام لە خۆ دەگرێت، دووەمیشیان مەجازییە و کاتیە و ڕاستەقینە نییە، بۆ بنیاتنانی یەکێتی نێو موسوڵمانانیش سەرەتا دەبێت برایەتی نێوان تاکەکان لە هەموو ڕوویەکەوە بنیات بنرێت و بەهێز بکرێت، ئەمەش بێ گومان بە برایەتیەك نایەتە دی کە لەسەر بنەمای ئارەزوە دونیایەکان بنیاتنرابێت، بەڵکو دەبێت یارمەتی لە هێزێکی ئیلاهییەوە وەربگرێت کە ئەم دونیا و ئەو دونیاشی بەدەستە.

١ خطبة الشامية، سەعیدی نورسی
٢ هەمان سەرچاوە

له ژێر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونەدا کە هەموو ئیمانداران برای یەکترن خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت"ئەی ئیمانداران چاك بزانن کە تەنها ئیمانداران برای یەکترین، پارێزکار بن، سا بەڵکو خوای گەورە ڕەحمتان پێ بکات." لە مەکتوبی بیست و دووهەمدا بەم شێوەیە ئەم ئایەتە ڕوون دەکاتەوە: دەسپێکی وتە نورانیەکانی ئەم بەشەی ئایەتەکە ئیمانداران بەرەو برایەتی و خۆشەویستی بانگهێشت دەکات.[1] ئەو شتانەی کە دەبنە هۆکاری دروست بوونی جودایی و ڕق و دوژمنایەتی بریتین لە عینادی و حەسودیی و دەمارگیری لە نێو بازنەی ئیماندا کە بالاَترین پلەی مرۆڤایەتیە. ئەم خەسڵەتانە قێزەونن و بە ستەم لە قەڵەم دەدرێن. لەبەر ئەوەی ئەمانە بۆ مرۆڤ لە ڕووی کەسی و کۆمەلاَیەتی و ژیانی مەعنەویشەوە تابڵێی زیانبەخشن، وەك ژەهرێك وەهان کە ژیانی مرۆڤ توشی داڕووخان دەکەن.

دوژمنایەتی کردن بەرامبەر ئیماندار ستەمە :سەرەتا لەڕووی حەقیقەتەوە ستەمە، ئەی ئەو کەسە بێ ویژدانەی کە ناخت پڕکردوە لە ڕق ودوژمنایەتی بەرامبەر باوەرداران! ئەگەر تۆ لە بەلەمێك یاخود لەماڵێکدا بیت، لەگەڵ تۆشدا نۆ دانە بێتاوان و یەك تاوانبار هەبێت، ئیتر خۆت تێ دەگەیت لەوەی ئەگەر کەسێك بیەوێت بەهۆی ئەو یەك تاوانبارەوە ئەو بەلەمە نوقم بکات یاخود ئەو ماڵە بڕوخێنێت چەندە ستەمکارە، بگرە تا دەنگت بگاتە ئاسمانەکان لە داخی ستەمکاری ئەو پیاوە هاوار دەکەیت، جا تەنانەت گەر تەنها یەك بێتاوان هەبێت لەو خانووەدا ونۆ دانە تاوانبار هەبێت دیسان لەگەڵ هیچ یاسایەکی دادپەروەریدا ناگونجێت ئەو خانوە بڕوخێنرێت.

بەهەمان شێوە، ئیماندارێکیش کە لە حوکمی ماڵێك یاخود بەلەمێکی خوادایە نەك نۆ سیفەتی وەك سیفەتەکانی ئیمان و ئیسلامەتی و دراوسێیەتی. . .

---

١ سەعیدی نورسی. مەکتوبات

دوژمنایەتیکردنی تۆ بەرامبەر ئیماندارێك کە بیست تایبەتمەندی بێ تاوانی هەبێت تەنها لەبەر تاکە تایبەتمەندییەك کە بۆ تۆ زیانبەخشە و بە دڵت نی یە، وەك ئەوە وەهایە کە تۆ بە شێوەیەکی مەعنەویی هەوڵی سوتاندن و ڕوخاندنی ئەو جەستەیە بدەیت کە لە حوکمی خانویەکی مەعنەویی خوا دایە، ئەمەش وەك کاری ئەو پیاوە ستەمێکی بێ بەزەییانەیە، بەڵێ دوژمنایەتی کردن بەرامبەر ئەو ئیماندارەی کەبەشێوەیەکی دڵسۆزانە ئیمانی هێناوە نەك تەنها لە ڕووی حەقیقەتەوە بەڵکو لە ڕووی حیکمەتیشەوە ستەمە. لەبەر ئەوەی ئاشکرایە دوژمنایەتیی و خۆشەویستی، وەك نور و تاریکی دژی یەکترن هەردووکیان بەمانای ڕاستەقینەی خۆیان لەیەك شوێندا جێیان نابێتەوە.

بەڵێ ئیماندار براکەی خۆش دەوێت و دەبێت خۆشی بوێت، بەڵام لە بەرامبەر خراپەکانیدا تەنها بەزەیی پێدا دێتەوە، هەوڵ دەدات بە لوتفەوە دوور لەهەرجۆرە شکاندن و سوکایەتییەك بۆی ڕاست بکاتەوە. وە هونەری ڕاستەقینە ئەوەیە کاتێك مرۆڤ برایەکی لە بارودۆخێکی ناخۆشدا دەبینێت لێی دوور نەکەوێتەوە بەڵکو هەوڵ بدات پەیوەندی برایانەی لەگەڵدا زیاتر بەهێز بکات و هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە. ئەم هەڵسوکەوتە حاڵی باوەڕدارێك نیشان دەدات کە دامەزراوە و دادپەروەریی کردووەتە دروشمی خۆی.[1] هەر بۆیە پێغەمبەری خوا قەدەغەی کردووە کە دوو موسوڵمان زیاد لە سێ ڕۆژ لە یەکتر زویر بن.[2] مامۆستا بەدیعوززەمان کە لە بەرهەمەکانیدا. هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووە ئەو برایەتیە ڕاستەقینەیەی کە پێویست دەکات لەنێو ئیمانداراندا هەبێت جێگەی ڕق و کینە و دوژمنایەتی بگرێتەوە. هەر لەم ڕوانگەوە ئاماژە بە بوونی زۆری ژمارەی ئەو خاڵە هاوبەشانە دەکات کە لەنێو ئیمانداراندا هەن ئەم تایبەتمەندیە هاوبەشانە بە هۆکاری زۆر

---

١ سەعیدی نورسی، مەکتوبات

٢ بخاري، الأدب، ٥٧؛ مسلم، البر ،٢٣

گرنگ دادەنرێن بۆ توندو تۆڵ کردنەوەی پەیوەندی نێوانیان.

بۆ نموونە: دوژمنایەتی کردنی ئیماندارێك کەخاوەنی ڕەفتاری موسوڵمانانەیە لای مامۆستا وەکو ئەوە وایە بەردی بچووك و بێ ئەرزش لە کەعبە یاخود لە شاخی ئوحود بەگرنگتر و گەورەتر بزانرێت . بەو واتایەی: یەکێتی و یەکبوونی ئیمان بێگومان یەکێتی دڵەکانی دەوێت، یەکێتی ئیمانیش، یەکێتی کۆمەڵایەتی دەوێت . پێویستە خۆشەویستی ومەحەببەت بەرامبەر ئیمانداران بنوێنرێت، لەبەر ئەوەی ئیماندار کە لە گەردوون دەڕوانێت بە لانکەی برایەتی و هاریکاری دەیبینێت.[1]

لە ناوچەیەکدا کە کۆمەڵێك مرۆڤ پێکەوە بژین، خۆبەخۆ هەست بە کەشێکی برایانە دەکەیت، ئەمە لەکاتێکدا ئەو نورو هەستەی کە ئیمان دەیبەخشێت پێمان دەڵێت کە بە پێی ژمارەی ناوەکانی خوای گەورە پەیوەندی یەکێتی و برایەتی لەنێو ئیمانداراندا هەیە بۆ نمونە تۆ و براکەت بەدیهێنەری هەردوکتان هەر یەکە، خاوەنتان یەکە، پەرستراوتان یەکە، ڕۆزیدەرتان یەکە، یەك، یەك، یەك، یەك . . . . هەتا دەگاتە هەزار، هەم پێغەمبەرەکەتان یەکە، هەم ئاینتان یەکە، هەم قیبلەتان یەکە، ئەم هەموو یەکە هەتا دەگاتە سەد، یەك یەك، پاشان گوندتان یەکە، وڵاتتان یەکە وە پاشانیش نیشتیمانتان هەر یەکە. . . ئەم هەموو یەکە هەتا دەگاتە دە ، لەگەڵ ئەوەی یەکێتی ئەم هەموو یەکە کە داخوازی گونجان و خۆشەویستی و برایەتین لەشێوەی زنجیرێکی مەعنەویدا کە گەردون و هەسارەکان بەیەکەوە پەیوەست دەکات، پەسەند کردنی قین و دوژمنایەتی و جودایی ولێك تێنەگەیشتن کە لە شێوەی تۆڕی جاڵجاڵۆکەدان لەبێ ئەرزشیاندا و هەڵگیرساندنی دوژمنایەتی و قین بەرامبەر بە ئیماندار ئەگەر دڵت نەمردبێت و ئەقڵت خامۆش نەبوویێت تێ دەگەیت چەندە بێ ڕێزییەکی گەورەیە بەرامبەر بەو کەسەی ئەم یەکێتییەی لە نێوانتاندا بەرپاکردووە، هەروەها تێدەگەین چەندە سوکایەتی پێکردنێکی گەورەیە

[1] سەعیدی نورسی، مەکتوبات

بەرامبەر بە هۆکارەکانی خۆشەویستی.

مامۆستا بەدیعوززەمان کە بەم وتانە هانی ئیمانداران دەدات و قەناعەتیشیان پێ دەکات تا لە ئیماندا یەکێتیان هەبێت و یەکبگرن، هەروەها ئاماژەش بەوە دەدات کە لەبەر ئەو هەموو خاڵە هاوبەشانەی کە لە نێوان موسوڵماناندا هەیە پێویستە بە تەواوەتی دووربکەونەوە لەهەموو ئەو هۆکارانەی کە جودایی دەهێننە ئاراوە.

هەروەك لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوەدا بەڕوونی دیارە، ئەو تەنها بەوەوە نەوەستاوە کە هانی بەرەو پێشچوونی برایەتی ئیسلامی بدات، بەڵکو لە کاتی سەرهەڵدانی ڕەفتارێك کە زیان بە یەکێتی و برایەتی ئیمانی دەگەیەنێت، ئەو یەکسەر هەوڵی چارەسەری داوە و لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بوونەتە هۆکاری ئەمە ململانێی کردوە، ئەم ڕەفتارەی ئەو پێمان دەڵێت، لە پێناوی پاراستنی ئەو برایەتیە ئیمانیەی کە لەسەر بناغەیەکی بەهێز دامەزراوە ئەگەر پێویستی کرد بەوپەڕی ئازایەتیەوە هەڵدەستێتە سەر پێ و ئەوەی پێویست بوو دەیکات.

لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەسورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێت : هەمووتان پشت بەهێزو توانای خوا ببەستن و دەست بە قورئانەوە بگرن و لە نێوان خۆتان ناکۆك مەبن و بیر لە نیعمەتی خوای گەورە بکەنەوە لەسەرتان کە چۆن سەردەمێك دوژمنی یەکتری بوون، کەچی خوا بەهۆی ئەم ئاینەوە دڵتانی لە یەك نزیك کردەوە و کردنی بە برا.

دەستگرتن بەو پەتەوە واتا دەستگرتن بە واتاکانی قورئانەوە کە ئەمەش سیفەتی ئیمانداری تەواوە. بەڵێ قورئان پەتێکی خوایی وەهایە کە عەرش و فەرشی پێکەوە بەستووە . موسوڵمانان بانگ دەکات بۆ ئەوەی دڵسۆزانە دەرك بەوە بکەن کە دووبارە ڕووناکبوونەوەی ئەم چەرخەش تەنها بە پەیوەست بوون بە قورئان و

بانگەوازکردنی خەڵکان بۆی دەبێت بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە.

مامۆستا بەدیعوززەمان نوورسی، وەکو ئەنجامێکی سروشتیی لە ئامێزگرتنی ڕاستەقینەی قورئان، هەموو تەمەنی بۆ خزمەت کردنی قورئان وەقف کردبوو کەسایەتی خۆی لە پێناو ئیسلامدا بەخت کرد بۆ ئەوەی برایەتی ئیمانی توشی جودایی و کەوتن نەبێت، چەندەها ناڕەحەتی کێشاوە، بەڵێ هەمیشە هاواری ئەوەی دەکرد کە ئامانجی ڕاستەقینە بریتییە لە یەکگرتن لە چوارچێوەی برایەتی ئیسلامدا. بۆ تێگەیشتن لە بۆچوونەکانی مامۆستا سەبارەت بە چەمکی (برایەتی) بە شێوەیەکی تێروتەسەل، ئەوا تەنها بە تێگەیشتن لە ژیانی دەبێت کە چەسپێنەری وتەکانیەتی. مامۆستا سەعیدی نوورسی لە هەموو ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی ژیانیدا هەمیشە بە هەڵوێستی دامەزراویەوە و بە شێوەیەکی کامڵانە ڕەفتاری کردووە. ئەم تاکە ڕستەیە بە تەنها باشترین بەڵگەی دیارە بۆ سەلماندنی قسەکانمان کە دەڵێت ئەگەر هەزار شەرەفیشم هەبێت هەمووی دەکەمە قوربانی برایەتی و خۆشەویستی نێوان براکانم.[1]

کەسێك کە بەرژەوەندی برای ئیمانی دەدات بەسەر خۆیدا ئەو جۆرە ئامۆژگاریکردنەی ئەو دەبێت وەك خەم و ئازارەکانی باوکێکی دڵسۆز تەماشا بکرێت و پێویست دەکات وەڵامی بانگەوازەکەی بدرێتەوە. ئەو دەڵێت: ئەی براکانی ئاخیرەتم، ئەی براکانم لە خزمەتی قورئانلهەروەك دەشزانن بشزانن :کە لەم دونیایەدا، بەتایبەتی لەکارو کردەوەکانی ئاخیرەتدا گرنگترین بنچینە و، گەورەترین هێز و پەسەندترین شەفاعەت و بەهێزترین خاڵی پشت پێ بەستن و کورتترین ڕێگای ڕاستی و پەسەندترین دوعای مەعنەویی و بەڕێزترین خەسڵەت و، پاکترین بەندایەتی ئیخلاسە.[2]

١ سەعیدی نورسی، مەکتوبات
٢سەعیدی نورسی، بریسکەکان

لەبەر ئەوەی کە ئیخلاس یارمەتی ئەوە دەدات کە مرۆڤ لە نرخی برایەتی تێ بگات، لەبەر خاتری هۆکاری بچوك ناکۆکی دروست نەکات و بە هۆی گەورەترین دوژمنی ئیمان کە کوفرە توشی جودایی نەبێت و دەست لە دەستی یەکتر و هەموو بۆ یەك مەبەست هەوڵ بدەن تا پارچە پارچە نەبن، بڕوانن ئەم ئایەتە چەندە جوانە هەر شیاوی ئەوەیە کە مرۆڤ بە عیشقەوە گوێی بۆ ڕادێرێت و بیخاتە ژیانی کردارییەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: "گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن و ئازاری یەکتری مەدەن لەبەرئەوەی ئەگەر وابکەن ئەوا ترس زاڵ دەبێت بەسەرتاندا و هێزو بازوتان لە دەست دەچێت، ئارامبگرن، چونکە خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە"(سورەتی الأنفال ٤٦).

بەدیعوززەمان لە شیکردنەوەی ئایەتەکەدا، بەهەستیارییەوە ڕەفتار دەکات و بانگهێشتی ئیمانداران دەکات بۆ بنیاتنانی برایەتیەکی بەهێزو دەفەرموێت: ڕەخنە لە برایانی نێو ئەم خزمەتە قورئانیەتان مەگرن و هەروەها دەماری ئاواتخواستنی ئەوانیش بەهۆی نیشاندانی فەزیلەت و شکۆمەندی خۆتانەوە مەبزوێنن . هەروەك چۆن مرۆڤ دەستێکی سکاڵا لە دەستەکەی تری ناکات، چاویشی ڕەخنە لە چاوەکەی تری ناگرێت، زمانی سکاڵا لە دەست و گوێی ناکات، دڵی عەیب و کەمو کورییەکانی ڕۆح نالێت، بەڵکو کەم و کورییەکانی یەکتری پڕ دەکەنەوە و یەکتری تەواو دەکەن، کەموکوڕی یەکتری دادەپۆشن و پێویستی یەکتری دابین دەکەن و هاریکاری یەکتری دەکەن لە ئەرکەکانیاندا، ئەگەر وانەبێ ژیانی ئەو مرۆڤە کۆتایی پێ دێت، ڕۆحی لە دەست دەدات وجەستەشی پارچە پارچە دەبێت، ئێمەش دەبێت بەم شێوەیە بین لەگەڵ یەکتری لەبەردەوامی قسەکانیدا نهێنی ئەوەش ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: "

نهێنی ئەم نهێنیە ئەوەیە کە هەموو تاکێك کە بە شێوەیەکی ڕاست و ڕاستگۆیانە پەیوەندیەکی برایانە دروست دەکات دەتوانێت بە چاوی براکانی تری ببینێت، بەگوێی

ئەوانیش ببیستێت، بەم شێوەیە دە پیاوی یەکگرتووی ڕاستەقینە هەریەکەیان بە بیست چاو دەبینن و بە دە عەقڵ بیر دەکەنەوە، بە بیست گوێ دەبیستن و، بە بیست دەست هەوڵ دەدەن و نرخ و هێزی تایبەت بە خۆیان هەیە.[1] ئەو پەیامەی کە ئەم بانگەوازە دەیدات بە گوێماندا ئەوەیە کە پێکەوە بوونی موسوڵمانان گرنگ نی یە ئەگەر بە پێکەوە بونیان هەر ئاپۆرە دروست بکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە دڵەکانیان پەیوەستی یەکدی بووبێت. بوونی کۆمەڵگەی موسوڵمانان بە کۆمەڵگەیەکی شیرازە و پتە و تەندروست پەیوەندییەکی ڕاستەوانەی هەیە بەو تابلۆیەوە کە موسوڵمانێکی ئەمسەری دونیا دڕکێك بە پێیدا دەچێت موسوڵمانانی ئەوسەری دونیا دڵیان بهەژێت و ئازاریان پێبگات.

## باشترین مرۆڤ، ئەو کەسەیە بتوانێت تەنانەت لەگەڵ مارەکوبراکانیشدا هاوڕێیەتی بکات و بژێت

ئەو برایانەی کە لەم بازنە پیرۆزەدان زۆر گرنگە بەشێوەیەکی لەگەڵ یەکتری گونجاو کار بکەن بەپێی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت : "وجعلنا بعضکم لبعض فتنه"، (الفرقان، ۲۰) هەروەها دەفەرموێت (لیبلوا بعضکم ببعض ) (محمد،٤)، واتا حیکمەتی خوا وەهایە بچنە ژێر تاقیکردنەوە، وە بە گژی یەکتریدا بچن تا بە چاکی ئیمانداران دەربکەون و بناسرێن، کەواتە دەکرێت لە ژێر رۆشنایی بانگەواز و لەخۆبوردنەوە بوترێت کە ئێمە هەروەك چۆن لەگەڵ ئەو کەسانەی تردا تاقیدەکرێنەوە بەهەمان شێوەش لە نێوان خۆشماندا بە یەکدی تاقیدەکرێینەوە بێگومان ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە پاداشت و خێرێکی جیاوازتری تێدایە بۆمان.

---

[1] سەعیدی نورسی، بریسکەکان

لەسەر بنچینەی ئەم خاڵانە دەتوانم بڵێم :بەڕای من ڕێکوپێکترین کەس لەڕووی ڕەوشتەوە ئەو کەسەیە کە بتوانێت لەگەڵ خراپترین مرۆڤیشدا لە چوارچێوەی قورئان و سوننەتدا بگونجێت و بتوانێت بەرامبەر ئەوانیش هەڵسوکەوتی جوان بنوێنێت. پێشتریش کە لە هەمان بابەت دوابووم وتم: باشترین کەس ئەوانەن کە تەنانەت لەگەڵ کوبراکانیشدا بتوانن هاوڕێیەتی بکەن، تکاتان لێ دەکەم ئاخر ئێمە لە یۆگیەکان نزمترین وا لەکاتێکدا ئەوان دەتوانن لەگەڵ مارە کوبراکاندا هاوڕێیاتی دروست بکەن بەڵام ئێمە لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێین! ئەمە لە کاتێکدا ئێمە هەموومان لە دەوری بیرۆکەیەکی پیرۆزدا کۆبوینەتەوە.

ئێمە کە ناچارین و دەبێت بە ئاکارەکانی پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيهِ أَلفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) خۆمان بارگاویی بکەین. ئەگەر هێشتا هەر لەوەدا بین کە بڵێین من لەگەڵ فلان یان فیساردا لەبەر ئەم ڕەوشتەی یان ئەو سیفەتەی ناگونجێم و هەست بە نائاسودەیی دەکەم، ئەوا دەبێت ئاکارەکانمان لە نەخۆشخانەو چارەسەرگای ویژداندا چارەسەر بکەین دیسانەوە بە بڕوای من ئەو کەسانەی کە دڵیان پەیوەستی ئەم خزمەتە کردووە ئەگەر بێت و لەگەڵ یەکتریدا ڕێك نەکەون نەگونجێن ئەوە یان لە ڕووی ژیرییەوە نەخۆشن یان ئەوانە چەند خۆپەرستێکن کە بە هاوێنەی ڕۆحی خۆیان بڕیار لەسەر کەسانی تر دەدەن. کەوابێ بۆ خاتری خوای گەورە وەرن لە کاتێکدا کە پێویستی بە کەسانی هەڵگری ئەم پەیامە هەیە لە هەموو ئاستێکدا، با چیدی بە دوای هەڵەی هاوڕێیانماندا نەگەڕێین کە ئێمە هەموومان لە هەمان ڕێگەدا پێکەوە ڕێبوارین. با لە دژی هیچ کەسێك قسە نەکەین و ڕێگەش بەو کارە نەدەین.

لە پێشوودا هەر وەك چۆن چەندین جار باسکراوە کە دەبێت لە بەرامبەر نەفسی خۆمان داواکار و لە بەرامبەر کەسانی دیکەدا وەکو داکۆکیکەر هەڵسوکەت بکەین. لەسەر ئەم بنچینەیە با هەموومان بە نەفسی خۆمان بڵێین تۆ خیانەتکاری

و کەوتوویتەتە داوی بێ ئاگاییەوە، هێندە خۆپەرستیت کە ڕۆژانە هەتا ٧ کاژێر نەخەویت لە ماڵ دەرناچیت، تۆ دیلی لاشەت و کۆیلەی جەستەتیت. بەڵێ هەردەم دەبێت وا بڵێین و هەمیشە کەسانی دیکەش وەکو فریشتە ببینین. خوای گەورە دڵمان نەرم بکات و سەرکەوتوومان بکات لە پەسەند کردنی برایانمان و هەموو کەسێکی تریش.[١]

١ موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن، لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر

# ٧- عیشق و شەوق، خۆنوێکردنەوە، دامەزراوی و بڕیارنەگۆڕی

## عیشق و شەوق و خۆنوێکردنەوە

یەکێك لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی مرۆڤی خزمەتکار بریتیە لەوەی پێش دووچاربوونی بە خووپێوەگرتن وتەمەڵی و ئولفەت خۆی نوێبکاتەوە، چونکە مانەوە بە زیندوویی یەکێکە لە تایبەتمەندییە هەرە پێشینەکانی مرۆڤی خزمەت، هەرکەسێکیش کە خزمەت دەکات دەبێت هەموو ساتێك خۆی نوێ بکاتەوە و لە جیهانی ڕۆحیشیدا بەردەوام بچێتە نێو زیندووبوونەوەیەکی نوێوە، لەبەرئەوەی بوژاندنەوەی ڕۆح و بە زیندوویی ڕاگرتنی، کۆڵەکەی بەردەوامییە لەسەر ئەم ڕێیە.

بۆ ئەوەی ئەم نوێبوونەوانە لە ئیمانداردا ببێتە بەشێك لە کەسێتی و پارچەیەك لە سروشتی، پێویستە بە بەردەوامی ئیمانەکەی قووڵ بکاتەوە و بە خۆڕازاندنەوە بەو کار و کۆششانەی کە لە خولگەی خزمەتدان، ئەم نوێبوونەوەیە لە ژیانیدا ڕەنگ پێبداتەوە. لە ڕاستیدا خوای گەورەش لە قورئانی کەریمدا لە بابەتی خزمەتکردنی ئایندا فەرموویەتی کە بڕواداران بە لێبڕاوی و بە شەوقێکی بێ سنوورەوە یەکدی گەرم دەکەنەوە. (النساء ٤/٨٤) سەروەرمان (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)

ئامۆژگاری حەزرەتی ئەبوزەر دەکات تا هەموو ساتێك بە عیشق و شەوقەوە بمێنێتەوە و زیندوێتی ڕۆحی ڕابگرێت و دەفەرموێت:

جارێکی تر کەشتیەکەت نوێ بکەرەوە و چاوێکی پێدا بخشێنە لەبەرئەوەی ئەو دەریایەی پێیدا تێدەپەڕیت زۆر قووڵە. زەخیرەی چاك بخە، بێگومان ڕێبوارییەکە زۆر دوور و درێژە. کۆڵ و بارەکەی سەر پشتت سوك بکە، لەبەرئەوەی ئەو هەورازەی پێیدا سەردەکەویت زۆر سەختە. لە کردەوەکانتدا بە ئیخلاس بە، لەبەرئەوەی پەروەردگار هەموو شتێك دەبینێت و چاودێری دەکات و بە هەموو کردەوەیەك ئاگادارە. پێغەمبەری سەروەرمان بەم فەرمایشتە جوانانەی کە ئاڕاستەی حەزرەتی ئەبوزەری دەکات پەیامێك بە ئێمەش دەدات: گەر ئێوە بە هەمان ئەو باوەڕەی کە لە سەرەتاوە هێناوتانە ڕازی بن و هەر بەوەندەوە بمێننەوە، ئەوا ڕووداوەکان و گوزەری زەمانە ئەوەندە دووچاری ناخۆشی و ناڕەحەتیتان دەکات کە لە بەرامبەریاندا هەر زوو دەڕوخێن و تێکدەشکێن. لەم ڕێیەدا گەر بەردەوام ئەو کەشتییە چاك نەکەنەوە کە لە نێویدان، ناتوانن بگەنە کەناری سەلامەتی.

گەر لە دەریای ئەم دونیایەدا لەنێو شەپۆلە جیاوازە مەترسیدارەکاندا، کەشتیەکەتان لە بەرامبەر دوژمنە جۆراوجۆرەکانی وەك شەیتان و نەفس و نوێنەرەکانی ئەواندا کە هەندێك لە مرۆڤەکانن، پتەو توندوتۆڵ نەبێت ئەوا ڕەنگە توشی کۆسپێك ببێت و نوقم ببێت. بەڵێ پیغەمبەری ئازیز پێمان ڕادەگەیەنێت کە پێویستە هەردەم خۆمان نوێ بکەینەوە.

# عیشق و شەوقی حەزرەتی خوبەیب بۆ خزمەتکردن ئەسرینی لە چاوەکان دەهێنا

پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) داوای لە هاوەڵانی دەکرد کە لە ژێر هەر مەرج و دۆخێکدا بێت خزمەتی ئاینەکەیان بکەن، هاوەڵانی ئازیزیشمان هەر بەو شێوەیەیان دەکرد. هەمیشە بە جۆش و خرۆشەوە سوودیان لە هەموو هەلێك وەردەگرت و هەوڵیان دەدا بچنە نێو جیهانی دڵی مرۆڤەکانەوە. ئەمەش نموونەیەکە:

پێغەمبەری ئازیزمان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) حەزرەتی خوبەیبی وەك مامۆستایەك بۆ گەیاندنی ئاینەکەمان لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکدا دەنێرێت، بەڵام خوبەیب لەلایەن موشریکەکانەوە قۆڵبەست دەکرێت و بەرەو مەککە دەیبەن. لە پاش چەندەها ڕۆژی چاوەڕوانی نێو زیندان، بڕیاری لە خاچدانی بۆ دەردەکەن و لە نێو ئەو دیمەنە جەنجاڵانەی مەککەدا دەیخەنە سەر تەختەی خاچ.

خوبەیب خەمبار و دڵتەنگ بوو، چونکە دەرفەتی بەجێهێنانی ئەو ئەرکی بانگەوازەی دەست نەکەوتبوو کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێی سپاردبوو، وا ئێستاش دەست و دەمی گیراوە و بەرەو سێدارە دەبرێت.

بە بێ وەستان چاوی بە چواردەوری خۆیدا دەگێڕا، دەیویست کەسێکی دەست بکەوێت کە ئاینەکەی پێ بگەیەنێت. بەڵام لەو مرۆڤانەی ئەوێدا کەسی بەدی نەدەکرد. ئەگەرچی لە نێویاندا هاوەڵانی داهاتووش هەبوون بەڵام دیارە تا ئەو ڕۆژە چاوی دڵیان نەکرابووەوە.

موشریکەکانی مەککە بە خوبەیبیان وت تا دوا داواکاری خۆی بڵێت پێش مردنی، ئەویش داوای کرد ڕێگەی بدەن دوو ڕکات نوێژ بەجێبهێنێت پاش ئەوەی ڕێیاندا

حەزرەتی خوبەیب دوو ڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: " گەر لەبەرئەوە نەبووایە بڵێن لە ترسی مردن نوێژەکەی درێژدەکاتەوە، ئەوا زۆر ئاواتەخوازبووم ئەم کۆتا نوێژەم درێژ بکەمەوە "پاشان بەرەو تەختەی خاچیان برد و ئیدی دوا ساتی چاوەڕوانکراو هات، کەچی هێشتا چاوەکانی خوبەیب بە چواردەورەکەیدا دەگەڕا، بەڵام بۆ کەسێك نەدەگەڕا کە لە مردن ڕزگاری بکات، بەڵکو بە خەیاڵ و ئەندێشەی ئەوەی" ئایا دەتوانم لە دوا ساتدا ژیانی ئەبەدیی کەسێك ڕزگار بکەم؟" لە چواردەوری ڕادەما.

لەو ساتەدا هەلێکی چاوەڕواننەکراو هاتە پێش. یەکێك لە پێشەنگانی موشریکەکانی مەککە پرسیارێکی لێ کرد، ڕووکەشی پرسیارەکە هیچ گرنگ نەبوو، گرنگ ئەو وەڵامە پڕحیکمەتەی ئەو بوو، زۆردڵخۆش بوو بەم پرسیارە چونکە لەوێدا وەڵامێکی پڕ حیکمەتی ئەوانی دەدایەوە و لەم دوا ساتەشدا فەرمانبەریی بانگەواز و تەبلیغەکەیی بەجێدەهێنا. پریشکی بیرۆکەیەك کە لەوێدا فڕێی دەدا کێ دەیزانی لە داهاتوودا ئاگری ئیمانی لە دڵی چەند کەسدا هەڵدەگیرساند پرسیارەکە ئەمە بوو:

ئەی خوبەیب ئایا ئێستا دەتویست بە مەرجی ڕزگاربوونی خۆت موحەمەد لێرەدا لە جیاتی تۆ لە خاچ بدرایە؟

بێگومان ئەمە پرسیارێك نییە لە ئیماندارێك بکرێت بە تایبەتی لە کەسێکی وەك خوبەیب، بەڵام ئەو بەهۆی ئەم پرسیارەوە هەوڵی دەدا دوا هەل بقۆزێتەوە و ئامانجەکەی بپێکێ، هەستەکانی ئاوێتەبوون لە خەم و خۆشی، بێگومان لەم بارەدا هەوڵیدەدا شتێك بڵێت، وە دەشیزانی کە دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارەی بە وێنەی کۆتا نوێژی کورت بێت، دەبوو ژیانێك بە تەواویی لە نێو وتەیەکی یەك ڕستەییدا جێ بکاتەوە. دەبوو بەشێوەیەکی وەها بدوێت کە مێژوو لاڵ ببێت و گوێ لەو ڕادێرێت، چەرخی زەمانیش قسەکانی ئەو بکاتە گوارەیەك و لە گوێی نەوەکانی بنێت، بەڵێ

دەبوو ئەوەی دەیلێت بەم جۆرەی بڵێت و بەم جۆرە سود لەم دوا دەرفەتە وەربگرێت:

- نەوەڵڵا، نەك لە پای ڕزگار بوونی من ئەو لە خاچ بدرێت، بەڵكو دڵم ئۆقرە ناگرێت لە بەرامبەر ڕزگاربوونمدا ئێستا لە مەدینەدا تەنانەت دڕكێكیش بە قاچی ئەودا بچێت.[1]

پاش ئەوەی خوبەیب (ڕەزای خوای لێبێت) ئەمانەی فەرموو، دیار بوو ئەو خەمی تەبلیغەی پێش كەمێك هەیبوو هەمووی ڕەوییەوە. ئیدی وەك پەپوولە پایزەیەك هەستی بە ڕۆحسووكی دەكرد. وەك كۆتا فەرمانبەریی خۆی سەلامی جودایی بۆ پێغەمبەری خوا دەنارد و بەرەو بەهەشت كەوتە ڕێ. ئەو تەنانەت بیری لەوەش نەدەكردەوە كە ئایا سەلامەكەی ئەو لە مەككەوە بەرەو مەدینە دەڕوات یان نا. چونكە ئەو كەسەی سەلامەكەی بۆ دەنارد پێغەمبەری نازداری خوابوو.

كۆتا وتەی لەسەر تەختەی لە خاچدان بریتی بوو لە " السلام علیكم یا رسول اللهِ " پێغەمبەری خوا لە مەدینە لەگەڵ هاوەڵەكانی دانیشتبوو و لە پڕ هەستایە سەرپێ و فەرمووی: "وعلیك السلام ئەی خوبەیب."

بەڵێ پێویستە هەموو خزمەتگوزارێكی قورئان بۆ پاراستنی عیشق و شەوقەكەی ئاسۆی حەزرەتی خوبەیب بەدەست بێنێت تا مافی میراتگربوونی زەوی بدات. [2]

## خۆنوێكردنەوە بنچینەی سەرەكی بەردەوامبوونمانە

ئەوانەی لە كاتی پێویستدا ناتوانن خۆیان نوێ بكەنەوە، زوو بێت یان درەنگ هەرچەندە بەهێزیش بن دواجار مەحكومی خامۆشی دەبن. هەموو شتێك كە خۆی نوێ دەكاتەوە بە زیندوویی دەمێنێتەوە و بوونی خۆی بەردەوام دەكات. ئەو كاتەش

١ ابن الكثیر، البدایة والنهایة، ٦٥/٤
٢ موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن، خولگەی بانگەواز، ٢٠٢

که له نوێبوونەوە دەوەستێت، بە وێنەی جەستەیەکی گیانکێشراو بەرەو ڕزین دەڕوات و بێسوود بەهەدەردەچێت. خۆ نوێکردنەوە نابێت لەگەڵ شەیدابوون بە تازەگەریی و ئالوودەیی مۆدێلبازیدا تێکەڵ بکرێت. یەکێك لەمانە؛ واتە شەیدایی تازەگەریی و خولیایی مۆدێلات کە بریتییە لە سواخدانی ناتەواوییەکان بە خۆڵکردنە چاوی ئەو کۆمەڵانەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە مایەپووچبوون و ئەوی دیشیان کە خۆ نوێکردنەوەی ڕاستەقینەیە، بریتییە لە بزاوتی بەخشینی نەمری بە کۆمەڵگا لەڕێی پێدانی ئەو (ئاوی حەیات)ەی کە لە چاووگی ( حەزرەتی خضر)ەوە هێنراوە.

نوێبوونەوەی ڕاستەقینە واتە گەیشتن بە کەش و هەوایەکی نوێتر و سازگارتری تێفکرین، بە پێکهێنانی سەرجەم ئەو بەهایانەی کە لە ڕابردووەوە بە پاڵفتەیی لە شەقەی باڵیان داوە و هاتوون و گەیشتوون بە دەمی ئێستا و ئاوێتەکردنیان لەگەڵ شەونماوی بیرۆکە و عیرفانی ئێستادا بە پارێزگاری کردن لە پاراویی نێو ڕەگ و تۆوەکانیان. هەڵسەنگاندنی نوێیەتی بە قەتیسکردنی لە دیمەنی چاکەت و کۆتێکی گرانبەها و قژی بریقەداری ستایلیدا نیشانەی هەڵخەڵەتاوییەکی ئاشکرایە، هەوڵدانیش بۆ نیشاندانی بەو جۆرە بریتییە لە چاوبەستی و تەڵەکەبازی.

سوودوەرگرتن بە باشترین شێوە لە بەرەو پێشچوون و گەشەسەندنی زانست و ئەو ئاسانکارییانەی کە تەکنەلۆژیا ئامادەی کردوون و خستوونییەتە بەردەستمان و وەرچەرخاندنی زوو زووی هاوێنەکانی دەستمان بەرەو دڵمان و سەرلەبەر پشکنینی ویژدان و بیر و خەیاڵمان و هەر ڕۆژە زیاد کردنی شتانێکی نوێ بۆ نێو شانەی هەنگوینی عیرفانی دڵمان و هەر ساتەو بۆ چەند جارێك تێپەڕکردنی سەرجەم بونەوەران لە ئاوێژەی ڕۆحەوە و ئاودانی دەماخ، پێیان دەوترێ وێبوونەوەی ڕاستەقینە.[1]

---

١ موحەممەد فەتحوڵڵا گولەن، گۆڤاری سیزنتی، نیسانی ١٩٨٢

## دامەزراوی و نەسرەوتن

لە فەرهەنگە زمانەوانییەکاندا دامەزراوی واتای سووربوون لە ویست و مەبەست، بڕیاردان و ئارامگرتن و نەسرەوتن لەسەر ئەو بڕیاردانە دێت.

دامەزراوی و نەسرەوتن یەکێکن لە هەرە تایبەتمەندییە دیارەکانی بەندە خۆشەویستەکان. کاتێك کە تاکە ئامانجی ئیماندارێك دەبێتە خزمەتکردن و بەدەستەێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، پێشوەخت دەبێت خۆی بۆ دامەزراوی و سووربوون لەسەر ئەو کارە ئامادە کردبێت.

دیارە گەورەترین سەرچاوەی دامەزراویش ئیمانە، خوای گەورە هیچ جۆرە بارگرانی و بەڵایەك بۆ هیچ یەکێك لە بەندەکانی دروست ناکات، کاتێك ئەو بەندە شانبەشانی ئیمان بە قەدەر، ئیمانی بە تەوەککول و عینایەتی ئیلاهیش هێنابێت. بە عیشق و شەوقێکی قووڵەوە بەردەوام هەوڵی سووربوون و بەکارهێنانی دەرفەتەکان دەدات و بەردەوام پێشبڕکێ لە کاری چاکدا دەکات، چونکە باش دەزانێت کە خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو هێز و توانایەك تەنها خوای گەورە خۆیەتی.

هیچ بارگرانی و کێشەیەك ناتوانێت بەندەی ڕاستەقینە لە ڕێگەی ڕاست دوور بخاتەوە و بیوەستێنێت، زاتی حەق (جل جلاله) لە قورئانی پیرۆزدا بەم جۆرە پەسن و سەنای ئەم جۆرە لە مرۆڤی ئیماندار دەکات و دەفەرموێ (لەناو ئیمانداراندا مەردگەلێك هەن، ڕاستگۆ و بە وەفابوون لەو گفتەی بە خوایان دابوو، هەیانە بەو عەهد و پەیمانەوە گیانیان سپاردووە و شەهید بوون، هەشیانە لە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەدان تا لە ڕێی خوادا شەهید بکرێن، ئەوان سووربوون لەسەر پەیمانەکانیان و هەرگیز نەیانگۆڕی) (الأحزاب ٢٣\٣٣). ئەمە پەسن و سەنای ئەو مەردانەن کە تا دوا هەناسە و لێدانی دڵیان لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو ڕەزامەندییە گەورەیەدا دامەزراوی و نەسرەوتنیان کردووەتە دروشم.

دامەزراوی و نەسرەوتن واتە گرتنەبەری ڕێگاکانی سەرکەوتن، نەکەوتنە دانە و داوی بێئومێدی، ئارامگرتن بەرامبەر هەموو جۆرە ناڕەحەتی و دژواری و تەنگوچەڵەمەیەك کە لەم ڕێگایەدا دێنە پێش، ماندوونەبوون، کۆڵنەدان و باوەڕبوون بەوەی کە بە یارمەتی و کۆمەکی پەروەردەگار دەتوانم ئەم کارە بکەم". مەگەر ئیکسیری گەیاندنی مرۆڤ بە سەرکەوتن دامەزراوی و نەسرەوتن نییە؟.

## دامەزراوی و نەسرەوتنی حەزرەتی نوح

هەر لە حەزرەتی نوحەوە تا حەزرەتی ئیبراهیم، هەر لە حەزرەتی موساوە تا پێغەمبەری سەروەرمان، هەموو پێغەمبەرەکان بۆ ئەوەی لە تەبلیغەکەیاندا سەرکەوتووبن بەوپەڕی دامەزراوی و سووربوونەوە ئەرکی خۆیان ڕاپەڕاندووە، ئەوان لە دامەزراویی نێو ئەم کۆششەیاندا بوونەتە سەرمەشق بۆ ئێمە.

بۆ نمونە حەزرەتی نوح (علیه سلام) لە پاش حەزرەتی ئادەم یەکەم پێغەمبەرە کە ئەرکی پێغەمبەرایەتی پێ سپێردراوە.[1]

لە پاش حەزرەتی ئادەم مرۆڤەکان ئیدی پەروەردگاری ڕاستەقینەی خۆیان لە یادکردبوو و دەستیان کردبوو بە پەرستنی ئەستێرەکانی ئاسمان. تەنانەت بۆ ئەوەی کە ئەم ئەستێرانە شوێن گرەوەیان هەبێت، بتیان دروست کردبوو و ناوی ئەستێرەکانی ئاسمانیان لێنابوو. کاتێك حەزرەتی نوح وەك پێغەمبەر دەنێردرێت بۆ گەلەکەی، بۆیان ڕووندەکاتەوە کە ئەوان لە ڕێیەکی هەڵەدان و پێویستە بەندایەتی خوای گەورە بکەن وکاتێکیش ئیمانیان هێنا، خوای گەورە لە گوناهەکانیان خۆش دەبێت.[2]

حەزرەتی نوح بۆ ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵ بە دامەزراوی و بڕیارداریيەکی

---

١ بخاری، الأنبیاء، ٣
٢ نوح، ٢-٤

زۆر سەرسوڕهێنەرانەوە ڕاستیەکانی بە گەلەکەی دەگەیاند، بەڵام گەلەکەی لە هەموو جارێکدا گاڵتەیان پێدەکرد وهەوڵیان دەدا بێدەنگی بکەن[1]، تا ئەوەی نائومێد دەبێت و داوا لە خوای گەورە دەکات بۆ ئەوەی بڕیارێك بدات لە نێوان ئەو و گەلەکەیدا، نزا دەکات تا خوای گەورە خۆی و ئەو چەند ئیماندارەی لە گەڵیدا بوون لەم ژینگەیە دوور بخاتەوە.[2] دواتریش بەم شێوەیە لە نزاکەی بەردەوام دەبێت:

پەروەردگارا! شەو و ڕۆژ گەلەکەمم بۆ ئیمان هێنان بە ئاینەکەی تۆ بانگهێشت کرد. بەڵام بانگهێشتکردنەکەی من تەنها بووە هۆکاری زیاتر دوورکەوتنەوەیان، بەڕاستی منیش هەرچەند بانگم دەکردن بۆ ئەوەی کارێك بکەن تۆ لێیان خۆش ببیت بە پەنجە گوێیەکانیان دەگرت و بەجلەکانیان خۆیان دادەپۆشی و سوور دەبوون لەسەر بێباوەڕی و خۆیان لەوە بە گەورەتر دەزانی کە مل بۆ فەرمانبەری خوا کەچ بکەن.

پەروەردگارا! ئەم گەلە لە فەرمانم دەرچوون و کەوتنە دوای کەسانێك کە ماڵ و منداڵیان لە زیان بەولاوە هیچی دی بۆ ژیانیان زیاد نەکردووە، واتە کەسانێك کە ماڵ و منداڵ لە جیاتی ئەوەی بۆیان ببن بە مایەی سوپاسی نیعمەتی خوا، بوون بە مایەی لەخۆباییبوونیان، کە ئەوانیش گەورەو سەرکردەکانی قەومەکەی بوون. کەوتنە داوی کەسانێك کە فێڵی گەورەیان کرد بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەوان لە خوا بترسن و باوەڕی پێ بکەن. وتیشیان پێیان دەستبەرداری بتەکانی خۆتان مەبن و واز لە (ود) و (سواع) و (یەغووث) و (یەعووق) و (نەسر) [3]مەهێنن،ئەمانە خەڵکانێکی زۆریان گومڕا کردووە، تۆیش خوای لە گومڕایی بەولاوە هیچ بۆ ستەمکاران زیاد مەکە. [4]

١ العنكبوت، ٤
٢ الشعراء، ١١٧-١١٨
٣ ئەمانە ناوی بتەکانیان
٤ نوح، ٢١-٢٤

خوای گەورە دوعاکانی حەزرەتی نوح قەبووڵ دەکات و لە ڕێگەی فریشتەی سرووش حەزرەتی جوبرەئیلەوە (علیه السلام) داوای لێدەکات کەشتیەك دروست بکات[1] و هەر لە ڕێی سروشەوە شێواز و چۆنێتی دروستکردنی کەشتیەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە.

حەزرەتی نوح یەکسەر دەست بە کار دەبێت و بە پێی ئەو ڕێنماییانەی کە حەزرەتی جوبرەئیل (علیه السلام) دەیداتێ دەست دەکات بە دروستکردنی کەشتیەکە. بنیاتنانی کەشتیەکە تەواو دەبێت. ئیدی ئیمانداران چاوەڕێی ئاماژەیەکن لەلای خوای گەورەوە بۆ سواربوونی کەشتیەکە. هەر لەگەڵ هاتنی ئاماژەکەدا حەرزرەتی نوح (علیه السلام) کەشتییەکە بەگەڕدەخات. ئیمانداران و لە هەر جۆرە ئاژەڵێکیش نێر و مێیەك لەگەڵ خۆی دەبات و ئەوێ جێدێڵن، ئەوانەش کە جێدەمێنن، لەناودەچن.

دامەزراویی حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) تەنانەت لەو کاتەشدا کە فڕێدرایە نێو ئاگرەکە و نەسرەوتن و دامەزراوی و بوێریی حەزرەتی موسا (علیه السلام) لە ببەرامبەر فیرعەوندا و ئارامگری و نەڕووخانی حەزرەتی ئەیوب (علیه السلام) لە بەرامبەر نەخۆشییە چەند ساڵەکەیدا دەبنە نموونە و سەرمەشقی باڵا لەم بابەتەدا.

## پێغەمبەرمان سەرەڕای هەموو ئاستەنگەکان بەبێ بێزاربوون بەردەوام بوو لە گەیاندنی ئیسلام

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی پێغەمبەری سەروەرمان لە تەبلیغەکەیدا ئەوە بوو کە فەرمانبەرییەکەی بێ ڕووخان و بەو پەڕی ئارامگری و دامەزراوی و بڕیار جێگیریەوە ڕادەپەڕاند.

---

[1] هود، ٣٦-٣٧

ئەو بە درێژایی ژیانی پێغەمبەرایەتیەکەی تووشی چەندەها ئاستەنگ هاتووە بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە بە پشتیوانی خوای گەورە بە دامەزراویی و نەسرەوتنێکی بێوێنەوە بەرەو ئامانجەکەی هەنگاوی ناوە.

بۆ ئەوەی ببینە ئیماندارێکی ڕاستەقینە تەنها قووڵ بوونەوەمان لە لایەنە ئیمانییەکاندا بەس نیە، بەڵکو ئەو بەرگرییەش زۆر گرنگە کە لەکاتی هەنگاونانمان لە پێناو ئیماندا بۆ تێپەڕاندنی بەربەستەکان نیشانی دەدەین، لەبەرئەمەیە قورئانی پیرۆز نمونەی پێغەمبەرەکانی پێشوو و گەلەکانیانمان بۆ دەهێنێتەوە و ئاماژە بەو نارەحەتیانە دەکات کە لەم ڕێیدا کێشاویانە. هەر بەو نموونانە ئامادەسازی دەکات بۆ ئومەتی پێغەمبەری کۆتا زەمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) تا خۆڕاگر و دامەزراوبن بەرامبەر بەو کۆسپ و تەگەرانەی کە لە داهاتوودا دێنە ڕێیان.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

ئەلیف ، لام ،میم (خوا خۆی دەزانێ مەبەستی پێی چییە)، ئایا ئەوانەی موسوڵمان بوون و باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەری خوا هێناوە، وا گومان دەبەن هەر بەوەی کە وتوویانە باوەڕمان هێناوە وازیان لێ بهێنرێت و هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ناخۆش و تاڵ و سوێریان نەیەتەڕێ؟ موسوڵمانانی پێش ئەم موسوڵمانانەش کە لەسەر دەستی تۆدا باوەڕیان بە خوا و بە ئاینی خوا کردووە، وەك ئەمان تاقیمان کردوونەتەوە و تاڵی و سوێریی ژیانمان بەهۆی موسوڵمان بوونیانەوە هێناونەتەڕێ تا خوا بزانێت کام لەمانە بەڕاستی موسوڵمان بوون و لەگەڵ خوای خۆیان ڕاست ئەکەن و بەرامبەر بە دەرد و ئازار خۆیان دەگرن و، کامیان درۆ دەکەن و بەڕاستیان نییە و موسوڵمانی ڕاستەقینە نین. (العنکبوت ٢٩\ ١-٣)

کەواتەی بۆ ئەوەی بتوانین بەرگەی سەختییەکانی داهاتوو بگرین نابێت تەنها بە وتنی" ئیمانمان هێنا" ڕازیبین، بێگومان ئیمان بابەتێکی زۆر گرنگە بەڵام

لە سینەگرتنی هەموو جۆرە تەنگوچەڵەمە و سەختییەکیش لەم پێناوەدا بە دامەزراوی و نەسرەوتنێکی تەواوەتییەوە تەواوکەری ئیمانە و هێندەی ئەو گرنگە.

لەو دونیا چەندەها بەخششی گەورە چاوەڕێی ئیمانداران دەکات، ئەمەش پێویستی بە کۆششێکی نەبڕاوە و بەردەوام هەیە. لەبەرئەوەی دونیا شوێنی پاداشت نییە. هەر بۆیە بەرهەم و میوەی زۆربەی هەوڵ و کۆششەکانیشمان لە ژیانی هەمیشەییدا خۆیان دەردەخەن، وە لە بەرامبەر ئەمەشدا سەختییەکان لەم دونیا دەچێژرێن. وەك چۆن بوونی دۆزەخ زیادە نییە، بەهەشتیش هەروا هەرزان و ئاسان نییە! بۆ گەشتن بە بەخششێکی وەها، دەبێ ئیماندار سەرەڕای هەموو شتێك بە وەستانێکی پتەوەوە نیشانی بدات کە بە جێگیری و دامەزراوی دەمێنێتەوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: "لاتان وایە هەر وا بە ئاسانی دەچنە بەهەشت کە هێشتا بەسەرهاتی ئەوانەتان بەسەردا نەهاتووە کە لە پێش ئێوەوە بوون و سەختی و سزا و ئازاری زۆریان تووشبوو لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئاین و جیهاددا و ڕادەی چەرمەسەرییەکانیان گەیشتبووە دوا پلە"، تا ئەوەی پێغەمبەرەکە و ئەوانەی کە ئیمانیان هێنابوو لەگەڵی ئەوەندە لە تەنگوچەڵەمەدا بوون و بە جۆرێك تینیان بۆ هاتبوو دەیانوت: "ئیتر کەی لەلایەن خوای گەورەوە یارمەتیمان بۆ دێت؟ کەی ڕزگار دەبین؟" خواش سروشی کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان کە پێیان بڵێت: "یارمەتی خوا نزیکە و ئەوەندەی نەماوە ڕزگار ببن،" واتە: ئەمە سوننەتی خوایە لەناو بەندەکانیدا کە لە پاش تەنگانە خۆشحاڵییە و لە دوای خۆڕاگرتن سەرکەوتنە."

قوڕەیشییەکان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لەم دامەزراویی و بڕیارنەگۆڕییەی ئیمانداران بێزار دەبوون و بۆ دەربڕینی ئەمەش دەهاتنە لای ئەبو تالیب وپێیان دەوت:

ئەبو تالیب! بە دڵنیاییەوە تۆ لە ڕوانگەی تەمەن و ئەزموونەوە گەورەی ئێمەی؛ لەڕووی پێگەشەوە لە سەروو هەموومانەوەیت! پێشتریش هاتین و

داوای ئەوەمان لێکردی کۆتایی بەوانە بێنیت کە برازاکەت دەیکات؛ بەڵام تۆ نەتویست بەمە هەستیت! سوێند بەخوا ئیدی خەریکە لە تاو دەمدرێژیکردن بەرامبەر خواوەندەکانمان و تاوانبارکردنی سەرکردەکانمان بە گومڕایی و قسەوتن بە باووباپیرانمان، ئارامسان لێ دەبڕێ! کەی بە نیازی ڕێگریی لێبکەیت؟! ئەگەر دەتەوێ ئەو بابەتە بۆئێمە جێبێڵە دەجەنگین هەتا لایەکمان دەیباتەوە و بەمشێوەیە بابەتەکە چارەسەر دەکەین.

ئەبو تالیب لەسەرداوای موشریکەکان کە تاو نا تاوێك دەهاتنە لای و ئەم داوایەیان دووبارە دەکردەوە ڕووی کردە پێغەمبەری خواو وتی:

ئەی برازاکەم تکات لێدەکەم هەم بیرێك لەخۆت بکەرەوە و هەم لە منیش؛ بارێك مەخەرە سەرەشانم کە نەتوانم هەڵیبگرم.

پێغەمبەری خوا لەدوای ئەم داوایەی مامی کەمێك وا بیری کردەوە کە مامی ئیدی ماندوو بووە لە داکۆکی کردن لێی و بیری گۆڕیوە کەمێك بەوە دڵتەنگ بوو کە ڕەنگە ئیدی پشتی نەگرێت و بە تەنها بە جێی بهێڵێت. بەڵام سەرەڕای ئەمەش لە دامەزراوییەکەی خۆی پەشیمان نەبوویەوە و بەمشێوەیە وەڵامی مامی دایەوە:

"مامە گیان، سوێند بە خوا ئەوان ئەگەر لە پێناوی ئەوەی لەم کارەدا کۆڵم پێبدەن خۆر بخەنە سەر دەستێکم و مانگیش بخەنە سەر دەستەکەی ترم من واز لەم فەرمانبەرییە ناهێنم هەتا خوای گەورە سەرکەوتنم پێدەبەخشێت یاخود لەمپێناوەدا گیانم دەبەخشم."

## پاشەڕۆی حوشتریان دەکرد بەسەریدا

درەوشانەوەیەکی دیکەی قەدەر ئەوەبوو کە یەکێك لەهەرە دوژمنە سەرسەختەکانی سەروەرمان"ئەبو لەهەب"ماڵی لە تەنیشت ماڵی پێغەمبەری خوا دا بوو، وەنەبێ دراوسێکانی دیکەی هیچیان لە "ئەبو لەهەب" کەمتر بێ. حەکەمی کوڕی ئەبی

عاص، عوقبەی کوڕی ئەبی معیت و عدی کوڕی حەمرا هەریەکە لەمانە بە ئەندازەی ئەبو لەهەب دوژمنایەتی پێغەمبەریان دەکرد و بۆ ئازاردانیشی هەمیشە لە هەڵیێ دەگەڕان، ڕۆژێکیان یەکێك لەوان لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا خەریکی نوێژکردن بوو هات و هەرچی پاشەڕۆ و ناوسکی مەڕ بوو هێنای و کردی بە سەروملی موبارەکیدا. یەکێکی تریشیان دەچێت هەندێکی هەڵدەگرێت و دەیکاتە ناو ئەو ئاوەی کە پێغەمبەری نازدار دەستنوێژی لیێ دەگرت. پاش ماوەیەکی دی پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی لەشەڕیان پارێزراو بێت دیوارێکی هەڵچنی لە نێوان خۆی و ئەواندا . سەرەڕای ئەمە لەبەر ئەوەی بەردەوام بوون لەو ڕەفتارە نەشیاوانەیان، پێغەمبەری خوا ئەو پیساییەی کە خرابووە بەر دەم ماڵەکەی بە نوکی دارێك هەڵی گرت و نیشانی دەدان و تەنها ئەوەندەی دەفەرموو: ئەی کوڕەکانی عبدالمناف ئاخر دراوسێیەتی ئاوا دەبێت؟

عوقبەی کوڕی ئەبی معیت زیاتر ڕۆدەچێت و شەوێك لەگەڵ ئەبو جەهلدا ڕێکدەکەون تا ئازاری پێغەمبەی نازدار بدەن.

یەکێکیان ئاماژە بۆ پێغەمبەری خوا دەکات و دەڵێت: " کیێ لە ئێوە دەتوانێت پاشەڕۆی ئەو حوشترەی کە فلان کەس سەری بڕیوە بیهێنێت و بیکات بە سەری موحەمەددا لە کاتێکدا کە ئەو دەچێتە سوجدە؟ کیێ دەتوانێت ئەم پاڵەوانێتیە بنوێنێت؟"

یەکێك لە ناویاندا هەڵدەستێتە سەرپیێ، کە ئەویش عوقبە بوو، ئەو پیساییەی کەئاماژەی پێکرابوو دەیهێنێت و چاوەڕیێ دەکات کە پێغەمبەری خوا بچێتە سوجدەوە و پاشان کە چووە

سوجدە هەموو پاشەڕۆکەی خستە نێوان هەردوو شانی موبارەکی و ڕایکرد. ئەو کە خۆشەویستترین بەندەی خوا بوو لە کاتێکدا کە لە نزیکترین ساتیدایە لەگەڵ

پەروەردگاری تووشی جۆرەها ئازاری دەکەن. پێغەمبەری نازدار(صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بۆ ماوەیەکی زۆر سەری لە سوجدە هەڵنەبڕی. لە لایەکی ترەوە عوقبەو میوانەکانی خەریکی خۆشی دەربڕین وقەپوقاڵ بوون و بەرامبەر بەم کردەوە ناشرینانەی کە کردویانە ئەو ڕۆژە هێندە پێکەنی بوون بۆ ئەوەی نەکەون خۆیان بەیەکتری دەگرتەوە . لە کۆتاییدا حەزرەتی فاتمە کە چاوی بەم دیمەنە دڵتەزێنە دەکەوێت یەکسەر ڕادەکات بەرەو لای باوکی و لە لایەکەوە سەرشانی باوکی ئازیزی پاك دەکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە هەڵدەشاخێ بەڕووی ئەوانەی کە ئەم کارە نەشیاوەیان ئەنجام داوە.

بەڵێ دەتوانین نمونەکان زیاتر بکەین، ژیانی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی لێوان لێوە لەم جۆرە بەسەرهاتانە. سەرداری پێغەمبەران و هاوەڵانیشی هەموو سەرمەشقی هەرە مەزنن بۆ ئێمە. کەواتە دەتوانین بڵێین هەر خزمەتگوزارێکی قورئان دەبێت بە وێنەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵەکانی دامەزراو بێت و خۆڕاگر بێت لە بەرامبەر ئەو نارەحەتیانەی کە لەو پێناوەدا تووشی دەبێت.

# لە کوێیت

ئەی ئەو قارەمانەی ساڵەهایە حەسرەتی دووریت لە سینە دەگرین! لە کوێیت ئەی کۆتری خەیاڵ و ئەی قومریی خەونەکانمان! لە کوێیت ئەی مژدەدەری "ژیانەوەی دوای مردنمان!" لە ڕۆژانی پڕ خەم و ناسۆرماندا، لە شەوانی خەو لەچاو تۆراوماندا، هەر چاولەڕێت بووین. سێبەری هەر تارماییەک لە ئاسۆماندا دەرکەوتبێت، وتوومانە: "ئەوە خۆیەتی!" و بەدەم سروودی (ثنية الوداع)ەوە ڕژاوینەتە سەر ڕێ. لە کوێیت و کەی دێیت ئەی سوارچاکی ئەفسانەییم!. سوێند بە خوا مۆمی ژینی ئەم ڕۆحە مات و ژەنگگرتووانە وا ڕووی لە خامۆشییە. ئەو بەژنە بەرزانەی تا ئێستا بینیومانن، نە هێندەی ئەنگوستێک خاوەن هزر و، نە ئەوەندەی مۆمێکیش دابگیرسێنن خاوەن ئیرادە نەبوون. ئەی سوارچاکە خۆشەویستەکەی خەونی شیرینمان! لەم ڕۆژە ڕەشانەدا کە ڕووپامایی و ناوبانگ و پلەوپایە دەیانەوێت هیوا گەشەکانمان لەکەدار بکەن، چی دەبێ، لەوە زیاتر موحتاجانی ئیکسیری ژیانبەخشی زارت مەخەرە چاوەڕوانییەوە...

نرخی ٤٥٠٠ دینارە

9 649750 000291
Altın Nesil-3

İRFAN